محەممەدی نووری

# شەوێك و خەوێك بستووی ژیان

پێداچوونەوە و ئامادەکردن
سەلاحەددین ئاشتی

سلێمانی

٩٢٨
ن ٣٣٢ نووری، محەممەد
شەوێك و خەوێك-بستووی ژیان / نووسینی محەممەدی نووری.-
سلێمانی: بنکەی ژین، ٢٠٠٦.
٢٧٤ل، وێنە، ١٦,٥ × ٢٣ سم.
١- محەممەدی نووری- بیرەوەری ٢- مێژووی ڕۆژهەڵاتی کوردستان
٣- شیعری کوردی/ ڕۆژهەڵاتی کوردستان ذ- ناونیشان
کتێبخانەی گشتیی سلێمانی زانیاریی سەرەتاییی پێڕست و پۆلێنی ئامادە کردووە

سەرپەرستی لەچاپدراوەکانی بنکە: سدیق ساڵح

زنجیرە: ٣٧
کتێب: شەوێك و خەوێك- بستووی ژیان
نووسەر: محەممەدی نووری
پێداچوونەوە و ئامادەکردن: سەلاحەددین ئاشتی
تایپ و مۆنتاج: تاهیر کەریمی- مەهاباد
بەرگسازی: قادر میرخان
خەتی بەرگ: ئەحمەد سەعید
تیراژ: ١٠٠٠
شوێنی چاپ: سلێمانی، چاپخانەی شڤان
ژمارەی سپاردن: ٣٧٨ی ساڵی ٢٠٠٦

لە بڵاوکراوەکانی
**بنکەی ژین**
بۆ بووژاندنەوەی کەلەپووری بەڵگەنامەیی و ڕۆژنامەوانیی کوردی
هەرێمی کوردستانی عیراق- سلێمانی، گەڕەکی ١٠٤ ئاشتی، کۆڵانی ٣٩، ژمارەی خانوو ١٠،
(بەرامبەر بە قوتابخانەی سەرەتاییی ئەردەڵان)، سنووقی پۆست: ١٤
تەلەفۆن: ٣١٣٣١٠٥ مۆبایل: ئاسیا ٠٧٧٠١٤٨٤٦٣٣ یا ٠٧٧٠١٥٦٥٨٦٤
*E.mail: bnkaizhin@ yahoo.com*

# شەوێک و خەوێک

## بیرەوەرییەکانی محەممەدی نووری

به ناوی خودای ژیانبەخش و گیانئەستێن

هەموو دەوری ژیانی من شەوێک بـوو   شەوێکی پڕ لە مۆتە و دیمەنی دێـو!
ئەوەی دیتم بە هاڵۆزی خـەوێک بـوو   تراوکێکبوو خزی و نەتکایە سەرلێو!

## بیرەوەری یان دەردەسەر

مەبەست لە نووسینی ئەو بیرەوەرییە، ناساندنی خۆم نیە. چونکـە نـاکرێ نەتەوەیەکی لە دەورانی ژیانیدا ئەگەر هیچی بۆخۆی نەبووبێ، لە خۆی بدوێ. گەلێک ئەگەر لە هەڵکەوتی زەماندا هەسـتوخوسـتێکی بووبـێ، بـە وسـتێک پێخوست کرابێ؟ کوا دەتوانێ شوێنەوارێکی بەبایەخ لە ژیانی خۆی بێنێتە دی. ئەوانەش کە لە پیاوە بەنرخ و هۆنەرە دڵسۆزەکان یادگار و بەجێماون، هەمووی داخ و دەرد و کەسەرن؛ ئاواتی پێکنەهاتوو، هومێدی خەسار و بەفیڕۆچوو.

ئەمن لە سەیر و سووڕ و ئاڵوگۆڕی ساڵەکانی بەر لە ١٣٢٠ی هـەتاوی، لـە ژیانی ڕەنگاوڕەنگی خۆم، لەم ناوچە کوردنـشینەی ئازەربایجـانی ڕۆژئـاوادا، هێندێک بەسەرهات و ڕووداوی گرینگم بە چاو دیوە و بەسەرم هاتووە کە ئەگـەر بازگەی بیرەوەرییەکانم پێیانڕابگـا، هـەموویان جێگـای سـەرنج و لـە جێـی خۆیاندا شیاوی تێڕوانینن کە کێ هات و کێ ڕۆیی؟ کام بێگانە و کام خۆیی؟ هۆی خۆیەتی و نامۆیی!.

مێژوو نانووسمەوە. نامهەوێ وەک هێندێک لـە مێژوونووسـان، بیـسەرانی

خۆم بکەمە بەڵگەی ڕاستەوخۆی بەسەرهاتەکانی سات و کاتەکانی مەڵبەندەکەیان. دەمهەوێ ئەوەی بۆخۆم دیومە و لە هەڵکەوتەکانی‌دا هەڵکەوتووم، بیانگێڕمەوە. بەڵان وەک درۆینەوانی دواکەوتوو، بە تاڵووکە گوڵەورێنیش بێ، سەرپەڕێنی دەکەم و تێدەکشێم، با پرتە و بۆڵەی خاوەنجاڕیش بێتە پێم.

## گورگەئاوڕێک لە ژیانی خۆم و باسێک لە تێپەڕی دەوران

ناوم «محەممەد»ە، نازناوم «نووری»یە. لە پازدەی مانگی ڕەشەمەی ١٣٠٥ی هەتاوی، لە گوندی «گلۆڵان»ی خوارێ، لە ناوچەی گەورکی مەهاباد لە دایک بووم. بابم میرزا ئەبووبەکر، کوڕی خاڵە «حەمەزەندین» بووە. خاڵە حەمە لەگەڵ چەند بنەماڵە لە عێلی «زەند» ئاوارە بوون و هاتوون لە گوندی «قالوێ زەندان» جێگیر بوون و ماونەوە، ئێستاش چەند بنەماڵە لەو ناوچەیەدا هەر ماون. بۆم ساغ نەبۆتەوە هۆی پەڕەوازەبوونی ئەو چەند بنەماڵەیە، لە دەورانی «ئاغا محەممەدخانی قاجار»دا چی بووە و چۆن ئاوارەی ئەم مەڵبەندە بوون و لەو دێیە کە بە «قالوێ زەندان» ناودێریان کردووە، جێگیر بوون و لە دوایە هێندێکیان بێروبەوێدا پەران‌پەران و ئەوپەڕەوپەڕ کەوتوون.

میرزا ئەبووبەکر پیاوێکی باسەواد و شارەزا بە زمانی عارەبی و فارسی بووە و لە زانستی فەرهەنگ و ئەدەبیاتی عارەبی و فارسی‌دا، دەستێکی باڵای هەبووە و لە نێو عێل و عەشیرەتی «گەورک»دا، جێی ڕێز و حورمەت بووە و هاوکاری پێ‌خوێندن و نووسین و دەرک و دیوانی سەرانی ئەم عێلەی کردووە. هۆنراوەی فارسی هۆندۆتەوە کە بە هۆی تاڵانوبڕۆ و سووتمانی عێل و عەشیرەتەکانی زۆردار و بێ‌زۆری مەڵبەندەکە، لە نێو چوون و وەدەست من نەکەوتوونەوە مەگەر هێندێک کتێب و قورئان نەبێ.

دایکم سەیزادە «تەمینە»، کچی سەید «ساڵح»، لە ساداتی گوندی «باغی‌شێخان»ە کە لەگەڵ ساداتی «وزمەڵە» و «بەرزەنجە»، بنەچەکەیان دەگاتەوە یەک.

لام وایە زۆر بە چکۆلەیی بابم دەرسی پێ‌خوێندبم، چون هەرچەندی بیر و فامم بڕ دەکا، سەوادی خوێندنەوە و نووسینم هەبووە. لە بیرم ماوە، کاتێک

## ساڵی ١٣١٤ بۆ ڕووحی چکۆلە و مەینەتنەدیوی من

چون ویستی خودا لەوەدا بوو کە ئەمن هەر لە تەمەنی منداڵیڕا تووشی چەوتی و چەڵەمەی ژیان بم، لە سەردەمی پاییزی ساڵی ١٣١٤، باوکم لە تەمەنی ٦٣ساڵیدا کۆچی دوایی کرد و ئەمن و پێنج منداڵی لە من چکۆلەتر، یانی دوو خوشک و سێ برای لە من چکۆلەتر، لە داوێنی دایکێکی پەژارەنەدیودا بەجێهێشت. دایکم کە سەیزادەیەکی پاک و بەغیرەت و بەمشوور بوو، سەرپەرەستی خێزانی وەئەستۆی خۆی گرت و بوو بە داژدارێکی دڵسۆز و لێهاتوو، لە حاستی چەوتی و چەوێڵی ژیاندا. نەیهێشت ئەمن دەست لە خوێندن هەڵگرم. هەتا ساڵی ١٣٢٠ ئەمن هەر لە قوتابخانەکانی زانستی ئایینی، لە گوندەکانی ناوچەی گەورک و بانە و سەردەشت، سەرف و نەحو و مەنتیق و ئاداب و بەلاغە و هەتا هێندێکیش لە کتێبی «جمع‌الجوامع» کە دوایین پلەی دەورەی زانیاری دەرسی زەمان بوو، خوێندم. هەستی تەنیایی دایک و چوار خوشک و برای چکۆلە وای هان دابووم کە ئانێکم لە وەختی خۆم خەسار نەدەکرد. ئەوەی لە ماوەی ٦ ساڵدا خوێندبووم، دەمتوانی بە دەرس بیانڵێمەوە. ئاواتم بوو تا دوایین پلەی زانیاری کە لە کۆڕی قوتابخانەکانی دینیدا باو بوو، بخوێنم و بچمە سەرێ، بەڵان:

## تەقدیر تەگبیران بەتاڵ دەکاتەوە

دوو هەڵکەوتی ناحەز و نالەبار بوونە بەرهەڵەستی وەدینەهاتنی ئاواتەکانم. ساڵی ١٣٢٠، شەڕی دووهەمی نێونەتەوەیی بوو بە هۆی ئەوە کە ئێرانی ئێمە بە دەستی دەوڵەتانی هاوپەیمان: ئەمریکا، ئینگلیس و شووڕەوی داگیر کرا. حکوومەتی ناوەندی شیرازەی پسا و نەزم و نیزام لێکهەڵوەشا. شوێنەواری عەشیرەتگەری و «خانخانی» کە لە دەورانی حکوومەتی ڕەزاشادا لە گرێژنە چووبوو، بە ڕەوشتی کۆنی حەز و ناحەزی خۆی ژیایەوە و هاتەوە سەر تەوەرە و بستەی پێشووی و نائەمنی و هەرجەمەرج لە هەر ناوچەیەک سەری هەڵدا و کەس بە ڕبەی کەسی نەدەپێوا.

## ئاوات دەنێژم و تاڵی دەچێژم

هەر لەو سەردەمەدابوو، ئاغای گلۆلان، «خدرئاغای عەزیزی»، نامە و پیاوێکی نارد کە: «ئەگەر محەممەدی نووری وەکوو بابی کە میرزای من بووە، نەیەتەوە گلۆلانێ و نەبێتە میرزای من و دەرس بە منداڵی بنەماڵەکەم نەڵێ، ئەوا خەرج و پیتاکی ئەو چەند ساڵەی لە دایک و خێزانەکەی وەردەگرم و لە ملکی خۆشم دەریان‌دەکەم.» دیارە ئەمنێکی دنیانەدیتوو و لە کێشمەکێشمی دەوران نەکەوتوو کە هەموو ئاواتم ئاسوودەیی و حەسانەوەی دایکم و منداڵەکانی بوو، لە وەختێکی وادا دەست و پێم لێ ون دەبێ، رایەڵوپۆی ئاواتەکانم دەهاڵۆزێ و تێکەڵ دەبێ. لەوەی زیاتر چارەیەکم نەدەزانی کە دەست لە خوێندن هەڵگرم و ڕۆژ و حاڵی بنەماڵە فیدای دواڕۆژ و داهاتووی خۆم نەکەم. ناچار سیپارە و دەفتەری ڕووەو ڕووناکیم پێچایەوە و بەرەو تاریکەبازاڕی ژیانی نالەبار وەڕێ‌کەوتم و بە سەرساردی هاتمە سەر پەتوسینگی داب و دەستووری باوی ڕۆژگار و لە لای خدرئاغای عەزیزی، کە پیاوێکی میر و شایی بەخۆ بوو، بوومە میرزا و نووسەر و مامۆستای منداڵەکانی عێلی.

## هەڵکەوتێک بۆ چوونە مەهاباد و دیتنی دنیای تازە

خدرئاغا لە ساڵی ١٣٢١دا نەخۆش کەوت. دەبوو بۆ لای دوکتوران بچێتە مەهاباد. بارگەیان بۆ پێچاوە و دووسێ پیاوی لەگەڵ خۆی خست و بۆ چاوەدێری نوسخە و دەوا و دەرمانێکی کە دەیدەنێ، ئەمنیشی بە پێویست زانی کە هاوڕێی بم.

بۆ یەکەمین جار بوو کە مەهابادم دەدی ـ لە پێش‌دا ناوی سابلاغ بوو ـ لە مەهاباد چووینە مزڵی «بایزئاغای عەزیزی» کە براگەورەی خدرئاغا و سەرۆکی عێلی گەورکان بوو. سەرانی عەشیرەتەکانی مەنگوڕ و مامەش و دێبوکری محاڵ و شاروێران، یان خانوویان لە مەهاباد هەبوو، یان مزڵیان بەکرێ دەگرت. نۆکەر و دەست و پێوەندەکانیان لە کاروانسەرا و ماڵاندا دەمانەوە و کاروباری مەهابادێ عەشایر هەڵیاندەسووڕاند و حکوومەتی ناوەندی هیچ جۆرە دەسەڵاتێکی لە شار و دێدا نەمابوو. پیاوەکانی عەشایر باج و پیتاکیان لە دەورەی شاری لە خەڵک وەردەگرت. پیاوە بەناو و سەرشناسەکانی مەهابادی،

«جوزووی عەممە»م لە قورئانی پیرۆز خوێند، تەواوی جوزوەکانی دیکەم بە باشی دەخوێندەوە و وەکوو دەرس، پێداویستیم بە وان نەبوو. کتێبەکانی سەرەتایی ئەوکات وەک «سمایلنامە» و «ناگەهان» و «گوڵزار» و لە دوایی‌دا «گوڵستان و بووستان» و دواتریش تەسریفی «زەنجانی»م لە نەحودا، لای بابم خوێند. بە باشی نووسین و خوێندنەوە فێر ببووم. وام دێتە زەین کە، بابم بە نووسین و خوێندنەوەی زمانی کوردی زۆر ئاشنا و ئۆگر بوو و هەستی نەتەوەخوازی زۆر توند بوو. لە ساڵەکانی دوایی ژیانی‌دا جۆرێک گۆشەگیری و تەنیایی بە خۆیەوە گرتبوو. لەو حاڵەدا بوو کە سەفەرێکی بۆ لای ئێراق کرد؛ نازانم چەند ڕۆژ یان چەند حەوتەی پێچووبوو، کە هاتەوە چەند پەڕتووک و پەخشانی کوردی کە لە شاری سلێمانی یان لە کۆیە دەردەچوون، لەگەڵ خۆی هێنابوویەوە. ئەمن کە هێندێکم سەوادی خوێندنەوە پەیدا کردبوو، نووسراوەکانی پێ‌دەخوێندمەوە. ئێستاش تاکە هۆنراوەیەکم لەو پەڕتووکە لە بیر ماوە کە نووسرابوو:

**بەهار هاتەوە بە سەیرانەوە بە لێ‌لێ و لۆلۆ و بە حەیرانەوە**

زۆرم شایی بە خۆم بوو کە دەمزانی بیانخوێنمەوە.

ڕۆژێکی تاڵ کە قەت لە بیرم ناچێتەوە ئاوا بوو کە بابم بە پەلە هاتەوە ماڵێ و کوتی: محەممەد نووسراوە کوردییەکان لە کوێن؟ ئەمنیش کە ئەوانم وەک شتێکی بەبایەخ لە نێو کتێب و سیپارەکانم ئاخنیبوون، هێنامنەدەرێ و کوتم ئەوەتان. بابم خێرا لێی‌وەرگرتم. تەندووری نێوماڵێ داییسا، گورجانە هەموویانی لە تەندوورەکە هاویشت. گڕەمەشخەڵیان لێ بەرز بۆوە. ئەمن نەمزانی ئەم کارەی بۆ کرد! ڕووحی بچووکی من لەگەڵ گڕی پەڕتووکەکان دەسووتا و دەچووقا. لەو کاتەدا چەند عەجەمی قوڵەشینی تفەنگ‌بەدەس کە پێیان‌دەگوتن «ئەمنیە» وەژوورکەوتن و دەستیان بە پشکنینی سندووق و نێو ماڵ و کتێب و دەفتەرەکان کرد. ڕوویان کردە بابم و کوتیان: دەڵێن ئەتۆ چوویەتە ئێراق و کتێب و نووسراوەی کوردیت لەگەڵ خۆت هێناوە. ئەدی کوانێن؟ لە کوێت داناون؟ بابم کوتی: بەڵێ چوومە ئێراق. چوومە بەغدا بۆ زیارەتی «غەوسەلئەعزەم» و لە گەڕانەوەدا چوومە «تەوێڵە» بۆ دیداری «شێخی حیسامەددین» و کارێکم بە هێنانەوەی کتێب و نووسراوەی کوردی نەبووە.

ئەمنیەکان دوای پشکنینی هەموو ماڵەکە، بابمیان لەگەڵ خۆیان برد و ڕۆیشتن. دوو غەم و پەژارە، ڕووحی بچکۆلەی منیان ئازار دەدا، یەکیان پەژارەی پەڕتووکە کوردییەکان کە دەمزانی بیانخوێنمەوە و هۆنراوەکانیم پێخۆش و دڵگیر بوون و ئەوی گەورەتریش پەژارەی بێ سەروسۆراغی بابی پیر و نەخۆشم. دوای چەند ڕۆژان کە بابم هاتەوە، تێیگەیاندم و حاڵی کردم کە نووسین و خوێندنەوەی کوردی قاچاغە. بە واتەی عارەبان «الانسان حریص علی ما منع.» هەر ئەوە بوو بە هۆیەکی بنەڕەتی کە ئەمن هەر لە منداڵییەوە نووسین و گوتنی زمانی خۆم لە عارەبی و فارسی پێخۆشتر و گرینگتر بوو.

لە دوای چەند ساڵان کە فام و بیرم، هێزی لێکدانەوەی بەسەرهاتی دەورانی منداڵیمی پەیدا کردبوو، بۆم ڕوون بۆوە کە سەفەرەکەی بابم بۆ ئێراق، تەنیا دیداری دەستەیەک لە نووسەران و ڕووناکبیرانی کوردی ئێراقی بووە کە لەو کاتیدا بزووتنەوەی نەتەوەییان دەس پێکردبوو. چون لە ئێراقدا مەودای بزووتنەوە و پەرەپێدانی هەستی نەتەوایەتی بەربڵاوتر و هەراوتر بوو و لەگەڵ ڕووناکبیرەکانی کوردی ئێرانی، لە سنوورەکانی سەردەشت و بانە و هەورامان و مەریوان، هەستی نەتەوەخوازیان تێکەڵاو کردبوو. بابم لەو کەسانە بوو کە بە بیر و هەستی نەتەوەیی و میللی دەژیا، هەر ئەو هۆیەش بوو کە چەند جارێک تووشی چەرمەسەری پیاوەکانی دەرک و دیوانی ڕەزاشا دەبوو کە بە وردی لە سنوورەکان، میرە بەهەست و لێهاتووەکانی دەخستە ژێر چاوەدێری و تێڕوانین. هێنانی گۆوار و پەڕتووک و پەخشانە کوردییەکان لە ئێراقەوە، دەیڕوانییە ئەو بیر و هەستە ڕووناکەی ئەوکات.

لە ساڵەکانی ١٣١٢ و ١٣١٣دا مێژووی «موعجەم» و «دوڕڕەی نادری» و هێندێک لە کتێبە سەرەتاییەکانی «سەرف و نەحو»م لای بابم خوێند. لە ساڵی ١٣١٤ی هەتاوی، ڕۆژێکی بابم دەستی گرتم و بردمیە لای یەکێک لە مامۆستایانی زانستی ئایینی بە ناوی «مەلا عەبدولوەهاب» کە پیرێکی نوورانی و عالمێکی ڕەببانی و مودەڕڕیسی زانستی ئایینی لە گوندی «گلۆڵان»ی خوارێ بوو، ئەسپاردمی کە لە ژێر چاوەدێری ئەو عالمە زانایەدا، دەرسی زانستی دینی و عارەبی بخوێنم و نەیەڵێ دەس لە خوێندن هەڵگرم.

## ساڵی ١٣١٤ بۆ ڕووحی چکۆلە و مەینەتنەدیوی من

چون ویستی خودا لەوەدا بوو کە ئەمن هەر لە تەمەنی منداڵیڕا تووشی چەوتی و چەڵەمەی ژیان بم، لە سەردەمی پاییزی ساڵی ١٣١٤، باوکم لە تەمەنی ٦٣ساڵیدا کۆچی دوایی کرد و ئەمن و پێنج منداڵی لە من چکۆلەتر، یانی دوو خوشک و سێ برای لە من چکۆلەتر، لە داوێنی دایکێکی پەژارەنەدیودا بەجێهێشت. دایکم کە سەیزادەیەکی پاک و بەغیرەت و بەمشوور بوو، سەرپەرەستی خێزانی وەئەستۆی خۆی گرت و بوو بە داژدارێکی دڵسۆز و لێهاتوو، لە حاستی چەوتی و چەوێڵی ژیاندا. نەیهێشت ئەمن دەست لە خوێندن هەڵگرم. هەتا ساڵی ١٣٢٠ ئەمن هەر لە قوتابخانەکانی زانستی ئایینی، لە گوندەکانی ناوچەی گەورک و بانە و سەردەشت، سەرف و نەحو و مەنتیق و ئاداب و بەلاغە و هەتا هێندێکیش لە کتێبی «جمع‌الجوامع» کە دوایین پلەی دەورەی زانیاری دەرسی زەمان بوو، خوێندم. هەستی تەنیایی دایک و چوار خوشک و برای چکۆلە وای هان دابووم کە ئانێکم لە وەختی خۆم خەسار نەدەکرد. ئەوەی لە ماوەی ٦ ساڵدا خوێندبووم، دەمتوانی بە دەرس بیانڵێمەوە. ئاواتم بوو تا دوایین پلەی زانیاری کە لە کۆڕی قوتابخانەکانی دینیدا باو بوو، بخوێنم و بچمە سەرێ، بەڵام:

## تەقدیر تەگبیران بەتاڵ دەکاتەوە

دوو هەڵکەوتی ناحەز و نالەبار بوونە بەرهەڵستی وەدینەهاتنی ئاواتەکانم. ساڵی ١٣٢٠، شەڕی دووهەمی نێونەتەوەیی بوو بە هۆی ئەوە کە ئێرانی ئێمە بە دەستی دەوڵەتانی هاوپەیمان: ئەمریکا، ئینگلیس و شووڕەوی داگیر کرا. حکوومەتی ناوەندی شیرازەی پسا و نەزم و نیزام لێکهەڵوەشا. شوێنەواری عەشیرەتگەری و «خانخانی» کە لە دەورانی حکوومەتی ڕەزاشادا لە گرێژنە چووبوو، بە ڕەوشتی کۆنی حەز و ناحەزی خۆی ژیایەوە و هاتەوە سەر تەوەرە و بستەی پێشووی و نائەمنی و هەرجمەرج لە هەر ناوچەیەک سەری هەڵدا و کەس بە ڕبەی کەسی نەدەپێوا.

## ئاوات دەنێژم و تاڵی دەچێژم

هەر لەو سەردەمەدابوو، ئاغای گڵۆڵان، «خدرئاغای عەزیزی»، نامە و پیاوێکی نارد کە: «ئەگەر محەممەدی نووری وەکوو بابی کە میرزای من بووە، نەیەتەوە گڵۆلانێ و نەبێتە میرزای من و دەرس بە منداڵی بنەماڵەکەم نەڵێ، ئەوا خەرج و پیتاکی ئەو چەند ساڵەی لە دایک و خێزانەکەی وەردەگرم و لە ملکی خۆشم دەریان‌دەکەم.» دیارە ئەمنێکی دنیانەدیتوو و لە کێشمەکێشمی دەوران نەکەوتوو کە هەموو ئاواتم ئاسوودەیی و حەسانەوەی دایکم و منداڵەکانی بوو، لە وەختێکی وادا دەست و پێم لێ ون دەبێ، رایەڵوپۆی ئاواتەکانم دەهاڵۆزێ و تێکەڵ دەبێ. لەوەی زیاتر چارەیەکم نەدەزانی کە دەست لە خوێندن هەڵگرم و ڕۆژ و حاڵی بنەماڵە فیدای دوارۆژ و داهاتووی خۆم نەکەم. ناچار سیپارە و دەفتەری ڕووەو ڕووناکیم پێچایەوە و بەرەو تاریکەبازاڕی ژیانی نالەبار وەڕێ‌کەوتم و بە سەرساردی هاتمە سەر پەتوسینگی داب و دەستووری باوی ڕۆژگار و لە لای خدرئاغای عەزیزی، کە پیاوێکی میر و شایی بەخۆ بوو، بوومە میرزا و نووسەر و مامۆستای منداڵەکانی عێلی.

## هەڵکەوتێک بۆ چوونە مەهاباد و دیتنی دنیای تازە

خدرئاغا لە ساڵی ۱۳۲۱دا نەخۆش کەوت. دەبوو بۆ لای دوکتوران بچێتە مەهاباد. بارگەیان بۆ پێچاوە و دووسێ پیاوی لەگەڵ خۆی خست و بۆ چاوەدێری نوسخە و دەوا و دەرمانێکی کە دەیدەنێ، ئەمنیشی بە پێویست زانی کە هاوڕێی بم.

بۆ یەکەمین جار بوو کە مەهابادم دەدی ـ لە پێش‌دا ناوی سابلاغ بوو ـ لە مەهاباد چووینە مزڵی «بایزئاغای عەزیزی» کە براگەورەی خدرئاغا و سەرۆکی عێلی گەورکان بوو. سەرانی عەشیرەتەکانی مەنگوڕ و مامەش و دێبوکری محاڵ و شارویران، یان خانوویان لە مەهاباد هەبوو، یان مزڵیان بەکرێ دەگرت. نۆکەر و دەست و پێوەندەکانیان لە کاروانسەرا و ماڵاندا دەمانەوە و کاروباری مەهابادێ عەشایر هەڵیاندەسووڕاند و حکوومەتی ناوەندی هیچ جۆرە دەسەڵاتێکی لە شار و دێدا نەمابوو. پیاوەکانی عەشایر باج و پیتاکیان لە دەورەی شاری لە خەڵک وەردەگرت. پیاوە بەناو و سەرشناسەکانی مەهابادی،

هەرکام بەپێی تێبینی پاشەڕۆژ و داهاتووی خۆیان، لەگەڵ سەرۆک عەشیرەتێکی تێکەڵی و نیزیکییان دەکرد. خۆنوێنی حکوومەت لە هەرێمدا هەر ئەوەندە بوو کە بۆ لاواندنەوە و پشیمیاوی عێل و عەشایر، دەستووری دابوو بە پێی سەرانە، کۆپینی قەند و شەکر و کووتاڵیان بدەنێ و ئاغاواتەکانیش بەشی خۆیان و گوندەکانیان وەردەگرت و لە دوایەش چەندیان بەشی خەڵک دەدا، بۆخۆیان خاوەن دەسەڵات بوون! زۆر جاران دەمدی لە لای «پشتتەپ» یان لە لای «سەددی» ئێستاڕا، سوارانی چەکداری عەشایر بە زورنالێدان و سیتەپڵەوە دەڕژانە شارەوە. لاوان و جحێڵەکانی مەهابادی پێدەکەنین و دەیانگوت: سیتەڵەکەیان دەڵێ، قەندم دەوێ! شەکرم دەوێ! کۆپین! کۆپین!

بۆ منی دنیانەدیو کە هەر لە حوجرەی فەقێیاندا خەریکی خوێندن و موتاڵا بووم و نەهاتبوومە نێو گەل و کۆمەڵەوە، هەموو ئەو دیمەنانە جێگای سەرنج و بیرلێکردنەوە بوو. ئێستا کە جلوبەرگی کوردی ئازادە و کوردی نووسین و کوردی گوتن یاساغ نیە، پێشینەی زەینم لە ژیان و گیانمدا سەریان هەڵدەدا و ئەمنیان دەبردەوە ئەوکات کە پەڕتووکە کوردییەکانیان لێ لە تەندوور هاویشتم و سووتاندیان، کە ئەمنیە قوونشینەکانی حکوومەتی ڕژانە ژوورەکەمان و لە نووسراوە و پەڕتووکی کوردی دەگەڕان و دەیانگوت کوردی نووسین و کوردی پۆشین یاساغە، قاچاغە؟! ئەوا ئێستا دەمدی بە کوردی دەدوێن، دەنووسن، دەپۆشن. گەنج و لاوەکانی شاری، شەوانە لە کووچە و کۆلانان گۆرانیان دەڵێن و هۆنراوە و سروودی کوردی دەخوێننەوە. دەمدی دیمەن و ڕووکاری تەواوی شاری مەهاباد، ڕەنگی کوردی و دەنگی کوردستانی لە خۆی هالاندووە.

جارجار دەچوومە دووکانی میرزا «ئەحمەدی داودی» کە لە نێو قەیسەریدا کووتاڵی دەفرۆشت. لە منداڵییەوە لەگەڵ ئەحمەد هاوڕاز و هاواڵ بووین و یەکترمان دەناسی. میرزا «حەسەنی داودی» بابی ئەحمەد، لەگەڵ میرزا ئەبووبەکری بابی من دۆست و هاواڵ بوون. زۆر جار میرزا حەسەن، ئەحمەدی لەگەڵ خۆی دەهێنا گلۆلانێ بۆ ماڵە ئێمە. جا بۆیە لەگەڵ ئەحمەد بەڕاشکاوی باس و خواسمان بوو. بیروڕای خۆی لە لای من دەردەبڕی. سەبارەت بە ڕەوشتی ئاغایان و عەشایر و کردەوەی ناحەزی پیاوەکانیان لە شاردا دەردەدڵی دەکرد و

دەیگوت: «زیاتری لاوانی مەهابادی ئەسلەحەیان کڕیوە، ئەگەر خراپیان لەگەڵ بزووونەوە، وەدەس دێن. ئەوە دەورانی ڕابردوو نیە شکاک و مەنگوڕ و عەشایر زۆر جار دەهاتن و مەهابادیان تالان دەکرد. ئەو تالانەی ڕابردوو کە بە سەر مەهاباد هاتووە، ناکرێ دووپات بێتەوە.»

لە قسەکانی ئەحمەدڕا لێم حاڵی بوو کە بزووتنەوەیەکی نهێنی لە مەهاباد سەری هەڵداوە. ئەمن ئەو بیروڕایەم وەک شتێکی باوەڕپێکراو لە پڕێسکەی زەین و خەیاڵم وەپێچا و ڕامگرت تا بزانم داهاتووی وڵاتەکەمان چی لێدێ.

سەروبەندی پاییزێکی درەنگ بوو، خدرئاغا نەخۆشییەکەی چاتر ببوو. دوکتوران ئیستراحەتیان لە ماڵی خۆی بۆ نووسی و گەڕاینەوە گوندی گلۆلانێ بۆ ماڵی خۆمان. ئەمن دیسان مامۆستایی و دەرسی منداڵانم دەسپێکردەوە و هەتا بەهاریساڵی ١٣٢٢ لە گلۆلانێ مامەوە. لەبەر ئەوەی داهات و جیرمم بەشی گوزەرانی خاوخێزان و ژیانی ئاسایی نەدەکردم، ناچار بووم بنەماڵەی لە ناوچەی گەورکان بگوێزمەوە و بێمە موکریان.

## کۆچوبار لە ناوچەی گەورکان بۆ نێو دێبوکرییان

لە بەهاری ساڵی ١٣٢٢ ماڵم باری کرد و لە موکریان، لە دێی گۆلێ مەرزینگ، لای «برایمئاغای قارەمانی» کە ڕەئیس و ڕدێنسپی عێلی خۆی بوو، بە ناوی نووسەر و میرزا دامەزرام. چون برایمئاغا سەوادی نووسین و خوێندنەوەی نەبوو، بەڵان کاروباری بنەماڵە و ئیداری و تایفەی «قارەمانی» کە تیرەیەکی زۆر و خاوەن نفووسی دێبوکرییان بوون، دەکەوتە ئەستۆی و ئەویش زیاتر لە سەفەر و هاتوچۆدا بوو، هەمیشە و لە هەموو شارێکی دەبوو لەگەڵی هاوڕێ بام. هەلکەوتی باش ئەوە بوو، برایم ئاغا خانوویەکی لە مەهاباد کڕیبوو، بۆیە هەلی مانەوە و دیتنی هاوالان و هاوڕازانم زۆر بۆ هەڵدەکەوت و ڕاز و ڕەمزی ڕۆژگارم بەرجەوەند دەکرد.

## حکوومەتی شیرازەپساوی ناوەندی

لەو چاخ و کاتەدا بە هۆی حوزووری هێزی شووڕەوی لە ئازەربایجان و بەشێکی زۆر لە مەڵبەندی کوردنشینی ئازەربایجانی ڕۆژئاوا و هەروەها بێدەسەلاتی حکوومەتی ناوەندی، بۆ دابین کردنی باری هێمنی لە ناوچەدا

تەنیا پەنا و پاڵپشتی حکوومەتی ناوەندی، عێل و عەشیرە و ئاغاواتی مەڵبەندەکە خۆیان دەنواند. لە حاڵێکی کە عێل و عەشایر و ئاغاوات بە تەواوی چەکدار و لە شار و دێهاتاندا دەسڕۆیشتوو و خاوەندەسەڵات بوون، بۆ نەبڕانەوەی پەیوەندی لەگەڵ خەڵکی دێهات و عێل و عەشیرەتەکان، دەسەڵاتی ناوەندی دەستووری دابوو بە پێی نفووس و سەرانەی شار و دێهات، کۆپینی قەند و شەکر و کووتاڵ بدەن بە خەڵک و بەشی گوندنشینەکانیش بە دەستی مالیک و ئاغایان بڵاو بکرێتەوە.

لە شاری مەهاباد چەند ئیدارەیەک بەڕواڵەت نوێنەری دەوڵەت بوون، بەڵام ئیدارەی زۆر گرینگ و کاریگەر، ئیدارەی ئامار و سەرژماری بوو کە ئاغاوات و مالیکەکان بۆ وەرگرتنی قەند و شەکر و کووتاڵی زیاد، هەموو کوێرەدێ و کۆنەئاوایی‌یان کردبوو بە شارۆچکە و ئاوەدانی گەورە. هەزاران کچ و کوڕ و پیرەپیاو و پیرەژنی قەت لە دایک نەبوویان تێدەئاخنی و پێناسیان بۆ وەردەگرتن و ئیدارەی ئاماریش بە بێ نابێ و ناکرێ، بۆی دەنووسین و دەیدانێ. ئەو پێناسە بێجێیانە دوای چەند ساڵان کە دەوڵەت و حکوومەت جێگیر بوو، بوو بە هۆی دەردەسەر و گیروگرفتێکی زۆر بۆ دێهاتی و مالیکەکان. لەو کاتانەدا تەواوی سەران و گەورەپیاوانی عێلی و عەشیرەتی لە مەهاباد خزابوون و پیاوە چەکدارەکانیان لە دەروازەکانی شاری خەرج و باجیان لە داهات و دەسکەوتی شار و دێهات وەردەگرت و بەڕواڵەت نایب و نوێنەری حکوومەت بوون لە شاریدا.

دەوڵەت بۆ پێڕاگەیشتن بە کاروباری شار و ئیدارات، بۆ ماوەیەکی «عەلی ئاغای ئەمیرئەسعەد» کە سەرۆکی عەشیرەتی دێبوکری بوو کردی بە فەرمانداری مەهاباد. بەڵام ڕقەبەری عێلبەگی و دووبەرەکی شێوەی خانخانی و ناتەبایی و ناکۆکی نێوعەشیرەتی، ماوەی مانەوەیەکی ئەوتۆی بە ئەمیرئەسعەد نەدا و هێندەی نەخایاند تا نەتیجەی کارەکانی وەدەرکەوێ، کە لە فەرمانداری لایانبرد.

## سەدیقەسوور (خاتەمی) کێ بوو و چۆنم ناسی

کاتێک ماڵم هاتە دێی گۆلێ، لاوێکی مەهابادی بە ناوی «سەدیقی خاتەمی» کە پێیان‌دەگوت «سەدیقەسوور»، دەرسی بە منداڵەکانی برایم‌ئاغای قارەمانی و برازاکانی دەگوت و مامۆستا و موعەللیمی ئەوان بوو لە دێدا.

سەدیقەسوور لاوێکی قسەخۆش و پیتۆڵ و وریا بوو و ئەمن زۆرم خۆشدەویست. ئەویش لێم دڕدۆنگ بوو و سڵەی لێدەکردم! دوای ماوەیەک زانیم کە میرزا سەدیق یەکێک بوو لە ئەندامانی دڵسۆزی کۆمەڵەی (ژ.ک) و ئەمن کە نووسەر و دەبیر و ڕازداری ئاغاواتەکان بووم، بۆیە لێم دەسڵەمییەوە کە مەبادا بیناسم و چلۆنیەتی بیر و باوەڕی بدرکێنم.

مەبەست لە گێڕانەوەی بەسەرهاتی خۆم ئەوەیە: ئەگەر بیرەوەری یاریدەم بکا، ناوی کەسانێک دێتە گۆڕێ کە هەریەک بە جۆرێک لە هەڵکەوتەکانی ڕۆژگاری ژیانمدا شوێنەوارێکیان لە سەر بیر و هەستی نەتەوەخوازی من داناوە.

هێندێکیان تۆزێک بوون لە بەسەرهاتی ڕۆژ و ڕۆژگاری کورد و هەرێمی کوردستان. بۆ ئەوەی بیر و باوەڕی سەدیقەسووری مامۆستای منداڵەکان بۆ لای ویست و خواستی خۆم ڕابکێشم، شێعر و هۆنراوەی کاڵوکرچی خۆم بۆ دەخوێندەوە. زۆری پێخۆش بوو و گەشەی پێدەکرد. میرزا سەدیق لە کاتی چوونەوەکانی بۆ شاری مەهاباد، هەست‌وخوستی منی بە هاوڕازەکانی لە کۆمەڵەی (ژ.ک) ڕادەگەیاند و بێ‌ئەوەی بۆخۆم تێبگەم چباسە، تاقم و دەستەیەک لە لاوەکانی مەهابادی کە دەمناسین و دەیانناسیم، زۆریان ڕێز بۆ دادەنام و بە دەوروبەرمدا دەهاتن و دەیاندۆزیم.

## چۆن بوومە ئەندامی کۆمەڵەی (ژ.ک) و چۆنم ناسین

یەکێک لە ئاشناکانی برایم‌ئاغای قارەمانی لە مەهاباد، ئاغای «عەبدوڕەحمانی کەیانی» بوو کە دووکانی کووتاڵفرۆشی هەبوو و سات‌وسەودا و ئاڵووێری لەگەڵ ئەو بنەماڵەیە زۆر پتەو بوو. بەو هۆیەوە لەگەڵ ئاغای کەیانی بووینە ئاشنایەکی نیزیک. زۆر ڕۆژان دەچوومە دووکانەکەی. ئەم هاتوچۆیەی من و ئاغای کەیانی درێژەی کێشا و سامی هەردووکمان بۆ دەربڕینی هەستی دەروونمان تێکشکابوو. بە هۆی ئاواڵ و هاوڕازەکانی دیکەم

لێم حاڵی ببوو کە ئاغای کەیانی یەکێکە لە ئەندامە بنەڕەتییەکانی کۆمەڵەی (ژ.ک). بۆ نیشاندانی بیر و باوەڕی خۆم، چەند هۆنراوەی نەتەوەیی و میللی خۆم بۆ خوێندەوە و چاوەڕێی هەڵوێستی بووم لەو بارەیەوە. با لێرەدا ئەوەش ڕوون بکەمەوە کە ئەندامانی کۆمەڵە هەتا ماوەیەکی زۆر بیر و باوەڕیان بە ئاغاواتەکانی وابەستە بە حکوومەت نەبوو. ئاوا ماینەوە هەتا ڕۆژێکی ئاغای کەیانی کوتی: «کاک نووری سبەینێ لای ئێوارێ وەرە دووکانێ پێکەوە بۆ گەشتێک دەچین بۆ لای «باغی سیسە» کە جێگاگەشتی ئێوارانەی خەڵکی شارییە.» باغی سیسە جێگایەک بوو لە نیزیک پردی ئێستا لە قەراغ شاری. باغ و دارستانێکی سایەدار بوو لە کەناری چۆمی. سەیاحەتگایەک بوو کە ئێواران کاسپکار و بازاڕی و کارمەندانی ئیداری دەچوونە ئەو جێیە. چەند قاوەخانەی هاوینەکەپریان تێدا هەڵبەستبوو و خەڵک لە بن نیسێی داران‌دا دادەنیشتن و قلیانیان دەکێشا و چایان دەخواردەوە.

لای ئێوارێ و لە کاتی دیاریکراو، لەگەڵ ئاغای کەیانی چووینە ئەو باغە. دوای یەک‌دوو سووڕ بە لابەلای داران‌دا، دیتم دووکەس لە قەراغ چۆمی لە سەر کورسی بەرامبەر بە یەک دانیشتبوون و چایان لە پێش داندرابوو. یەکیان پیاوێکی دەنێوەچوو و هێندێک لەڕ و لاواز بوو. ئەوی دیکەشیان لاوێکی جحێڵ و جوانچاک کە بۆشناغی و لاوی لە سەروسیمای دەباری.

کە ئێمەیان دیت، هەردووکیان پێکەنین و کوتیان: «ئاغای کەیانی، زۆرت چاوەڕێ نەهێشتینەوە و ئێمەش هێندە نابێ هاتووین و چایەکانمان هێشتا سارد نەبۆتەوە، فەرموون و لەو کەنار ئاوە لە لامان دانیشن.» چووین و لە لایان دانیشتین. ئاغای کەیانی کوتی: «کاک نووری ئەو پیاوە مامۆستا مەلا «قادری مودەڕیسی»یە و ئەوەش کاک «دڵشادی ڕەسووڵی»یە. هەردووکیان ئەندامی کارامە و دڵسۆز و ڕووناکبیری حیزبەکەمان، کۆمەڵەی (ژ.ک)ن و ئەندامی بناغەداڕێژن. ئەمن پێشتر باسی تۆم بۆ کردوون و تۆم پێ ناساندوون. ئەوان دەیانهەویست لە نیزیکەوە پێک‌بگەین و بۆ هەمیشە تێک‌بگەین.»

دوای تۆخۆش و منخۆشی کوردانە، دڵشادی ڕەسووڵی کوتی: «کاک نووری لەپێش ئەوەی‌دا مامە کەیانی بتپشکنێ و ساغت کاتەوە، کاک سەدیقی خاتەمی کە لە دێی خۆتان مامۆستای منداڵانە، ئەتۆی بە ئێمە ناساندووە و بیروڕای

تۆی بۆمان شیکردۆتەوە. مامە کەیانی و مامۆستا مەلا قادری مودەڕڕیسی کە هەردووکیان پسپۆڕی حیزبەکەمانن، لایان وایە بە بیر و باوەڕێکی پاکی کە هەتە و هەلکەوتی زەمانی و مەکانی ژیان و شێوەی بەیانت، دەتوانی ئەندامێکی کارامە و پڕ سەمەر بی و لە ڕێی پێشکەوت و گەشەدارکردنی حیزبەکەمان، لە شار و دێدا ئەندامێکی دلسۆز بی.»

مامۆستا مودەڕڕیسی کوتی: «کاک نووری ئەتۆ لە هەلومەرجێکی وادا هەلکەوتووی کە دەتوانی بە هونەر و قەلەم و بیری ڕووناکی خۆت، خزمەتی گەورە و گرینگ بە «کۆمەلە» بکەی و بەو هۆیە کە نووسەری ئاغاواتەکانی، دەکرێ لە شار و دێدا، بۆ پەرەپێدانی ئیش و کاری نیشتمانەکەمان، گوندنشینەکاڼ ڕوون کەیەوە و هەستوخوست و ئاکار و کرداری فیئۆدال و ئاغاوات و عەشیرەتەکانت لە بەر چاو و زەینی ئەندامە دلسۆزەکانی «کۆمەلە» ڕوون کەیەوە. دەبێ ئەوەش بزانین کە مەهابادییەکان بیرەوەری تال و سوێریان لە ڕابردووی خۆیان لە دەورانی «عەشیرەتگەری» و «خانخانی دیوە»، بەتایبەت کە لەو سەردەمەدا بە هۆی داگیرکرانی ئێران لە لایەن دەولەتە هاوپەیمانەکان، شیرازەی حکوومەتی ناوەندی پسابوو و عێل و عەشیرەتەکانی ناوچە، بە چەکداری خزابوونە مەهابادەوە و هەر دەستە و تایفەیەک مزل و مالێکی بۆخۆی دیاری کردبوو و دەترسان سەربزێوەکانی عێلات بە تالانوبڕۆ، ڕابردووی تال دووپات کەنەوە. هەر ئەو تێبینی و بەرجەوەندییە بوو کە ڕووناکبیران و لاوانی مەهابادی هێنابووە سەر ئەو بیر و باوەڕە کە لەم هەل و دەرفەتەت و بۆشاییەدا، بۆ دوو مەسەلەی گرینگ کەلک وەرگرن.

یەکیان جوولانەوە و هاندانی کۆمەل بۆ پێکهێنانی هەستی نەتەوەیی و بزووتنەوەی جەماوەر لە ڕێی ئامانج و ئاواتی لەمێژینەی کورد و کوردستانی یەکگرتوو و دووهەمیان، ئامادەیی و چالاکی هێزی گەنج و لاوەکان و چینی نیشتمانپەروەر، بۆ بەربەرەکانی لەگەل سەرەرۆیی و بێبەندوباری کەلەوەکێشان و هەلپەرەستان، کە نەیەلن شێوە و ڕەوشتی شووم و ناحەزی زۆردارەکانی ڕابردوو، لە مەهاباد و هەرێمیدا سەرهەلدا و بژیەتەوە. ئەو دەستە پیاو و لاوانەی مەهابادی کە هاتبوونە سەر ڕێی ڕاستەقینەی ژیان و ژیانەوە، وەکوو پەروانە لە دەوری شەمی ڕووناکی «پێشەوا»ی نەمر «قازی

محەممەد» هالابوون کە وەک دالدە و پشتیوانی کۆمەڵەی (ژ.ک) وا بوو لە مەهاباد. مامۆستا مودەڕڕیسی کوتی: «داخەکەم ماوەم نەماوە و ناتوانم ئەوەی دەیزانم لە بارەی تالّی و تووشی دەورانی دەرەبەگی و زۆرداری لە ڕابردوودا، بیلّێم و بینووسمەوە.»

بێمەوە سەر جوابەکەی خۆم، کوتم: «مامۆستا دەرسەکانم ڕەوانە، ڕێچکە و ڕێبازەکەشم عەیانە». مامۆستا کوتی: «کاک نووری دەسنوێژت هەیە؟» کوتم: «مامۆستا ئەوە قەراغ چۆمە، کە ئاو هەبێ، تەیەممومم بەتاڵە.» گورجێک هەستام و دەسنوێژم شوشت و هاتمەوە لایان. نوێژی شێوان بوو. سەیرانچی وردەوردە بەرەو شار دەبوونەوە. لە گۆشەیەکی ئارام و بێدەنگی باغی سیسە، چوارکەس وەک «عەناسوری ئەربەعە»، سەریان پێکەوە نابوو و گەرمی وتووێژی خۆیان بوون.

مامۆستا کوتی: «کاک دلّشاد بۆ ڕاماوی؟» کاک دلّشاد دەستی بە باغەڵیداکرد، قورئانێکی چکۆلەی هێنادەر و ماچی کرد و لە پێشی دانام. کوتی ئەو چەند بەندەی لەو کاغەزە نووسراوە، بیانڵێ و سوێندیان بۆ بخۆ. وەک لە بیرم مابێ ئەمانە بوون:

١ـ خەیانەت بە نەتەوەی کورد نەکەی.

٢ـ هەوڵ و کۆششت بۆ سەربەخۆیی کوردستان بێ.

٣ـ هیچ ڕازێکی ڕێکخراوە، نە بە زمان و نە بە قەڵەم و نە بە ئیشارە، ئاشکرا نەکەی.

٤ـ هەتا کۆتایی ژیان هەر ئەندام بی.

٥ـ تەواوی پیاوانی کورد بە برا و ژنانی کورد بە خوشکی خۆت بزانی.

٦ـ بێ ئیزنی کۆمەڵەی (ژ.ک)، نەبی بە ئەندامی هیچ ڕێکخراوە و دەستەیەک.

لە دوایە دەفتەرێکی لە باغەڵی دەرهێنا، وادیار بوو ناو و ژمارەی ئەندامەکانی تێدابوو، ژمارەی ٨٥ی لێنووسی. لە پاشان کوتی، ئەندامەکانی کۆمەڵە هەرکام دەبێ ناوی نهێنییان هەبێ! ناوی نهێنی تۆ لە کۆمەڵەدا دەبێ «عەتری» بێ. دەمهەوێ ئەتۆ هەمیشە بۆنی عەتری نیشتمانەکەمان بی. مامۆستا مودەڕڕیسی و ئاغای کەیانی پێکەنین و کوتیان: «یاخوا نیشتمانەکەمان بە بۆنی

عـەتری ئـەم لاوانـە ، بـۆ هەمیـشە بـە ڕەنـگوبـۆن بـێ.» هەسـتاین و وەک جێژنەپیرۆزە یەکترمان لە باوەش گرت و ڕووی یەکترمان ماچ کرد.

یەکیەک سەیرانکەر کە بەرەو شار دەگەڕانـەوە و بـە لامـاندا تێدەپـەڕین ، ڕەنگە لایان وابووبێ ئێمە مەستین! داخەکەم لێیان حاڵی نەبوو کە ئێمە مەسـتی ویست و خواست و هەستین. بەرەو شار گەڕاینەوە و هەرکام بەرەو ماڵە خۆمـان جوێ بووینەوە، بەڵان ئەمن ئەوە نەبووم کە چووبووم، گۆڕابووم، ئینـسانێکی دیکە بووم. بارێکی قورس لە سەر شـانم سـەنگینی دەکـرد، پـێم وابـوو بـاری ئەمانەتێکی گرینگم هاویشتۆتە سەر شانی خۆم. بەڵان شاییم بە خۆم بوو کە لە ڕێی ئامانج و ئاواتی نەتەوە و نیشتمانێکی تێـیدا خولـقاوم و تێـیدا ژیـاوم و هەنگاوهاوێژ بووم و فێری واتە و لەهجە و ڕاوێـژ بـووم، شـیاوی ئەوەیـە لـە ڕێگایدا بمرم و لە پێیدا سەر دانێم.

دیمەنی وڵات و سیمای نەتەوە لە بەر چـاوم گۆڕابـوو، بێگانـەم نـەدەدی، هەمووی ئاشنا بوو. بێوەفاییم نەدەدی، هەموو شت لە زەیـنمدا بـاوەڕ بـوو، بەقا بوو. جوزئێک بووم لە کوللێک و کوللێک بووم کە لە ئەجزای خـۆمدا بـڵاو دەبوومەوە. شوان، گاوان، مەلا، مجێور، سەپان و وەرزێـڕ، ببوونـە ڕیـشەی دارێک کە بە هەموویان بەرگ و بەر و باڵایان بەخێو دەکرد. لە شـار و لـە دێ، هەموو لە ڕێی نیشتماندا، لـە پـێش چـاوم هاوقەسـەم و هاوپـەیمان بـوون و ئەوەش شتێکی دیارده بوو چونکە تەنانەت بەشێکی زۆر لە ئاغاوات و مالیـک و عەشیرەکان، ببوونە ئەندامی کۆمەڵەی (ژ.ک) کوردستان.

لە ئێراق و تورکیـا و سـووریاشڕا نوێنـەرەکانیان دەهـاتن و مەڕامنامـەی کۆمەڵەیان وەردەگرت و دەچوونەوە و ئەرکی ئەندامەتی خۆیان بەجێ دێنا.

لە لای برایمئاغای قارەمانی، زیاتری ڕۆژەکان لـە مـەهاباد بـووین. ئـەمن ماوەم بوو لەگەڵ ئەندامانی حیزب (کۆمەڵە) و هاوڕازەکان هاوکاری بکەم و لـەم بارەوە گیروگرفتم نەبوو. ئازاد دەگەڕام و ئەرکی ڕێکخراوەیی خۆم بەڕێوە دەبرد.

## چوون بۆ تەورێز و پێشهاتێکی چاوەڕواننەکراو

وەک لە پێشدا ئاماژەم پێکرد، حکوومەتی ناوەندی بۆ ئەوەی تێکەڵاوی خۆی لەگەڵ خەڵکی کـورد نەپـسێنێ، گەڵاڵـەی کـۆپینی قەنـد و شـەکر و کووتاڵـی

دامەزراندبوو، تا لە ڕێی ئاغاوات و مالیکەکان ئەو ئامانجەی وەدی بێ و هەرکەس بەپێی نفووسی دێهاتەکەی، بچێ و لە تەورێزێ وەریگرێ. مەبەستی ئەوە بوو کە ئاغاوات و عەشایر، لە تەورێز، تێکەڵییان لەگەڵ ئیدارات و دەوڵەت تێکنەچێ، چونکە ئەوکات ئەرتەش و سپا و ئوستاندار و ئیدارات لە تەورێز، لە سەر کاری خۆیان مابوون.

بۆ وەرگرتنی قەند و شەکر و کووتاڵی کۆپینی، لەگەڵ برایمئاغا و دوو کەس لە بنەماڵەی قارەمانی، چووینە تەورێز. لەو هاتوچۆیانەدا هێندێک ئاکار و کردەوەم دەدی کە بۆ گێڕانەوە نابێ. ماوەیەکی زۆر ماینەوە و زۆرێک لە کەسانی عێل و عەشایری دیکەش وەک ئێمە مابوونەوە و ئیدارەی قەند و شەکر، زیاتر دەستیدەستی پێدەکردن و مەحتەلی دەکردن و بە سبەینێ و دووسبەی، ڕۆژەها لە تەورێزێ دەمانەوە.

ئەم پێشهاتە بۆ گێڕانەوە دەبێ: ڕۆژێک برایمئاغای قارەمانی پێی‌کوتم: «میرزا، واباشە نامەیەک بۆ فەرماندەی لەشکر بنووسی و پێشینەی خزمەتگوزاری عێلی قارەمانی کە شانبەشانی ئەرتەشی شاهەنشاهی لە دەورانپشتی سنوور کە لە هەموو هەڵکەوتەکانی دەوراندا بەجێیان هێناوە، وەبیر بێنییەوە، لام وایە فەرماندەی لەشکر دەستوور دەدا کە ئیدارەی قەند و شەکر، هێندەمان ئەوڕۆ و سبەینێ پێنەکا.» لەو کاتەشدا ڕەئیسی ستادی ئەرتەشی تەورێز، سەرهەنگ «وەرەهرام» بوو کە لە پێشدا ڕەئیسی ستادی تیپی مەهاباد بوو. ئاغایانی عەشایر و عێلاتی یەکبەیەک دەناسین. ئەفسەرێکی وریا، ڕووهەڵماڵاو و بێپێچانەوە بوو و ئەوەی بە دڵیدا دەهات وەسەر زمانی دەکشا. (وەرەهرام لەدوایە بوو بە سپەهبود و دواتر بوو بە سیناتۆر و لە ساڵی ١٣٥٧ کردیانە ئوستاندار لە ورمێ و لە توندی دەورانی بزووتنەوەی شۆڕشی گەلانی ئێراندا، سەفەرێکی هاتە مەهاباد کە خەڵک ڕێزێکیان لێنەگرت. هەر ئەوەش بوو بە هۆی لاچوونی لە ئوستانداری و هاتەوە تاران و لە دوارۆژەکانی ڕژێمی شایەتی، ئەویش وێڕای ئەمیرانی ئەرتەش، هەڵات بۆ هەندەران.)

شەوێ دانیشتم و بەپێچەوانەی ئارمان و ئامانجی خۆم، نامەیەکی شاپەرەستانەم لە لایەن عێلی قارەمانییەوە، بۆ سەرهەنگ وەرەهرام، ڕەئیسی

ستادی ئەرتەشی تەورێز نووسی. برایمئاغا بە ناوی سەرۆکی عێل و ئەوانی دیکەش مۆریان کرد و دام بە ئاغای قارەمانی. برایمئاغا کوتی: «هەڵیگرە با پێتبێ. سبەینێ هەموومان پێکەوە دەچینە ستادی لەشکر و بۆخۆت نامەکە بدە بە سەرهەنگ.» بۆ سبەینێ، برایمئاغا و دوو کەس لە خزمەکانی چووینە دایرەی ستادی لەشکر و دوای خۆناساندن و ئیجازەی ئاجودان، چووینە لای سەرهەنگ وەرەهرام. لەو هەلومەرجەدا دەوڵەت و ئەرتەش، ڕێز و حورمەتێکی زۆریان بۆ عێلات و عەشایری کورد دادەنا و لە هەموو چەرخ و خولێکی دەوراندا ئەوانیان بە ئێلجاڕ و پارتیزانی گیانباز دەژماردن و هەتا هێنانەگۆڕی «ئیسلاحاتی ئەرزی» و هەڵوەشانی سیستمی ئەرباب و ڕعێتی، عێلات و عەشایر لە هەموو مەڵبەندێکدا، ڕاگر و پاسەوانی نیزامی شاهەنشاهی و هۆی دەوام و مانەوەی ئەو ڕژێمە بوون لە مێژوودا.

کاتێک چووینە هۆدەی سەرهەنگ وەرەهرام، زۆر بە ڕووخۆشی و شادمانییەوە لەگەڵمان ڕووبەڕوو بوو. دوای چاکوخۆشی و ئەحواڵپرسی سەبارەت بە چلۆنایەتی و حاڵوباڵی وڵات پرسیاری کرد. ئاغای قارەمانی کوتی: «جەناب سەرهەنگ ئێمە ماوەیەکە بۆ وەرگرتنی بەشە کۆپینی خۆمان و ڕعێتەکانمان لێرە ماوینەوە.» ئەمن نامەکەم لە پێش دانا و خوێندییەوە و کوتی: «دەی ئاغای قارەمانی، باس و خەبەری مەهابادەکەت چیە؟ حیزب و میزبان چ دەکەن و دەڵێن چی؟ سەربەخۆیی خۆیان کەنگێ ڕادەگەیەنن؟»

ئاغای قارەمانی کوتی: «جەنابی سەرهەنگ وەک لە پێشدا عەرزم کردی، ئێمە حەوتوویەک زیاترە لێرە گیرمان کردووە. ڕعێت و دێهاتییەکان زۆریان بۆ هێناوین و پێیان وایە ئێمە کۆپینمان وەرگرتووە و بەشی وانمان نەداوە و خواردوومانە. جەنابی سەرهەنگ ئەو هەرا و هەڵلایەی کە دەستەیەک جەوان و لاوی دنیانەدیوی مەهابادی سازیان کردووە، دێهاتی و ئاغاواتەکان لێیان بێخەبەرن و کاریان بەو بگرەوبەردانانە نیە. جەنابی سەرهەنگ، دێهاتییەکانمان زۆر پاک و خاوێن و خوداناسن و پێیانوایە ئەوەی ڕووسەکان دەیڵێن و دەیکەن، موسڵمانانە و خوداناسانە نیە.» هەرچەند قسەکانی ئاغای قارەمانی، وڵامی پرسیارەکانی سەرهەنگ نەبوو، بەڵان زەینی سەرهەنگی

بەرەو چین و توێژێکی مەڵبەند ڕاکێشا کە کەینەوبەینەیان لەگەڵ سیاسەت و کردەوەی ڕووسەکان نیە و ئەوانیش وەک ئاغاوات و عێل و عەشایر، خۆشیان لە هەنگاوەکانی ڕووسان نایە لە ئێران.

لەو دەمەدا ئاجودانی سەرهەنگ هاتە ژوورێ و دوای ئیحترامی نیزامی کوتی: ئاغای قاسمئاغای ئێلخانیزادە، وەختی لە جەناب سەرهەنگ دەخوازێ.
سەرهەنگ کوتی: بلێ فەرموو بێتە ژوورێ.

## شەڕەدندووکەی قاسمئاغای ئێلخانیزادە (موهتەدی) و سەرهەنگ

قاسمئاغا هاتە ژوورێ. دیاربوو پێشتر ناسیاوی و ئاشنایەتییان پێکەوە زۆر بووە. سەرهەنگ لەبەری هەستا و دەستی لەگەڵ دایەوە و لە تەنیشت خۆی داینا و کوتی: «قاسم چەندێکە هەر ناتبینم و لێمان ناپرسی؟!» قاسمئاغا کوتی: «جەناب سەرهەنگ چەند ڕۆژێکە لە تەورێز ماومەوە و گیروگرفتی خانەوادەگی و کاری دیکە ماوەی نەدەدا بێمە خزمەتتان. لە لایەکی دیکەوە کاری بەشە کۆپینی مالیک و ڕعێت وای بەخۆیەوە خافلاندووم کە نەپرژاومە سەر وەزیفەی گرینگم کە دیداری جەناب سەرهەنگە.» سەرهەنگ کوتی:«دوێنێ، پێرێ، یان لەو ڕۆژانەدا چوویەوە مەهاباد یان لەوێ نەبووی؟» قاسمئاغا کوتی: «جەناب سەرهەنگ بۆچی وام دەپشکنی؟ کوتم خۆ نیزیک حەوتوویەک دەبێ لە تەورێزم.» سەرهەنگ کوتی: «بۆیەت دەپشکنم، ئاگاداری پەیتاپەیتای حیزبی دێموکراتی کوردستانی تۆ، دوێنێ وەدەرکەوتووە و ئەورۆ بۆ منیان هێناوە، بە ئیمزای هێندێک لە پیاوماقوولانی مەهابادی و ئیمزای تۆشی پێوەیە!» دەستی برد و کەشەوی میزەکەی کردەوە و ئاگادارییەکی دووروودرێژی هێنادەر و کوتی: «ئەوەش ئیمزای قاسم ئاغای ئێلخانیزادە و ئەوانی دیکە!»

ئێمە پێمان سەیر بوو، دوێنێ ئاگاداری بڵاو کراوەتەوە، ئەورۆ لە لای سەرهەنگە. قاسمئاغا کوتی: «جەناب سەرهەنگ ئاگام لەو ئاگاداریيە نیە و ئەمنیش ئیمزام نەکردووە.» سەرهەنگ بڕێک بە تووڕەیییەوە کوتی: « قاسمئاغا ئەتۆ کارەکانت زۆر ناحەزن، کردەوەت لە ناوچەدا زۆر نالەبارن. قاسم، ئەمن لەبەر حورمەتی ئەو پیاوە ڕدێنسپی و عالم و زانایانەی دێبوکری، کە «حاجی بایزئاغایە»، هیچم لەگەڵ تۆ نەکردووە و پێنەکراوە، دەنا هەتڵە و هەڵەی تۆ

لە ناوچەدا جێگای چاوپۆشی نەبوو.» قاسمئاغا کوتی: «جەناب سەرهەنگ دەڵێم نیزیک حەوتوویەک دەبێ لێرمم و ئەوەش نە ئیمزای منە و نە ئاگاداری ئەو نووسراوەم.» وەرەهرام کوتی: «قاسم بۆ ساغکردنەوەی داوای خۆت ئەگەر ڕاست دەکەی، وەک هەواڵی دوایین سەفەری باکۆیەت لە ڕۆژنامەکاندا وەدرۆخستەوە، هەرواش بێخەبەری خۆت لەو ئاگادارییە و بزووتنەوەی ناحەزی حیزبی دێموکرات لە بارەی جەعلی ئیمزای خۆت وەدرۆ بخەوە.» قاسمئاغا کوتی: «جەناب سەرهەنگ چاک بوو بۆخۆت وەبیرت هێنامەوە، لە سەفەری ئاخریدا کە هێندێکیان لە سەرانی کورد بۆ باکۆیە بانگهێشت کردبوون، هێندێک لە ڕۆژنامەکان بڵاویان کردەوە کە قاسمی ئێلخانیزادەش لەو بانگهێشتەدا بەشدار بووە. ئەو تەشقەڵەشیان هەر ئاوا پێکردم و بۆخۆشت دیتت لە ڕۆژنامەکانی «کەیهان» و «ئیتلاعات»دا وەدرۆم خستەوە. ئەوەش درۆیەکی دیکەیە بە بەژنی منی دەبڕن.» سەرهەنگ پێکەنی و کوتی: «قاسم (جواب کلوخانداز را سنگ است)، ئەتۆ دەتوانی ئەوجاریش درۆزنان وەدرۆ بخەیەوە و ئیعتباری خۆت لە لای دەوڵەت نیشان بدەیەوە.» قاسمئاغا کوتی: «جەناب سەرهەنگ، وەک دەڵێی وادەکەم.»

ئاغایانی قارەمانی هەموو بێدەنگ و کڕومات بوون. هەستی هاوئەندامی کۆمەڵەی (ژ.ک) هانی دام هاوارم لێپەیدا بێ، چون کوڕەکانی حاجی بایزئاغا هەموویان ئەندامی کۆمەڵە بوون و بەکردەوە و بزووتنەوەی خۆیان لە ڕێی پێشکەوتی ئامانجی کۆمەڵە لە شار و دێدا، نیشانیان دابوو ئەندامێکی دڵسۆز و نەبەزن. کوتم: «جەناب سەرهەنگ ئێمە حەوتوویەک زیاترە لە تەورێزین، لام وایە قاسمئاغا لە پێش ئێمەشدا لێرە بووبێ؟» ئاغای قارەمانی کوتی: «ڕەنگە قاسمئاغاش وەک ئێمە گیرۆدەی وەرگرتنی بەشە کۆپین بێ.» سەرهەنگ بەوەی پێکهات کە قاسمئاغا لە ڕۆژنامەیەکدا، ئیمزای ئەو ئاگادارییە وەدرۆ بخاتەوە، کە وەدرۆی نەخستەوە. لە دوایە سەرهەنگ کوتی: «ئاغای قارەمانی لە بن ئەو نامەی نووسیوتانە، بۆ ئیدارەی قەند و شەکر دەنووسم، بەزوویی داوای ئێوە جێبەجێ بکەن.» کە ئەوەی گوت، ئێمە هەستاین بڕۆین. قاسمئاغاش بە پێکەنینەوە کوتی: «جەناب سەرهەنگ ئەمنیش وەدەردەکەوم، دەچم

درۆودەلەسان دەکووژێنمەوە.» دیار بوو لەگەڵ سەرهەنگ پێشینەی ئاشنایی و دمەقرەیان زۆر پێکەوە بووبێ.

ماڵاواییمان کرد و هەر وەدەرکەوتین، برایمئاغا کوتی: «بەڕاستی ئیمزای تۆیان جەعل کردووە؟» قاسمئاغا بە پێکەنینەوە کوتی: «برایمئاغا ئەگەر کردبێتیان بە چاکە کردوویانە قەیدی ناکا، ئەمنیش سبەینێ زوو دەڕۆمەوە، خودا دەزانێ لەگەڵ وەرەهرام کەنگێ یەکتر دەبینینەوە، ئەمنیش ئەو کارە چاکەی ئەوان ناشۆمەوە.

ئەو هەڵکەوتە نیزیک ٦٠ ساڵی لێڕادەبرێ، برایمئاغا و قاسمئاغا هیچیان نەماون، هەردووکیان بوون بە حاجی و ساڵەکانی ژیانیان مەردانە بردە سەر. قاسمئاغا تا بڵێی کورد و نەتەوەخواز بوو و لە ئەندامانی شیاو و لێهاتووی کۆمەڵەی (ژ.ک) بوو. برایمئاغای قارەمانی کە ئەویش بوو بە حاجی هەتا بڵێی پیاوێکی ڕاست و دروستکار و عێلخواز بوو و مەردانە ژیا و ئابڕوومەندانە سەرپەرەستی عێل و بنەماڵەی قارەمانی دەکرد. ئەوان مەزنەپیاوان ئێستا من و نیزیکانیان بەجێهێشتووە، هەردووکیان لە خاک خزیون، بەڵان لە نەتەوی نەبەزیون، ڕەوانیان شاد بێ.

## کوا دەبێ شەریکی دز و ڕەفیقی قافڵە بی؟

غەم و پەژارە و کەسەرێکی زۆر، دڵ و دەروون و بیروڕای داگرتبووم. بۆخۆم لە خۆم دەپرسی، ئەمنێکی دڵسۆز و سوێندخواردووی کۆمەڵەی (ژ.ک) کە دەبێ بەپێی سوێندێکی خواردوومە، خەیانەت بە نەتەوەی کورد نەکەم، نە بە قەڵەم، نە بە زمان و بەپێچەوانەی ئاوات و ئامانجی گەلی کورد نەبزوومەوە؟ چۆن دەبێ ئێستا لە پێناوی وەرگرتنی قەند و شەکر و مەسڵەحەتی دەوڵەتی‌دا کە خەڵکی پێفریو دەدا و دەیانخافڵێنێ، لە پێش بارەگای نەتەوی‌دا بە کڕنۆشەوە بدوێم و بنووسم؟ ئەگەر وەک سەدیقەسووری خاتەمی مامۆستا و موعەللیم بام، منداڵان و لاوانی نەتەوەی خۆم لە ئامێزی ئارمانی کوردستانم هاویشتبان، چاکتر و حیزبپەسەندتر نەدەبوو؟ ئەورۆ پێویست نەبوو ڕێی ئەرکی خۆم لێ بگۆڕێ و تووشی هەتڵە و لاڕێیی بام. نان پەیداکردن و خێزان بەڕێوە بردن پێویستە، بەڵان بە هەموو نرخێک نابێ مشتەری و کڕیاری بی. هاتبوومە سەر

ئەو بیروڕایە ئەگەر لە جێیەک بە موعەللیمی دامەزرێم و دەرسی بە منداڵان بڵێم، پێویست ناکا قەڵەم بکەمە زوڕنا و هەڵپەڕکێی نەیاری پێگەرم دابێنم.

لە هەلکەوتی کار و کردەوەی خۆم بێزار بووم، ئەویش لە هەلومەرجێکی وادا کە ژن و پیاو، پیر و لاو، زانا و باسەواد و ڕووناکبیرەکانی مەهاباد و مەڵبەندی موکریان، لە شاروێرانەوە بگرە هەتا دەشتی «حاجیحەسەن» کە پاڵ وە میانداوێ دەدا بوونە ئەندامی کۆمەڵەی (ژ.ک) و لەگەڵ پیرانشار و شنۆ و لاجانێ لە ڕێی ئارمانی نەتەوەییدا گیانباز و لە خۆبوردوون.

لە حاڵێکا حیزبی دێموکراتی کوردستان ڕۆژبەڕۆژ پایە و بناغەی خۆی بۆ دامەزراندن و پتەوکردنی بنچینەی ئازادی کوردستانی سەربەخۆ دادەڕێژێ و پوختەی دەکا، بەداخەوە تاقمێک لە عێل و عەشیرەتەکانمان بۆ وەرگرتنی قەند و شەکری کۆپینی، تەورێزیان کردۆتە مەکۆگە و سەروکاریان لەگەڵ دامودەزگای دەوڵەتی و ئەرتەش (هێزی لەشکری حکوومەتی) تێکهاڵاندووە؛ تەنیا ئاغایانی قارەمانی نەبوون بەڵکە تەواوی مالیک و ئاغاوات و عێل و عەشیرەتەکانی وڵات لەو ڕێیەدا هاوهەنگاو بوون. ئەو جۆرە بزووتنەوانە مەسەلەی دووبەرەکی و لێک جیای لە سیمای هەرێمدا دەخاتە بەرچاو و نیشانی دەدا. ئەوە بوو کە من لەو نێوەدا خۆم بە غەریبەیەک دەزانی کە ڕێگای خۆم لێ گۆڕابوو، قەڵەمی من دەبوو لە ڕێی ئاوات و ئارمانی هاوڕاز و هاوبازەکانم بگەڕێ و بنووسێ و بدوێ.

دەڵێن: خدا گر بە حکمت ببندد دری      بە رحمت گشاید در دیگری

لەو سەروبەندەدا بوو کە پیاوێک لە ئاشنایانی کۆن و خانەوادەگی کە ماڵی لە دێی «شێخاڵی» بوو، بە میوانی هاتە ماڵێ. دوای بەخێر هاتن و تۆخۆش و منخۆش، کوتی: «ڕاستت دەوێ بە ناوی دیدەنی هاتووم، بەڵان لەو ڕۆژانەدا لە لای حاجی «حەمەدئاغای حیسامی» بووم کە چوار یان پێنج کوڕ و نەوەی زەلام و نەخوێندەواری هەیە، دەیهەویست خوێندەوارێکی وەدەسکەوێ و دەرس بە کوڕەکانی بڵێ. ئەمن باسی سەواد و میرزایەتی تۆم کرد و کوتم لە گۆلێ، میرزای برایمئاغای قارەمانییە، زۆری خۆشدەوێ و بۆ شارەکان هەمیشە لەگەڵی هاوسەفەرە و زمان قەڵەمێتی. کە ئەوانەم بە حاجی ئاغا گوت، هەڵیپێچام و کوتی خدر، بە ناوی دیتن دەبێ بچییە گۆلێ و پێی بڵێی ئەگەر ماڵی بێتە شێخاڵی و دەرس بە کوڕەکانم بڵێ، چاکەی زۆر لەگەڵ دەکەم و چاکی

دادەمەزرێنم. جێوڕێ و خانووبەرەی خۆش و خاوێنم هەیە. بۆ ئەو سێ مانگە زستانە سی تەغار گەنمی لە ئاشی «خوراسانە»ی بۆ دەکەمە ئارد و بە وشترەکانی خۆم دەینێرمە مەهاباد بۆی بفرۆشن. چاکەی دیکەشی زۆر لەگەڵ دەکەم، بێ و دەرس بە کوڕەکان بڵێ. خدر ئەو کارەم بۆ جێبەجێ بکەی، وا دەزانم دنیات داومێ. جا نازانم ئەتۆ دەڵێی چی؟

کاک «خدری مامئاغا» کەشاوەرزێکی تێروتەسەل و باوەڕپێکراو بوو و دەمزانی شاتوشووتی نیە. بەڕاستی کاتێک ڕوانیمە ئاوات و ئارمانی خۆم کە لەگەڵ کار و پیشەی ئێستام یەکتری ناگرنەوە و دەبێ قەڵەمی لە باری نالەباردا دابگێرم، کوتم: ئەوە هەمان دەرکە کە بە ڕەحمەت دەیکاتەوە. پڕ بە پێستی ئاواتم بوو کە لە جێیەک بە شوغڵی مامۆستا و موعەللیمی دامەزرێم و ئەوە بێ وەدواکەوتن بۆی هێنامە پێشێ. کاک خدر چاوەڕێی وڵامی منە، ئەمنیش چلۆنایەتی گوندی شێخاڵی و بنەماڵەی حاجی حەمەدئاغای حیسامی و شێوەی بەڕێوەچوونیانم بە وردی لە کاک خدر پرسی. لە هەر بارێکەوە جوابەکانی دڵخواز بوو، وێدەچوو لەو هەلومەرجەی تێیدا دەژیم، لە داهاتوودا بۆ من جێگەی حەسانەوە بێ. کوتم کاک خدر دڵت ناشکێنم. دوای نەهار لەگەڵت دێم بۆ لای حاجی حەمەدئاغا، ئەگەر بە دڵم بوو و سازاین، ئەوە ماڵم دێتە شێخاڵی و لێت نیزیک دەبمەوە.

بەکورتی، لەگەڵ کاک خدر چوومە شێخاڵی و لەگەڵ حاجیئاغا سازاین و لە شێخاڵی مامەوە و کاغەزم لە ئاغای قارەمانی نووسی کە ئەمن هیچ گلەییەکم نیە و پێمخۆشە لە گۆلێ بڕۆم و بچمە شێخاڵی. دوای ئەوە، ئاغای قارەمانی دوو جاری بەدووودا ناردم و نەچوومەوە و ئیزنی دا ماڵەکەم لە گۆلێ بارکەم. لە شێخاڵیڕا وەسیلەی ڕاگوێزتنی ماڵ و خێزانیان نارد بۆ گۆلێ و لە سەرماوەزی ١٣٢٣دا، ماڵم هاتە گوندی شێخاڵی تا وەکوو مامۆستا دەرس بە کوڕەکان بڵێم.

## کۆچ و کۆچبارێکی دی لە گوندی گۆلێ بۆ گوندی شێخاڵی

خوداڵێخۆشبوو حاجی «حەمەدئاغای حیسامی»، پیاوێکی گەڕاوە، تەمەندار، موسوڵمان و لە خواترس بوو. گەوره و ڕدێنسپی بنەماڵەی «مەعرووفی»یەکان لە عێلی دێبوکری بوو. حاجی نۆ کوڕی هەبوو. کوڕی

گەورەی «سمایلئاغا» بوو کە لە دوایە بوو بە حاجی سمایل ئاغا و ماڵی هاتە بۆکان. سێ کوڕ و نەوەیەک و برازایەکی لە لای من دەرسیان دەخوێند. لە مانگی سەرماوەزی ساڵی ١٣٢٣ هەتا کۆتایی خاکەلێوەی ١٣٢٦، بۆ ماوەی سێ ساڵان لە شێخاڵی مامەوە و لە دوایەدا بیرەوەری و ڕووداو و پێشهاتی زۆرم لە ژیاندا وەبەر هاتن کە هەرکام لەو پێشهاتانە، بوو بە خاڵێکی لەبیرنەچووی مێژوویی.

لە گوندی شێخاڵی بوو کە لەگەڵ کاک «خالیدی حیسامی» (هێدی) ئێستا و (شێواو)ی ئەوکات یەکترمان ناسی و پێکگەیشتین و تێکگەیشتین و گڕوگاڵی شێعر و هۆنراوەمان دەسپێکرد. بیروڕامان لە ڕێبازی هەستی نەتەوەخوازی و ئارمانی کۆمەڵەی (ژ.ک)، یەکتریان دەگرتەوە و شەوق و زەوقی گەنجی و لاویمان لەو ڕێبازەدا پشکووت و گەشەدار بوو. کاک خالید ئەوکات لاوێکی قیتوقۆز و لەبەردڵان بوو و زۆر بە زوویی ئۆگری یەکتر بووین. هەردووک هەستیار و شێت و شەیدای هەستوخوستی نەتەوە و نیشتمانپەروەری بووین. ئەوکات بە ناوی (شێواو) شێعر و هۆنراوەی دەنووسی کە ئێستا پێی وایە (هێدی) بۆتەوە.

بەڵان لە نووسینی ئەو بیرەوەرییەی خۆمدا پرسیارێکم لە کاک خالید بۆ دێتە پێشێ. کاتێک مام هێدی بارگە و بنەی پێشەکی «کاروانی خەیاڵ»ی تێکدەنا و دەیپێچاوە، بۆچی ئەمنی لە شیرین خەوێدا بەجێهێشتووە و بەتەنێ خۆی دزیوەتەوە، وەک پێکەوە ڕێبوار نەبووبین و هاودەنگی ڕۆژگار و شەوگاری یەکتر نەبووبین. ئاخر ئەوە نەبوو کە:

ما و مجنون همسفر بودیم و در دشت جنون
او بە مقصدها رسید و ما هنوز آوارەایم

جا با ئەو کەر و باری ڕاست بێ و ئەمنیش جلوبەرم خوار بێ؟!

ئەم پرسیارەم لە گۆواری «سروە»، لە ژێر سەردێڕی «هێدی» و «نووری»دا نووسیوە کە لە دوای هۆنراوەی «دمەلاسکە»ی خۆم بە دوای «وڕێنە»ی ئەودا دەپرسم: مامە (هێدی) لە کاتێکدا ئەتۆ (شێواو) بووی و ئەمنیش (عەتری گلۆلانی)، لە گوندی شێخاڵی بە گیرفانی خاڵی تەپڵی شایەتیمان لێدەدا، لە دنیای هومێد و هیوادا دەژیاین و لە سیپارەی هەڵبەست و هۆنراوە دەدواین و پێگەمان شەوانی هەینی لە گوندی «قۆرغان» بوو. ڕاوگەمان داوێنی «ئاڵمەڵوو»

و تیرە شانی «سوڵتان» بوو. داخوا جانتای بیرەوەریت لەو ڕواڵەت و دیمەنانە هیچی تێدا ماوە؟ یان وەکوو کانییە درۆزنەی ڕۆژگاری من هەڵچۆڕاوە؟ ئەمن نەگۆڕاوم و نەدۆڕاوم، ئەوەی گۆڕابێ، هەرێمە، هەردە، وڵاتە، ویشکەڕۆیە، تاپۆیە، سوورەقاتە. گودێری خۆم هەر بۆخۆمم، بڵقی کەمخایەنی نێو چۆم و گۆمم، ون دەبم و هەڵدەدەمەوە، ئەشکەوتەکۆنم، دەنگ دەدەمەوە.

ئەم پرتە و بۆڵە و بناشت و دەونەئاشە، دەڕوانێتە ئەم ساڵانەی کە ئێستا (هێدی) لە هەولێر گێرە دەگێڕێ و «نووری» بە بێ هەو، لێرەی دەگێڕێ.

لە مانگی سەرماوەزی ساڵی ١٣٢٣ کە ماڵم هاتە گوندی شێخاڵی، وێڕای دەرسگوتن بە کوڕەکانی حاجی ئاغا حیسامی، جارجار سەفەری مەهابادم دەکرد. هاواڵ و هاوڕازەکانم دەدی و حاڵ و هەوای شار و وڵاتم لێ حاڵی دەبوو و لە دێشدا چون چێش و چێژی لاویمان لەگەڵ (شێواو) یەکتریان دەگرتەوە، دەدواین و دەلواین.

لە بیرم ماوە یەکەمین هۆنراوەی کاک خالید (شێواو) کە بۆی خوێندمەوە:

«چاوەکانم بەسیە غوربەت بێرەوە» بوو کە لە دووری براگەورەکەی خۆی، کاک «حەسەن» هۆنیبوویەوە. کاک حەسەن کە لە دوایە بوو بە دوکتور، لەگەڵ دەستەیەک لە لاوەکانی مەهابادی، بۆ درێژەدان بە خوێندن، ناردبوویاننە «بادکووبە» و پەژارەی ئەم دوورییە، کاری کردبووە سەر هەست و ئیحساساتی هێدی و زۆر بە تاسە و سۆزەوە بۆی دەخوێندمەوە. ئەمنیش هۆنراوەی «یا وەتەن یا مردنم» هۆنیبۆوە و لە دوایە لەگەڵ هۆنراوەکانی دیکەم بۆ ڕۆژنامەی «نیشتمان» و «کوردستان» و «گەلاوێژ» و... دەناردن و چاپ دەکران کە لە ساڵەکانی ١٣٢٤ و ١٣٢٥، زیاتر لە ڕۆژنامەی «کوردستان»دا بڵاو دەکرانەوە کە زۆریان بێسەروشوێن چوون و لێم ون بوون.

لەم دواییانەدا «مەحموود زامدار»، سەر بە کۆگای ڕووناکبیری ئێراق، لە ڕۆژنامەی «کوردستان»ی ساڵی ١٣٢٤ و ١٣٢٥، کتێبێکی بە ناوی «شێعر و بەرهەڵستی و ڕاچەنین لە کوردستانی ئێراندا» چاپ کردبوو کە لەو نووسراوەدا چوار بەستە و هۆنراوەی من، هۆنراوەیەکی «هەژار» و هۆنراوەیەکی «هێمن»ی تێدابوو. چون ئەو هۆنراوانەم نەمابوون، وەک چوار خەزێنەم دیبێتەوە،

وەرمگرتنەوە و لەگەڵ هێندێک هۆنراوەی دیکە نووسیمەوە، بەڵان بەداخەوە هیچی دیکەم نەدیتنەوە.

## هەوایەکی تازە و نەوایەکی نوێ

بەهاری ساڵی ١٣٢٥ لە چاو ساڵەکانی دیکە، لە ناوچەدا هەوا و نەوایەکی دیکەی هەبوو. ئەگەرچی کۆمەڵە بەڕواڵەت نەمابوو، بەڵام حیزبی دێموکراتی کوردستان بە ڕێبەرایەتی پێشەوای مەزن، نەوای ئازادی و سەربەستی هاویشتبووە دڵ و دەروونی پیر و لاو و ژن و پیاوی دانیشتووانی کوردستانەوە. ڕۆژنامە و گۆواری کوردی، ڕۆژانە و حەوتووانە و مانگانە بڵاو دەکرانەوە. چاو و دڵ و زەینی نووسەران و هۆنەران و شاعیرە لاوەکانی وڵاتی ڕوون دەکردەوە و وە گڕوگاڵی خستبوون.

ڕۆژانە چاوەڕێ بووم کێ لە شار دێتەوە، گۆوار و ڕۆژنامەم بۆ بێنێتەوە. کاتێک هۆنراوەکانی میللی و نەتەوەیی «هەژار» و «هێمن»م لە واندا دەدی، هەستوخوستی نەتەوەویستی لە گیان و ژیانمدا هەڵدەبوو و وەک چرایەک لە زەینمدا گڕیان دەگرت و داییسان. پۆلی جەوان و لاوەکان زیاتر ڕچە و ڕەوشتی ئەو دوو هۆنەرە نەمرەیان ڕەچاو دەکرد. بەداخەوە ناتوانم بیرەوەری و پێشهاتەکانی خۆم بە وردی و هەرکامیان لە کات و ساتی خۆیاندا لێک بدەمەوە و لە دەقی خۆیاندا بیانهاوێمە جێگا و کات و ساتی خۆیان. ئەوانەی دێنە زەینم وەک خەونی هاڵۆز زیتە و زریوەیان لە ئاسمانی خەیاڵمدا دەدرەوشێنەوە، بە بێ ئەوەی حیسابی ڕۆژ و مانگ و ساڵیان لەسەر بکەم یان دەقی ڕۆژەکانیان بۆ دیاری بکەم، پێیان ڕادەگەم.

## بۆ ڕایەڵوپۆی بەسەرهاتم وا تێکەڵ بوو؟

هەڵکەوتی زەمان و پێشهاتی ژیان، وایان دەستی ناتەبایی دابوو بە یەک، کە بەرهەمی ژیان و سیپارەی هۆنراوە و هەڵبەست و بیرەوەری ڕۆژانەم، لە پاییزی ساڵی ١٣٢٨، لە گوندی «عەنبار»، لە تەندوور خران و سووتان، هەرچەند بەسەرهاتی ژیان و دەقەکانیم وەک ئەستێرەی گەش، لە تاریکەشەوی ژیاندا هەر دیارن، ماون و دەدرەوشێنەوە، بەڵان کات و ساتەکانیان لە

تەپومژی ڕۆژگاری چەوت و چەوێڵدا، هێندەیان جێگۆڕکە پێکراوە کە ناتوانن ڕۆژی بوون و مانگی نەمانی خۆیان وەبیر بێنەوە و دیاری بکەن.

## ساڵەکانی هیوا و هومێد

ساڵەکانی ١٣٢٤ و ١٣٢٥ بۆ من و هاوڕاز و هاوبازەکان، دنیای هومێد و هیوا و ئاوات بوو. بە هۆی هورووژمی دەوڵەتانی هاوپەیمان، حکوومەتی شیرازەپساوی ناوەندی لە ئێراندا، مەودای هۆمەن و بەربەرەکانی لەگەڵ ویست و خواستی نەتەوەی کورد و ترکی ئازەربایجانی لە توانادا نەبوو. فیرقەی دێموکراتی تەورێز و حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، ئازادی و سەربەخۆیی‌یان ڕاگەیاندبوو. دیارە لە حاڵوهەوایەکی ئاوادا، هۆنەران و نووسەران و ڕووناکبیرانی نەتەوەی کورد، پێ‌بەپێی پێشەوای مەزنی خۆی «قازی محەممەد»، ئەرکی سەر شانی خۆیان لە پێشگای گەل و نیشتماندا بەجێ دێنا و ئەوەی دەبوو بیڵێن، بینووسن و ڕایبگەیەنن، ڕایاندەپەڕاند و خۆیان لێ‌کلا نەدەکرد.

کاتێک دەوڵەتانی داگیرکاری ئەمریکا و ئینگلیس ئێرانیان چۆل کرد و ڕۆیشتن، شووڕەویش چەند مانگ پاش ئەوان ئازەربایجان و کوردستانی خۆکردی خۆی بەڕەڵڵا کرد و هەڵیڕشتن و ئاوڕی وەسەر نەدانەوە. دەوڵەتی ناوەندیش بە هەموو هێز و توانای خۆیەوە، شالاوی هێنابووە سەر ئازەربایجان و کوردستان. دیار بوو کە دەوڵەتەکانی ئەمریکا و ئینگلیس لە ئاکاری حکوومەتی ئێران سەبارەت بە سەرکوتانەوەی کورد و ترکەکان، ناڕازی نەبوون. چونکە نەیاندەویست لینگە پۆتینی ڕووسەکان لە ئازەربایجان و کوردستاندا بەجێ‌بمێنێ و شوێنەواری بەجێماو بکرێتە بارمتەی پاشەڕۆژیان.

بۆ شووڕەویش گرینگ نەبوو کە لە خۆیان وریاتر ئەوانەن کە سێحر و ئەفسوونەکانی وانی بێ بایەخ و پووچەڵ کردەوە. تەواریشەکان، یۆڵداش و قارداشە ترکەکانیان وەبن هەنگڵی خۆیان دان و حەشاریان دان. گەلی بەشخوراوی کوردیشیان بە خەتاکاری و تاوانباری نارده سەحرای مەحشەری پێی حیساب‌وکیتابی بێ‌حیسابەکان و کەفارەت و غەرامەتی فێڵ و فریو و دەلەسە و وەعدەی بەتاڵی تەواریشەکان، دەبوو نەتەوەی کورد بیدا، وەکوو شانی

وەبەر دا و لە پێی ڕۆژگاری ڕەشی خۆیدا دەستەوئەژنۆ داینیشاند. بەداخەوە زۆر لە ڕووناکبیرانی کورد و هۆنەرە دڵسۆز و نەتەوەیییەکانمان وەک «هەژار» و «هێمن» پێیان وابوو «ئەستالین پێشەوایە بۆ کوردان وەک باب وایە.» ئەوان ئاشقی سەروسمێڵی ئەستالین نەبوون، ئەوەی خواست و ویستی هۆنەرەکان و ڕووناکبیران بوو، لە جانتای وان دەهاتەدەرێ و لە گوفتولفتی وان دەهاتە سەرێ، دەنا دەکرا بڵێن: «ئەستالین پێشەی وایە، ئاشقی نەوت و تەلایە، بۆ نەوتە ئەم هەرایە، بۆ کوردستان بەلایە.»

لە نێوەڕاست مانگی ۱۳۲۵ هەتا سەرەتای مانگی زستانی ئەو ساڵە و هەتا گرتنەوەی شاری مەهاباد، حاڵەتێکی دڵتەزێن و پەرێشان لە سەروسیمای وڵات هاڵابوو، چاو دەگەڕا بزانێ کێ لە کوێیە؟ گوێ هەستی ڕادەگرت بزانێ کێ خەبەرێکی پێیە، دوژمن لە کوێڕا سەری لە سۆیە.

## هێزی حکوومەت دەیەویست لە شاری سەقزەوە

## هەڵمەت بێنێ بۆ مەهاباد

هێزی دەوڵەت بە فەرماندەری «سەرتیپ هومایوونی» کە خزابوونە سەقزەوە، دەیانهەویست شالاوێکی بەربلاو لە چەند لاوە بەڕێوە بەرن. بۆ گرتنەوەی شاری مەهاباد، فەندوفێڵی نیزامیگەری خۆی مانۆڕ دەدا، لە لایەکی ترەوە بۆ ئەوەی کوشتار و تاڵانوبڕۆی هەلخوازەکان لە ناوچەدا ڕوو نەدا، پێشەوا «قازی محەممەدی نەمر» لایەنی وتووێژی لەگەڵ ئەرتەشی دەسکراو چاوەدێری دەکرد و بایەخی دەدایە.

## حاجی حەمەدئاغای حیسامی و هەژار، نوێنەرانی پێشەوا

بەپێی ئەو بیر و باوەڕە، پێشەوا لە شێخاڵی «حاجی حەمەدئاغای حیسامی» و «هەژار»ی هۆنەری نەتەوەیی بە نوێنەرایەتی خۆی نارده شاری سەقز، هەتا لە بارودۆخی هاتنەوەی ئەرتەش بۆ مەهاباد و چلۆنایەتی کاری داهاتوو، لەگەڵ «سەرتیپ هومایوونی» وتووێژ و بەرنامەڕێژی بکەن. ئەرتەش کە دەیەویست لە پێشدا زەبروزەنگی خۆی نیشان بدا هەتا هێزی پێشمەرگە و چەکدارەکانی مەڵبەند چاوترسێن بکا، بێ هیچ وتووێژێک لەگەڵ ئەم

نوێنەرانــە، هومــایوونی لــەرێوە فــەرمانی گــرتن و زینــدانی کــردنی حــاجی حەمەدئاغا و هەژار دەردەکا و هەردووکیان دەگیرێن.

## سەدرولئیسلام و قەواموسسەلتەنە

ئەو هەلکەوتە لە سەروبەندێکی‌دا ڕوودەدا کە ئاغای «سەدرولئیسلام» بـرای پێـشەوا و نوێنــەری مــەهاباد لــە مەجلیــسی وەخــت، لــە تــاران لەگــەڵ سەرۆکوەزیری وەخت «قەواموسسەلتەنە» وتووێژیان دەبێ کـە ئەرتـەش بـێ هەرا و هەڵلا مەهاباد بگرێتەوە و پێشەواش فەرمان بدا پێشمەرگە و چەکدارەکان دەس نەکەنەوە و لەگەڵ هێزی دەوڵەت بسازێن.

بەو قەراروبڕەوە سەدرولئیسلام بۆ دیتنی سەرتیپ هومایوونی دەچێتە شاری سەقز و بەرهەمی وتووێژ و قەراروبڕی خۆیان لەگەڵ سەرۆکوەزیر بۆ سەرتیپ هومایوونی شی‌دەکاتەوە و دەڵێ: «دەکرێ لە پێش بزووتنی سپا بۆ مەهاباد، لە بۆکان یان دەوروبەر، لەگەڵ جەنابی قازی محەممەدیش دیدار بکەی؟» سـەرتیپ هومایوونی ئەو پێشنیار و بەرنامەی پڕ بە دڵ دەبێ و دەڵێ: «دوو کەس نوێنەری جەنابی قازی هاتبوون بۆ وتووێژ لەگەڵ من، ئەمنیش فەرمانم دا هــەردووکیان زیندانی بکەن، ئێستا کە ئیشەکە هاتۆتــە ئــەم ڕادەیــە، ئەوانــە ئــازاد دەکــەم بڕۆنەوە بۆ مەهاباد.»

کاتێــک دوو نوێنــەرەکان دێــنن، دیــارە سەدرولئیــسلام دەیانناســێ و بــە خۆشحاڵییەوە داوای لێبووردنیان لێدەکا. حــاجی حەمــەدئاغا دەگەڕێتــەوە بـۆ شێخاڵێ و کاک هەژاریش وەک بۆخۆی دەڵێ، دێتەوە بۆکــان و شـێخلەر و لــە وێڕا تێیدەتەقێنێ بۆ ئێراق. هەر ئەو هەڵاتنە بوو هەتا ڕۆژەکانی دوایی، هەژار هەر هەژاری دووره وڵات بوو، چاو لە ڕۆژگاری نەجات بوو.

## هەڵکەوتێکی دیکەی جێگای سەرنج

پێش هاتنەوەی حاجی حەمەدئاغا بۆ شێخاڵێ، پێـشەوا «قــازی محەممــەد» خەبەری نارد کە «سمایل‌ئاغای حیسامی» کوڕی گـەورەی حــاجی حەمــەدئاغا، بێتە مەهاباد بۆ لای پێشەوا. بۆیەشی بوو کە لە بــارەی گـرتنی حــاجی‌ئاغــا و هەژار، بینێریتە سەقز بۆ لای ئەو ئاغــاوات و ســەرعێلانە کــە سەروســاختیان

لەگەڵ سەرتیپ هومایوونی هەیە، تا بەڵکوو بە هۆی ئەوان بکرێ ئەو دوو نوێنەرانە ڕزگار بکرێن و بگەڕێنەوە.

سمایلئاغا بە گەیشتنی هەواڵەکە، بە سێ کەس لە پیاوەکانی خۆی گوت: «بڕۆن ئەسپان زینکەن و بە سواری وەرن هەتا بچینە مەهاباد.» لە دوایە ڕووی لە من کرد و گوتی: «میرزا پێم خۆشە ئەتۆش لەگەڵم بێی بۆ لای پێشەوا.» ئەمنیش لاوێکی هەژدە و نۆزدە ساڵە، سوارێکی توندوتۆڵ و ئەسپچاک و شایی بەخۆ وەک کاک خالید (شێواوی ئەوکات) قیتوقۆز، بەڵان هێندی ئەو دڵتەڕ نەبووم. بووینە پێنج سوار و بەرەو مەهاباد وەڕێکەوتین. پێدەشت و مەزرا و مووچەی گوندی «قەمتەرە»مان پێوا و گەیشتینە بەر بستوو و بانووی «قەرەبلاغ». دیتمان ماشێنێکی سواری بەدوومانەوەیە. دیار بوو لە بۆکانیڕا هاتووە و دەیهەوێ بە ڕێی «بورهان»دا بچێتە مەهاباد. ئێمە لاڕێ بووین هەتا ماشێنەکە ڕێی بێتەوە بڕوا، کە ماشێنەکە نیزیک بۆوە دیتمان سەرهەنگێکی ئەرتەشە و کۆتوشەڵوارپۆشێکیشی لەگەڵە. ماشێنەکە ڕایگرت و کابرای کۆتوشەڵواریش داپەزی. سمایلئاغا گوتی: «ئایئای میرزا خۆ ئەوە سەدرولئیسلامە ئێمەی ناسیوە، با دابەزین.» دیار بوو سەدرولئیسلام لە ماشێنەکەدا سمایلئاغای ناسیبوو و بە سەرهەنگی گوتبوو ئەو سوارە چەکدارانە خۆیین و لە خزمانی خۆمانن. جڵەوی ئەسپەکانمان لە قۆڵی خست و چووینە پێشێ. سەدرولئیسلام هاتە پێشێ و یەکتری لەگەڵ هەموان ماچ کرد و پاشان گوتی:ئەوە جەناب «سەرهەنگ فیووزی»یە و بە نوێنەرایەتی سەرتیپ هومایوونی لەگەڵ من هاتووە پێکەوە بچینە لای جەنابی قازی» و درێژەی دا: «ئەمن دوێنێ لە تاران بە فەرموودەی جەنابی سەرۆکوەزیر «قەواموسسەلتەنە» هاتوومە سەقز و تیمسارم دیوە و ڕاسپاردە و وتوویژی جەنابی قەوامم پێڕاگەیاندووە، ڕەنگە لەگەڵ جەنابی سەرهەنگ بتوانین جەنابی قازی بێنینە سەر ئەو مەسڵەحەتە کە لە بۆکان، یان دێی «حەمامیان» لەگەڵ تیمسار دیدار بکەن و چلۆنیەتی هاتنەوەی ئەرتەش بۆ مەهاباد تێبینی و ڕێبینی بکەن، ئینشائەڵڵا.» لە پاشان گوتی: «لە بیرم نەبوو بڵێم، حاجی ئاغا و هەژاریشم دیت کە دەبێ ئەوڕۆ بگەڕێنەوە.» لە دواییدا سەرهەنگ و سەدرولئیسلام چوونە

پێش سوارەکان و یەک‌یەک دەستیان لە دەستی نان و پاش خوداحافیزییەکی گەرم، سواری ماشێنەکەیان بوون و ڕۆیین بەرەو مەهاباد. کاتێک ئەوان ڕۆیشتن سمایل‌ئاغا کوتی: «میرزا پێم وایە چاکە ئەتۆ لەگەڵ «عەولاسوور» بگەڕێیەوە بۆ شێخاڵی، بە گوتەی ئاغای سەدر، ئەورۆ حاجی ئاغا دەبێ گەڕابێتەوە شێخاڵی، ئەگەر هاتبۆوە، ئەتۆ ئەو باس‌وخواسانەی کە بیستت بۆی بگێڕەوە. ئەمنیش پێویست ناکا بچمە مەهاباد، دیارە ئاغای سەدر هەواڵی ئازادبوونی حاجی ئاغا و هەژار، بۆ جەنابی قازی دەگێڕێتەوە و چوونی من بۆ سەقز پێویست نیە. ئەوشۆ لە دۆستاڵی دەبم و سبەینێ بۆخۆشم دەگەڕێمەوە.»

## بنەماڵەی «قازی» و «حیسامی» چی یەکتر بوون؟

لێرەدا بەپێویستی دەزانم، چلۆنیەتی هۆی نیزیکی و تێکەڵی خانەوادەی حیسامی و بنەماڵەی تایفەی قازی بۆ خوێنەران ڕوون بکەمەوە:

تێکەڵی ئەو دوو بنەماڵەیە لە بەرێ‌ڕایە نەک پشتێ. کچی خودالێخۆشبوو «سەیفولقوزات»، یانی خوشکی «حەمەحوسێن‌خانی سەیفی قازی»، بووکی حاجی حەمەدئاغا، یانی ژنی «ئەحمەد»ی کوڕی حاجی حەمەدئاغا بوو. ئەو تێکەڵاوییە ببوو بە هۆی ئەوەی کە پێشەوا قازی محەممەد، لە نێو عەشیرەتەکانی مەڵبەندی موکریان‌دا، متمانەی زیاتری بە حاجی حەمەدئاغا و بنەماڵەی حیسامی بوو و هەر بەو بیر و باوەڕەش بوو کە پێشەوا لە وەختێکی وا گرینگ‌دا، حاجی حەمەدئاغا و دوایین کەسی جێی باوەڕی خۆی، یانی هەژار، بە نوێنەری ناردنییە لای سەرتیپ هومایوونی لە شاری سەقز.

دوای خوداحافیزی لە سمایل‌ئاغا، کاتێک گەیشتمەوە شێخاڵی، لای ڕۆژئاوایە بوو و حاجی ئاغا هاتبۆوە. لەگەڵ دابەزیم، چوومە لای و دوای بەخێرهێنانەوەی، چلۆنیەتی سەفەرەکە و دیتنی سەدرولئیسلام و سەرهەنگ فیووزی و باقی ڕووداوەکانم بۆ گێڕاوە. حاجی ئاغا بە سپاسەوە کوتی: «هۆی نەجاتی من و هەژار، سەدرولئیسلام بوو کە لەو جەنگەی‌دا هاتبوو بۆ سەقز.» بڕێکی باسی خۆی و هەژار کرد و کوتی: «دوای ئازادبوونمان ـ بە پێکەنینەوە ـ هەژار وا کوڕەگوێ بوو، نەمزانی بە کوێ‌دا هەڵات، پێموایە بە یەکجاری خۆی نەجات دابێ.»

ئەی داد و بێداد، هەژار کوڕی نیشتمان بوو کە ئاوا کوڕڕەگوێ دەبێ! هەر هەژار نیە، هاوڕاز و هاوبازەکانی لە هەرێمدا سەرلێشێواوتر و هێلانەڕووخاوترن! دەکرا وەکوو هێندێکان کوڕی هەل و کات بێ و کەواکەی ئاوەژوو کاتەوە و بڵێ بۆخۆم نیم!؟ بەڵان کوڕەکانی نیشتمان، لە سەربانی مزگەوتێ بانگی کوردایەتییان لێداوە! چۆن بڵێم خۆم بۆخۆم نیم؟ ئەدی «یان وەتەن یان مردنم»ی چ لێبکەم؟ «شەرتە تێیهەڵدمم لە تاجت»، بە ملی کێیدا بسەپێنم؟ هەژار چۆن بازرە نەبێ؟! ڕاستە جەوان و دنیانەدیتوو و بێئەزموون بووم، بەڵان بە پێداچوونەوە و بەرجەوەندی ڕابردووی دووردرێژی نەتەوەی کورد، لێکمداوە کە: لە هەموو هەل و هەڵکەوتی زەماندا، هەر بۆخۆی تەورداسی پەل و چۆک و ئەژنۆی خۆیەتی، هەر بەروبۆی ئەو خوو و خەسڵەتی خۆیەتی و لە ژیانیدا دووپات دەبێتەوە! بەری بێگانەپەرەستی، خواری و سستییە. دیتمان داژدار و پشتیوانی بێپشتیوانەمان، یانی دەوڵەتی شووڕەوی بێشەرم و بێشوورەیی، کوردستانی کردە بارمتەی سات و سەودای نەوت و تەڵا و قازانجی خۆی.

کاتێک بۆخۆیان سەودایان سەری گرت، تەواریش (ئاوال) کوتی: «هەڵگرن هەمبانەتان، سەودامان نابێ.» لەو سەروبەندەدا لە گوندی شێخاڵی، ڕۆژانە دەبوو کەسانێکی بنێرینە بۆکان و مەهاباد کە هەستوخوستی وڵاتمان لێ حاڵی بێ. دەتوانم بڵێم تاڵوتوونترین ڕۆژگاری تەسک و تیواری ژیانم ئەو سەروبەندە بوو کە دەمدی دیمەنی دڵاوای دوێنێ، ئەو بنار و دیارەی کە پێم هەڵدەگوت و دەملاواندەوە، بە بوولەرزەی شاڵاوی شەڕفرۆشان، بە باس و خەبەری هەواڵتاشان، بە زیقەوفیقەی زوڕناچییانێکی کە بە هەوای ڕۆژ، بە سەری گوشادیدا لێیاندەدا و تێیاندەتووڕاند، مەڵبەندیان کردبووە زەل و باتلاغێک کە مێشوولە بۆ نێو زەلەقاوی خۆی دەکێشێ و دەیقۆزێتەوە. جا چ بوو بەرەگە تەنگە، دنیا ڕەنگاوڕەنگە، هەژار هەڵاتووە و هێمن خۆی حەشار داوە، ڕۆژنامە و پەڕتووکەکان، وەک پەڕپووتەی نێو شەتاوان، سەریان لە حەشارگەی گۆمیلکاندا باشار داوە!

بەڵان شا بە هەموو تۆپ و تەشەرێوە، ئەرتەش بە هێز و حەشەرێوە، ناتوانێ ئەو بیروڕایە و ئەو دەنگ و هەرایەی کۆمەڵەی (ژ.ک) و حیزبی

دێموکراتی کوردستان کە بە ڕێنوێنی پێشەوای دڵسۆزی خۆی شوورەی کێشراوە، بناغەی دامەزراوە، بیکووژێنێتەوە و کوێری بکاتەوە. ڕێبەرە فیداکارەکان گیانیان بەخشی و کردیانە خەڵات، ژیانیان ژیاندەوە و دایان بە وڵات. «هەژار» نامرێ، «هێمن» نافەوتێ، «ئاوات» شل نابێ، «شێواو» و «عەتری» کول نابن، کوا فەوتان و مەرگ بۆ ئەوانەیە کە «لە دڵی میللەتا دەژین».هەراوهوریا لە دێهاتان گەڕا، کوتیان ئەرتەشی دەوڵەت بە هاوکاری هێندێک عێل و عەشیرە مەهابادیان گرتۆتەوە! کوتیان مەهابادی پێشوازییان لێنەکردوون! کوتیان سەرتیپ هومایوونی هەموو ڕۆژێ دەچێتە ماڵە پێشەوا و کوتیان دەوڵەت حەمەحوسێنخانی کردۆتە فەرمانداری مەهاباد و سەدان کوتیانی سەرسووڕێنەری دیکە! بەڵێ شایی و شین، شۆڕ و شەپۆڕ، دیلان و دیلان پێکەوە دەگیران.

## ئەمن و دوایین دیداری پێشەوای مەزن لە مەهاباد

دوو ڕۆژ یان سێ ڕۆژ بوو کە هێزی دەوڵەتی هاتبوونەوە شاری مەهاباد. حاجی ئاغا حیسامی لە دڵەڕاوکە و نیگەرانیدا بوو، لەبەر خۆی دەترسا و لە داهاتووی من و کاک خالیدی کوڕی و متمانەی بە داهاتووی خۆی و ئێمە نەبوو. ناردی لەدووم و بردمییە لای خۆی دانیام و کوتی: «میرزا، ئەوە دووسێ ڕۆژە دەوڵەت مەهابادی گرتۆتەوە، ئێمە هیچ هەواڵێکمان لە شار و حاڵوباڵی پێشەوا و حەمەحوسێنخانی سەیفی قازی نیە، ئەوەی دەیڵێن و دەیگێڕنەوە، ڕاست و درۆی مەعلووم نیە. بەپێویستی دەزانم لەبەر ئەوەی داهاتووی خۆمان بزانین، سەفەرێک بکەی بۆ مەهاباد و هەر چۆنێک بێ دەبێ پێشەوا و حەمەحوسێنخان و حاجی بابەشێخی ببینی و لێیانبپرسی و ئەوزاع و ئەحواڵی داهاتوو چۆن دەبینن و چۆنی لێک دەدەنەوە. براله! ئەگەر زانیت و تێگەیشتی داهاتوو زۆر جێگای متمانە نیە، ئەوە ئەمن و ئەتۆ و خالید، بێ ڕاوەستان دەڕۆین بۆ ئەودیوی بۆ نێو «پشدەری»یان. براله! کایە بە داهاتوو ناکرێ، ئەمن بە نوێنەری پێشەوا بۆ سەقز، بۆ سەرتیپ هومایوونی ناسراوم، ئێوەش کە هۆنراوە و شێعرەکانتان لە ڕۆژنامەکاندا نووسراوە، بۆ دەزگای دەوڵەتی نەناسراو نین.»

ئەگەرچی بۆخۆم پێم وابوو لەم حاڵوباڵەدا هیچ شتێکی دەوڵەت لە مەهاباددا جێی متمانە نیە، چلۆنیەتی شار لەو ڕۆژانەدا بەرزەخێکە لە نێوان ڕابردوو و حاڵدا، دەوڵەت ئەوەی بە پێویستی بزانێ دەبێ لە کاری بکا، جارێ هەرچی لە جانتای خۆیدایە دەیهێڵێتەوە و ئاشکرای ناکا ناداتێ هەتا بە چاکی بنج و بناغەی خۆی دادەکوتێ.

بەڵان لەو بارەوە کە بۆخۆم ئاواتی دیداری پێشەوام زۆر بوو کە چلۆنیەتی کات و داهاتووی خۆم و هاوڕازەکانی لێبپرسم و ڕێنوێنی ئەو ڕچە و بازگەی کە لە پێشمانە و دەبێ بیپێوین و پێیدا بڕۆین، کەلکی لێوەرگرم و بیکەمە تۆشەی ژیانی نیشتمانیم، پێشنیاری حاجی حەمەدئاغا پڕ بە پێستی ئاوات و ئارەزووم بوو. بێ ڕاوەستان ئەسپم زین کرد و بەرەو مەهاباد وەڕێکەوتم. ئەسپێکی توندوتۆڵم لە بن ڕکێفیدا بوو، لەو یەکدوو ساڵەدا هێندم هاتوچۆی مەهاباد کردبوو، هەموو پێدەشت و بەربنار و بستووی ڕێگام بستبەبست پێوابوو و دەمزانی چەند لاخڕ و دۆڵ و بازگەم لە پێشدایە. لەو پاییزە درەنگ وەختەدا هێشتا بەفر نەباریبوو. لە کاتی سواربوونم دەستی بە کرێوە و بەفربارین کرد، بەڵان بە هەوایەکی نەرم و لەسەرەخۆ، کلووی گەورە زۆرخۆش دادەوەرین و بێژینگی ئاسمان چاکی دادەتەقاند. گەیشتمە داوێنی بستووی «قەرەبلاغ»، دەستەوناو وەسەردەکەوتم. لە کەلێنی کلووە بەفراندا دیتم پێنج سوار لە بستووی قەرەبلاغڕا دێنە خوارێ، کەمێک نیزیک بوومەوە لێم حاڵی بوو هەر پێنج سوارەکە بە کورتانێ سوار ببوون و لاقیان لە تەنیشتی چارەوییەکان دەلەقاند. لێم حاڵی بوو چارەوییەکانی «مەنافی چارەویدار»ە. مەناف چارەویدارێک بوو کە گەنم و جۆ و ئاردی دێهاتییەکانی بە کرێ دەبرد بۆ شاری و چاکم دەناسی. سوارەکەی پێشێ سەرکلاوی لە سەر و زەنگاڵی لە پێ و تۆندوتۆڵ بوو، پێم وابوو مەنافە. بانگم کرد: مەناف! سواری پێشێ جوابی داوە و کوتی: چارەوییەکان ئی کاک مەنافن، بەڵان بۆخۆم مەناف نیم.

گەیشتینە نیزیک یەک. لە نێو سوارەکاندا مەناف هاتە پێشێ، کە ناسیمی کوتی: ئەوانە ئاغایانی گەورکن، هەتا گوندی «حەمامیان» بەکرێیان گرتووم. کوتم: ئاغایان ئەمنیش گەورکم، ئەدی بۆ ناتانناسم؟ سوارەکەی پێشێ کوتی: ئەتۆ گەورکی کام محاڵی گەورکانی؟ کوتم: ئەمن محەممەدی نووری کوڕی میرزا

ئەبووبەکری گلۆلانی خوارێم و ئێستا ماڵم لە دێی «شێخالّی»یە. کە وام گوت، سواری پێشێ دەستی لە سەر چاوی دانا و کوتی، ئەیوای دنیای بێوەفا، کاکە میرزا ڕەنگە بۆخۆت نەزانی یان وەبیرت نەیە کە میرزا ئەبووبەکری بابی تۆ، ڕدێنسپی و کەیخودای گەورکایەتی بەشی مەهاباد و سەقز و کەلّۆی بوو. کاکە میرزا، ئەمن «عەلیئاغا»ی گەورکی سەقزم، «عەلی جەوانمەردی»، خاوەنی دێهاتی «قەرەچەل» و «تەمووتە»م و ئەوەش «ڕەسووڵئاغا»ی «میرەدێ»یە و برامە، لەو سەروبەندەدا کە هێزی حکوومەتی شالاوی پەیتاپەیتای بۆ شاری سەقز و دەوروبەری دەهێنا، من و ڕەسووڵئاغای برام، خۆمان بوارد و هاتینە مەهاباد کە بۆ ئێمە لە پەنای پێشەوادا جێگەی پەسیو و حەسانەوە بوو، بەلّان ئێستا کە هێزی حکوومەت مەهابادیشی گرتۆتەوە، دەمانهەوێ بچینەوە دۆلّی سەقز و مەلّبەندی خۆمان تا بزانین دەولّەت چۆن دەبزوێتەوە و چمان لەگەلّ دەکا. ئەدی ئەتۆ بەو کڕێوە و باکوتە بۆ کوێ دەچی؟ لە ولّامدا کوتم: عەلیئاغا ئەمنیش وەدووی خەبەران کەوتووم، دەمەوێ بچمە مەهاباد بزانم باس و هەواڵ چیە. عەلیئاغا کوتی: دەولّەت ئێستا هیچی نەکردووە و لەو چەند ڕۆژەدا کە مەهاباد گیراوەتەوە دەلّێن سەرتیپ هومایوونی زیاتر بۆ نەهار دەچێتە مالّی پێشەوا. لەمێژ بوو ڕاوەستابووین، دەمهەویست ئەسپەکەی خۆمی بدەمێ سواری بێ هەتا دەگاتە گوندی حەمامیان. لەو دەمەیدا بارگینی عەلیئاغا پشتی کردەوە و جووتەیەکی هاویشت و لە ڕانی ئەسپەکەی منی دا و بریندار کرد. عەلیئاغا جلّەوی ئەسپەکەی کێشا و ڕامی کردەوە و کوتی: کاکە حەمە فایدەی نیە، گلۆلەمان کەوتۆتە لێژێ، پێشهاتەکەشمان خاسی ناوێژێ. هەلّکەوتی ڕۆژگارمان بەرەو شەوگاری ڕەشە، با لەوەی زیاتر یەکتر مەحتەل نەکەین، خواحافیزی هەموومان بێ.

بەلّێ، عەلیئاغا و ڕەسووڵئاغای برای بەرەو چارەنووسی خۆیان ڕۆیشتن. لە دوای چوونەوەیان هێندەیان پێناچێ، دەولّەت دەیانگرێ و دوای ماوەیەک هەردووکیان ئیعدام دەکا. ئەمنیش کاتێک ئەو دوو ڕێبوارەی ڕێگای شەهادەتم بەجێهێشت، بە شەلەشەلی ئەسپی بریندار خۆم گەیاندە دێی «دۆستالّی» مالّە «محێدینئاغای تاجرباشی» کە زاوای حاجی حەمەدئاغای حیسامی و کوڕەکوردێکی بەشەرەف و ئابڕوو بوو. سبەینێ کە هەستام، بەفر و کڕێوە

خۆشی کردبووه و کاڵەپێیەک بەفر باریبوو. بە ئەسپی محێدینئاغا چوومە مەهاباد. لە کاروانسەرایەک دابەزیم و لە پاشان بەرەو چوارڕێی ئازادی ئێستا وەڕێکەوتم. دەمزانی مزڵی «حاجی بابەشێخ» لە لای مزگەوتی «هەباساغا»یە.

## هەڵکەوتی دیداری «حاجی بابەشێخ»

بەفری خەیابان شکابوو، یەکیەک و دوودوو دەمدی سەرباز دەهاتن و دەڕۆیین. گەیشتمە خوار مزگەوتی هەباساغا، دیتم «حاجی بابەشێخ» سێ کەسی لەگەڵ بوو و دەهاتە خوارێ. کەسەکان یەکیان «حاجی داودی» و یەکیان «ئەحمەدی ئیلاهی» و ئەوی دیکەشیان وام لەبیرە «میرزا خەلیلی خوسرەوی» بوو. حاجی بابەشێخ قسەی بۆ دەکردن و دەستەکانی هەڵدێنا و دایدێناوە و لێکی دەدان. زۆرم پێخۆش بوو بێ دەردەسەر و پرسیارپرسیار، تووشی یەک لە سێیان بووم. نیشانی ڕێبواری و زستانپێویم دیار بوو، یانی چەکمە و سەرکڵاو و دەسکێش. ڕاست چوومە پێش و سەلاموعەلەیک و عەلەیکەسەلام. دوای دەس ماچ کردن و بەخێر بێی، کوتم: قوربان ئەمن محەممەدی عەتری گڵۆلانیم، لە گوندی شێخاڵیڕا هاتووم. حاجی حەمەدئاغای حیسامی سەلامی دەگەیاندی و دەیگوت. نەیهێشت پەیامەکەم ڕاگەیەنم و کوتی: «لەوەی کە حاجی ئاغا و هەژار لە سەقزێ گیرابوون و هاتوونەوە زۆر خۆشحاڵم. دەزانم لە داهاتووی خۆی و ئێمە نیگەرانە. ڕەنگە ئەتۆش گڵۆلانی هەر لە دڵەڕاوکەدا بی. کاک میرزا بۆخۆت ناسراوی منی، خودالێخۆشبوو میرزا ئەبووبەکری بابیشت لە گەورکایەتیدا، لە یاران و دۆستانی هەرە نیزیکی من بوو. کاکی خۆم، نە بۆ ئاغای حیسامی پیر و ڕدێنسپی، نە بۆ تۆی جوان و لاو و دنیانەدیتوو، هیچ باس و خواسێک دێتە پێشێ و نە بۆ کەسانێکی دیکە لەم ناوچەدا. ئەوجار تەماشایەکی هاوڕێکانی کرد و کوتی: ئاخر وا نیە؟. ئەوانیش تێکڕا کوتیان: بەڵێ وەک دەفەرمووی وایە. کوتم: قوربان تیپی لاوانت عەرز ناکەم، حاجی حەمەدئاغا لە گرتنی دوێنێی خۆی تەماشای دواڕۆژی نادیاری هەرێم دەکا، بۆی هەیە کە نیگەران بێ و پرسیار لە ڕێبەران بکا. فەرمووی: بابیلە گیان، کاتێک ئێران بە دەست دەوڵەتانی گەورەی دنیا داگیر کرا و هەر مەڵبەندەی لە ژێر چاوەدێری و دەسەڵاتی دەوڵەتێکی داگیرکاردا بوو و حکوومەتی مەرکەزیش هیچ دەسەڵاتێکی

لەو پایەگایانەی داگیرکاراندا نەمابوو، ئێمە هەرێمی خۆمان ڕاگرتووە و پارێزگاریمان کردووە. هەتا ڕۆژێکی حکوومەتی مەرکەزی هێز و مەودای هاتنەوەی هاتۆتەوە بەری، ئێمە بە باوەشی ئاواڵەوە بەرەوپیری چووین و وڵاتمان ڕەنگین و سەنگین، لە ئامێزی خستۆتەوە. ئیتر کامە تاوان؟ لە چی ترسان؟ ئەوە دەوڵەت ئاغای سەیفی قازی (حەمەحوسێن‌خان)ی کردۆتە فەرمانداری مەهاباد، کە دەزانم بۆخۆت دەچی و دەیبینی. ئەوە تیمسار هومایوونی هەموو نەهاران میوانی جەنابی قازییە، ئاخر وا نیە؟ حاجی ئاغا داودی و ئاغای ئیلاهی و خوسرەوی کوتیان بەڵێ وایە. پاشان کوتی: کاکە عەتری سەلامی حاجی ئاغای بگەیەنە و بڵێ فلانی دەیگوت هیچ نیگەران نەبێ و بە پێکەنینەوە کوتی: دەتوانی خزمەکەی خۆتان (حەمەحوسێن‌خان).کە فەرمانداری شارە، ببینی و لێی بپرسی. چوومە پێشێ و دەستیم ماچ کرد و لەگەڵ ئەوانی دیکەش ڕوویان ماچ کردم. دەمزانی هاوڕێکانی لە نێوان ترس و هومێد و باوەڕ و ناباوەڕی، گوێیان بۆ وتارەکانی حاجی بابەشێخ ڕاگرتبوو، خوداحافیزیم کرد و ڕۆیشتم. یەکدوو هەنگاو دوور کەوتبوومەوە کوتی: کوڕم عەتری، هێندێک لێرە بەرەو خوار، ناگاتە دەواخانەی «ساڵح‌زادە»، ڕاست جێگەی ئیدارەی ئاماری کۆن، ئەوێ فەرمانداریە و ئاغای سەیفی قازی لەوێیە.

## دیدار لەگەڵ «حەمەحوسێن‌خانی سەیفی قازی»

لە لای سەرووی دەواخانەی «ساڵح‌زادە»ی ئەوکات، لە سەر سووچی کووچە و خەیابان، ساختومانێکی چکۆلەی دوونهۆمی لێبوو کە لە پێشدا ئیدارەی ئاماری تێدا بوو. کاتێک کە ئەمن چووم و دیتم، کردبوویانە نیشتگەی «فەرمانداری» مەهاباد. لە پێج وخەمی چەند پلیکانی خواروخێچ وەسەر کەوتم بۆ نهۆمی دوو کە دیار بوو ئەو نهۆمە بریتی بوو لە داڵانێک و چەند هۆدەی لە نێو یەکدا. دەرکی هۆدەی پێشەوەم کردەوە و چوومە ژوورێ. دیتم پیاوێکی تەمەن‌گەڕاوە لە پشت میزێکی چکۆلە دانیشتبوو. سەلامم کرد و جوابی دامەوە و کوتم: جەنابی سەیفی قازی تەشریفیان هەیە؟ وڵامی داوە: بەڵێ، کەسی لە لا نیە. دەرکەی هۆدەکەی بە ئیشارەی قامکی پێشان دام. بێ ئەوەی بە پێویستی بزانێ ئیجازەم بۆ وەرگرێ، چوومە ژووری. فەرماندار (حەمەحوسێن‌خان)، لە

پشت میزێکی دانیشتبوو کە چەند سەندەڵی لە دەورەی داندرابوو. دەبێ بڵێم لە پێش ئەم دیدارەدا چەند جارێکی دیکەی دیبووم و دەیناسیم. سەلامووعەلێک و عەلەیکەسەلام. لەبەرم هەستا و چوومە پێشێ و بە دابی کوردەواری کە ڕەسمە دەستی گەورەکانیان ماچ دەکەن، دەستیم ماچ کرد و ئەویش ڕووی ماچ کردم و ئەحواڵی حاجی حەمەدئاغای حیسامی پرسی و خۆماڵییانە چاکوخۆشی کرد و کوتی: «ڕەنگە حاجی ئاغا بە گیرانی خۆی و هەژار لە شاری سەقز، زۆر کەشتەنگ و پەشێو بووبێ؟» کوتم بەڵێ ئێستاش زۆر پەرێشانە و لە ئەوزاع و ئەحواڵی ڕۆژ زۆر پەشێوە. دەیهەوێ بزانێ دنیای داهاتووتان چۆن دێتە بەر چاوان و پاشەڕۆژی وڵات و خەڵک و دەوڵەت چۆن بەراورد دەکەن؟

«حەمەحوسێنخان» پیاوێکی قەڵەو و شانومل و سینگ پتەو و ئەندامێکی ڕێککەوتوو وتێکسڕماو و چاوی گەورە و برۆی تێکچڕاو و لە هەموو بارێکەوە قەوارە جوان و لەبەردڵان بوو؛ بۆ ئەوەی چاوە گەورەکانی لە سەر چاوی داوای وڵامی من وەگوێزێ، بە دەستی خەریکی هەڵدانەوەی کاغەز و نووسراوەکانی پێش دەستی بوو و چاویشی بە دووی دەستیدا دەگێڕا. بڕێک مات بوو، پاشان بەوردی کەوتەوە تەماشاکردنی من و وڵامی پرسیارەکانی من. دیتم بەتەواوی وتەکانی حاجی بابەشێخی دووپات کردەوە، دەتگوت لە پێشدا هەماهەنگیان کردووە و بەرهەمەکەی لە جوابی هەر پرسیارێکدا دووپات بکرێتەوە! کوتی: «برام عەتری گڵۆڵانی، ئەتۆش و هەموو خەڵکی دیکەش دەزانن وڵاتی ئێمە، یانی ئازەربایجانی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات، بەتەواوی پێشێلی پۆتینی ساڵداتی ڕووسەکان بوو و دەوڵەتی مەرکەزی ئاسەوارێکی لە پێگای بێگانە داگیرکاراندا نەما. لە هەلومەرجێکی وادا، ئێمە هەرێم و مەڵبەندی خۆمان لە هەموو شەرارەت و بگرەوبەردەی بێگانە خۆی پاراستووە هەتا ئەو کاتەی دەوڵەت هەناوی دابینکردنەوەی وڵاتی هاتەوە بەری؛ لەو کاتەشدا ئێمە بە باوەشی ئاواڵە و ئامێزی پڕ لە شوکرانە، وڵاتمان لە باغەڵی مەملەکەت ئاخنییەوە. ئایا لێرەدا دەبێ ئێمە چاوەڕوانی جەزا بین، یان سزا، چاکە یان خراپە؟ سەلامی حاجیئاغای دەگەیەنی. پێی بڵێ ئەو لەو تەمەن و ساڵەدا نیگەرانی هیچ پێشهاتێکی نالەبار نەبێ. ئەوە بۆخۆت بە چاو دەبینی ئەمن بە ناوی فەرماندار بە «وەزارەتی کیشوەر» ناسێندراوم. ئێوەش جەوانانێکی کە لەو ڕێیەدا

نووسیوتانە یا گوتووتانە، جێگەی هیچ دڵخورپەیەک نیە، لە هەلومەرجی زەماندا و لە هەڵکەوتی مەکاندا هەنگاوتان هەڵگرتووە، ئاخر وا نەبووە؟»

گوتم: جەنابی حەمەحوسێنخان، ئەوانەی دەیفەرمووی چلۆنیەتی پێشهاتەکانە، پیاو نازانێ دەوڵەت دوای خۆگرتنەوەی، چۆنمان لەگەڵ بەرەوروو دەبێ؟ کوتی: «دیسان بە خۆشت دەڵێم، بە ئاواڵەکانیشت ڕابگەیەنە، بە حاجیئاغاش بڵێ، کەس نیگەران و ناڕەحەت نەبێ، قسە لە هەموو شت کراوە، خاترجەم بن بێ بوار لە چۆمیمان نەداوە.» کوتم: سەرووەرم، ڕاسپاردەی حاجی ئاغا و ئاواتی خۆم وەدی نەهاتووە، دەمهەوێ جەنابی پێشەواش زیارەت بکەم؟ کوتی: «پێشەوا وەک جاران، ڕۆژێ لە مەحکەمەی خۆی دادەنیشێ، زۆر جاران تیمسار هومایوونی، بۆ نەهار، یان لە پاش کاری ئیداری دەچێتە دیداری پێشەوا.» هەستام دەستی ماچ کەم و بڕۆم، هەستا و ڕووی ماچ کردم و وەدەرکەوتم.

## دیداری پێشەوای مەزن، قازی محەممەدی نەمر

لە خەیابانێ دەمدی هەر دوودوو و سێسێ سەربازی تفەنگبەدەست دەهاتن و دەڕۆیین. لام وابوو دەیانەویست خۆیان بنوێنن و دەراوان بەتاقی بکەنەوە.

بە پێش شارەداری ئێستادا تێپەڕیم. مەحکەمەی قازی وەک لە بیرم مابێ، لە بەرامبەر باشگای ئەفسەرانی ئەوکات و دادگای ئێستا، لە بەری جنووبییەوە لە سەر بستوو و بڵیندایەکی بوو. کە بۆی وەسەردەکەوتی، جێجێ پلیکانی لێ هەڵبەسترابوو، جێجێش پێگۆڕکە بوو هەتا دەگەیشتە مەحکەمەی قازی. لەژێڵلا کە وەسەردەکەوتم، بەفری باریوی دوێشەو شەقڵی نەشکابوو و شوێنەوارێکی لێ دیار نەبوو. پلیکانەکانم بڕی، پێگۆڕکەکانیشم بە دووی یەکدا پێوا و گەیشتمە دەرکی مەحکەمە. دەرکی پێشەوەم کردەوە، وەتاغێکی چکۆلە کە جێی چاپەز و سەماوەر و چا بوو؛ دیتم کاک «محەممەدی عەزیزمیرزا» کە کاربەدەستی لەمێژینەی بنەماڵەی قازی بوو و بە کاری مڵک و دێیەکانی «قاڕنجە» و «سەوزی» ڕادەگەیی، لە بن سەماوەرەکە دانیشتووە. کاک محەممەد زۆرجاران دەهاتە شێخاڵی و میوانی من دەبوو، زۆرم خۆشدەویست، پیاوێکی تێگەیشتوو و ئاقڵ و لەسەرەخۆ بوو، هەربۆیە پێشەوا زیاتر لە لای خۆی دەیهێشتەوە. کە

ئەمنی دی، دیار بوو سەری سوڕمابوو، لەو دەمانەدا ئەمن و ئێرە؟ لەبەرم هەستا و دوای بەخێرهێنان، چەکمەکانی کێشام و دایکەندن. دەی چۆنی و چۆن نی و ئەتۆ و ئێرە؟ کوتم کاکە محەممەد سەرسوڕمان و پرسیار لە جێی خۆی و بۆ دوایە، جارێ پێم بڵێ پێشەوا لە کوێیە و چۆنی زیارەت بکەم؟ دەرکی مەحکەمەی پێشاندام و کوتی: «لێرەیە و هەر بەتەنیایە و کەسی لا نیە و کاتێکی باش هاتووی بۆ زیارەتی، لە ژووری بەتەنێ قەدەمان لێدەدا.» گریان لە ئەوکی گیرابوو، دیار بوو ڕۆژگاری نالەبار پەرۆشی کردبوو. بێهەستێکی دەرکی مەحکەمەی بۆ کردمەوە. دەرکە دەنگی نەهات. پێشەوا لە حاستی دەرکەکەوە دەگەڕاوە بۆ ئەوسەری هۆدەکە. لام وایە ۱۲میتر زیاتر درێژایی ژووری مەحکەمە بوو. سەری بەردابۆوە و هەنگاوی بەئەسپایی دەهاویشت و لە پشتەوە بە هەر دوو دەستی کایەی بە دەنکی تەسبیحەکەی دەکرد و دەیهاویشتن. لە لای دەرکەوە لە حاستی خۆم ڕاوەستام هەتا وەرسووڕێ و بگەڕێتەوە. گەیشتە ئەوسەری سالۆنەکە و گەڕایەوە. ئەمنی دی کە بە دەرکەوە ڕاوەستابووم، زەردەیەکی هاتە سەر لێوی. ئەوە سێهەمین جار بوو کە ئەمنی دەدی، ناسیمییەوە، چوومە پێشێ، چەند هەنگاو هاتبووە خوارێ. لە نێوەڕاستی سالۆنەکە گەیشتمێ. دەستیم ماچ کرد، ئەولاوئەولای ماچ کردم، دەستی بەرنەدام، کوتی: «عەتری گڵۆڵانی لەم کاتانەدا بۆ هاتوویە ئێرە؟» کوتم: جەنابی پێشەوا بۆخۆشم ئاواتی زیارەتم بوو، بەڵان حاجی حەمەدئاغای شێخاڵی بەپێویستی زانی بێمە خزمەتت، لە خۆی نیگەرانە، دەیەوێ بزانێ داهاتوو چی لێدێ؟ دەوڵەت چ لە خەڵکی دەکا؟ دەوڵەت چی لێدێ؟ پێشەوا کوتی: «سەدرولئیسلام بۆی گێڕامەوە کە هاتبووە سەقز، سەرتیپ هومایوونی، حاجی حەمەدئاغا و هەژاری ئازاد کردبوون. ئەوە حاجی ئاغا هاتۆتەوە، ئەدی هەژار چی لێهاتووە؟» کوتم: حاجی ئاغا فەرمووی کە بە هاتنی جەنابی سەدر ئازاد کراین، هەژار وا هەڵات کە نەمزانی چی لێهات و بۆکوێ چوو. پێشەوا بە نارەحەتی و پەژارەوە کوتی: «هەژار چاکی کردووە هەڵاتووە. عەتری، ئەتۆ و هێمن و ئەوانی دیکەش کە هۆنراوە و نووسراوەکانتان لە ڕۆژنامەی کوردستان یان گۆوار و پەرتووکاندا بڵاو بۆتەوە، دەبێ بە چاکی خۆتان بپارێزن، جارێ لە ڕووی دەوڵەت بێ ڕواڵەت بن.»

گوتم: جەنابی پێشەوا، ئەوەی ئەتۆ دەیفەرمووی، لەگەڵ بیر و باوەڕی جەنابی حاجی بابەشێخ و حەمەحوسێنخان و خۆشبینییەکی ئەوان هەیانە یەکتر ناگرێتەوە و نێوانیان ئەرز و ئاسمانە؟! ئەوان پێیان وایە لە نەبوونی دەوڵەت لە ناوچەدا کار و خزمەتی گەورەیان بە ئێران کردووە. دەڵێن: کاتێک دەوڵەت هێزی وەرگرتنەوەی وڵاتی لە دەس داگیرکاراندا هاتەوە بەری، ئێمە بێدەردەسەر، بە ئامێزی ئاواڵەوە بە پیریانەوە چووین، بێ کێشە و هەرا و هەڵلا مەڵبەندمان خستەوە باوەشیان؟!

پێشەوا دەستی هەر بەرنەدابووم کە ئەم قسانەم بۆ دەگێڕاوە. هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، بڕێک پیشی خواردەوە. لەسەر بەراوردی ئەوان (حاجی بابەشێخ و حەمە حوسێن خان) نەدوا کە وایە یان وا نیە. باسکی گرتم کێشامی بۆ لای پەنجەرەیەکی کە بەرەو شانی ڕاستی خوار ببایەوە، دەیڕوانییە جەمسەری مەیدانی چوار چرایە؛ نەمدەزانی دەیهەوێ بڵێ چی و چی لە دڵدایە بیدرکێنێ؟

لە پێش پەنجەرەکە بڕێک خوار بۆوە بۆ لای مەیدانی چوارچرا. کوتی: «کوڕم عەتری، مەیدانی چوارچرا دەزانی؟» کوتم: بەڵی. کوتی: «ئێوە دەبینن قازی محەممەد لەو مەیدانە ئیعدام دەکرێ. بۆیە ئەوەی دەڵێم هەتا کوردستان، هەتا نەتەوەی کورد پێبزانن کە قازی محەممەد فریوی نەخوارد، هەڵخەڵەتاوی وادەی بێجێ نەبوو. ئەوەی بە ئێوە دەڵێم بۆ تاریخ و وڵاتەکەتانی بگێڕنەوە. بنووسن کە قازی نە فریوی خوارد، نە هەڵخەلەتا، بەڵکوو ویستی خۆی فیدای ئارمانی نەتەوەی کورد بکا. ئەو ئارمانانەی کە کۆمەڵەی (ژ.ک) و حیزبی دێموکراتی کوردستان بناغەی داڕشت و شوورەی کێشا. ئەمن نامێنم، بەڵان ئەو ئۆقیانووسە ئیرادە و ئاواتە گەورەی نەتەوەی کورد، کوا بە خاکەنازێک خۆڵەمێش و زیلەمۆی ناڕەوای نەیاران خاپوور دەکرێ؟ ئەوانە بۆیە بە تۆ دەڵێم، ئێوە نەسلی داهاتوون، ئەو نەسلەی کە باری داخوازی ئێمەی ڕابردوو و لە دەستانچوو دەکەوێتە سەر شانی ئێوە، سەر ئەستۆی ئێوە.»

بیری لێبکەوە، ئەمن لاوێکی کەمتر لە بیست ساڵ تەمەن کە تەواوی هومێد و ئاواتی داهاتووی خۆی و نەتەوەی کورد لە دیمەنی ئینسانێکی وەک پێشەوادا

پەرەی گرتبێ، پشکووتبێ و گەشابێتەوە، لەپڕ و لەنەکاو، نەوایەکی وا دڵتەزێن و نیدایەکی وا هەستبزوێن بە گوێ و دڵ و ڕووحی ئاشنا بێ، دەبێ چ حاڵێکی بێ و چ پەژارەیەک ڕوو لە ڕەوانی ناکاوی بکا؟! کوتم: جەنابی پێشەوا، کاتێک درۆ و دەلەسە و فێڵ و تەڵەکەی نەیاران و بەدخوازان ئاوا بۆ تۆ ڕوون و ئاشکرایە، بۆچی وەکوو «پیشەوەری» و «غولام یەحیا» و ئەوانی دیکە، مەڵبەندت بەجێنەهێشت و نەڕۆیشتی؟ فەرمووی: «کوڕم، ئەوە زۆرجوان دیارە. کە تێبگەی و لێم وەرگری و بیگەیەنییە هاوڕاز و ئاواڵ و هاوبازەکانت، ئەویش ئەوەیە، مەسەلەی نیشتمان و کۆمەڵەی (ژ.ک) و حیزبی دێموکراتی کوردستان، شتێک بوون بەتەواوی ڕایەڵوپۆی دەسکردی بنەماڵەی قازی و شەخسی خۆم بوو و هەر خانەوادەی قازیش دەبێ تاوانی غەرامەت و کەفارەتی ئەو غائیلە ببژێرن. ئەگەر ئەمن ڕۆیبام و مەڵبەندم بەجێهێشتبا، سەدان کەس و ئەشخاس بەو تاوانە سزا دەدران و ئیعدام دەکران، بەڵان ئێستا ئەمن ماومەوە کە تەواوی ئەو تاوانانە وەئەستۆی خۆم گرم. عەتری، ئێستا لاتان وانەبێ ناتوانم بڕۆم و خۆم دەرباز بکەم، بارزانی ئەوە لە دێی «دریاز» کۆ بوونەوە و هەر ئەوشۆ «مەلامستەفا بارزانی» پیاوی ناردبوو ئەگەر حازرە لەگەڵمان بێ، دەنێرم بیهێنن بۆ نێو عێلی بارزانی. جوابم بۆ ناردەوە و کوتم جەنابی مەلا مستەفا، ئەتۆ عێل و تەباری خۆت خرووپڕ لەگەڵە، یان پێکەوە دەژین، یان پێکەوە دەمرن. بەڵان ئەمنی سەد سەر و هەزار بەرە، کێ بێنم و کێ بەجێ بێڵم!؟ ئەوەی دەکرێ لەگەڵ خۆمی بخەم، تەنیا گیانێکی نەحەساوەی لە سەر لێوانە، ئەوەی دەبێ بەجێیان بێڵم، گەلە، نەتەوەیە، ئاو و گڵی نیشتمانە. نیشتمانێکی کە پەیمانی پێناوداریم هەتا ئاخرین نەفەس لەگەڵ بەستووە.

«من همانندم که وضو ساختم از چشمه عشق  چار تکبیر زدم یکسره بر هر چه که هست!»

دیمەن و سیمای پێشەوا لە پێش چاوم گۆڕا. گلێنەی چاوەکانم پڕ بوون لە فرمێسکی گەش. لە نێو گوڵاوی فرمێسکاندا، ڕواڵەتی پێشەوا دەبوو بە خەرمانەیەکی ڕووناک و بەربلاو، پێم وابوو ڕووحێکە، ڕەوانێکە، لە قالبی ڕیسالەتێکی پێئەسپێردراو هاتۆتە دیمەنەوە. دەیهەوێ ژیان و گیانی خۆی لە پێناوی ئەسپاردەکەیدا بسووتێنێ و بیتاوێنێتەوە. نازانم بە چاوی فرمێسکاوییەوە لە چ حاڵێکدا بووم. پێشەوا تێیڕوانیم، تێمگەیشت کە

واتەکانی، منی ڕاداوەتە دنیایەکی دیکە. بۆ ئەوەی چلۆنیەتی باسەکە بگۆڕێ، فەرمووی: «عەتری بە حاجی حەمەدئاغا بلێ، ئەو لە خۆی نیگەران نەبێ. قەزا و بەلاگێڕەوەی هەموان ئەمنم و خانەوادەی قازی. بەلان شوورەی قەڵایەکی کە ئەمن دامرشتووە، وەک شوێنەواری لەمێژینە، ئەگەر چەرخ و خولی زەمانیش تێکیبرووخێنێ، بناغە و ئاسەواری هەر دەمێنێ و زەین و سەرنجی نەتەوەی کات و داهاتوو بۆ لای خۆی هەر ڕادەکێشێ و هەستوخوستیان تەکان دەدا.»

ئەمن قسەم بۆ نەدەکرا، هێرشی گرپەی گریان، ئەوک و گەرووی بەستبووم. وتەیەکم نەمابوو بیلێم. دەستیم گرت ماچی بکەم، نەیهێشت، ئەو ماچی کردم. گەرمای لێوی و سڕی فرمێسک کە بە سەر و ڕوومەتمدا دەڕژا و ئەوە ٥٧ ساڵ لەو ڕۆژە تێدەپەڕێ، ئێستاش کە تەمەنم بۆتە ٧٧ساڵ، تین و بلێسەی لێوی پێشەوا و سڕی فرمێسکەکانم، لە سەر ڕووکاری چرچ و چەوێڵی خۆم هەر هەست دەکەم. قسەم بۆ نەدەکرا، لێوم دەلەرزی و دەبزووت، بەلان نە بۆ وتە و وتار، گڕ و کڵپەی دەروون هرووژمی هێنابووە سەر لێواری زار و زمانم. وەک کەسیرەی نێو کرێوەی کوێستان ددانم چفت کردبوو هەتا لێک نەدرێن و نەبێتە ددانەتەقە.

پێشەوا لە دیمەنی دژ و داماو و داتەکیوەرِا، زانی لە وەی پەرۆشترم کە بە لاواندنەوە بێمەوە سەرەخۆ. هاتە پێشێ و دەستی لە سەر شانم دانا و کوتی: «کاک عەتری، ئەوانەی لەسەری دواوم، بە شاعیران و ڕووناکبیرانی وڵاتی ڕابگەیەنە، بلێ نەمان و فەوتانم لەم ئاو و خاکەی نیشتماندا، زۆر جاویدانەترە لە وەی بڕۆم و هەڵێم و ببەزم و هەرێمی بەجێ بهێڵم. ڕۆینی من، وەک لە داوای خۆم و گەلی کوردستان تۆرابم ئاوایە. ئێوە بزانن! نەتەوەی داهاتوو بزانێ! قازی محەممەد دەیهەوێ لە ڕێی نیشتماندا بمرێ و بکوژرێ، نەوەک هەڵاتووی هەڵلای دوژمنان بێ و وەک هێندێکان نەتەوە و نیشتمان بەجێ بهێڵێ!»

لە پاشان بۆ ئەوەی بەڕێم بکا، هەنگاوەکانی بەرەو دەرکەکە هەڵێنا و دەرگای کردەوە. محەممەدی عەزیز میرزا، کارداری بەوەفای پێشەوا، هەستا سەرپێ، کە ڕواڵەتی ئەمنی دی وەک مێرمنداڵێک دەچووم کە لە سەر مەیتی بابی هەڵیبچڕن و دووری بخەنەوە، چاوی پڕ بوو لە ئاو و فرمێسکی هاتە خوارێ. پێشەوا دەستی لە سەر شانی لابردم و کوتی: «محەممەد لەگەڵ ئاغای

عەتری بڕۆ هەتا سەر خەیابانێ نەوەک سەربازێک ڕێی پێ بگرێ.» دیسان دەستیم ماچ کرد و چۆوە ژوورێ. ئەمنیش لە دوایە چەکمەکانم لە پێ کرد و بە دنیایەک پەژارەوە وەدەرکەوتم. کاک محەممەد هەتا سەر خەیابان لەگەڵم هات و وەک من چاوی بە فرمێسکانەوە گەڕاوە بۆ لای مەحکەمە.

وەخەیابان پێوانێ کەوتم هەتا کاروانسەرایە. ئەسپەکەم هەر بە زینەوە بوو، بێ ڕاوەستان هێنامەدەرێ و سوار بووم و بەرەو دۆستاڵی ڕکێفم لێدا.

کاتێک گەیشتمەوە «دۆستاڵی»، لای عەسر بوو. دەمهەویست بگەمەوە شێخاڵی، بەڵان «محێدینئاغا» نەیهێشت و کوتی زستانە و ڕۆژ درەنگانە و بەندەنی «قەرەبلاغیش» جێگای متمانە نیە؛ ئەگەر ئەسپەکەشت شەلینی چاک بۆوە سبحەینێ دەتوانی سواری بی و بچییەوە. شەوێ لە دۆستاڵی مامەوە. هەتا شەودرەنگانێک باس و هەواڵی وڵاتمان لێک دەداوە. سبەینێ کاتێک وەخەبەر هاتین ڕۆژ درەنگ بوو، تاووبان کەوتبوو. ڕۆژێکی تاووساوی بەهاری بوو، دوای خواردنی نانی بەیانی، ئەسپەکەیان بۆ حازر کردم، ئەمنیش خۆم ساز کرد و فیشەکدانم لە خۆم بەست و دوای خوداحافیزی بەرەو قەرەبلاغ وەڕێ کەوتم.

## دیسان پێشهاتێک لە داوێنی بستووی «قەرەبلاغ»

بەفر کاڵەپێیەک عەرزی داپۆشیبوو، بەڵان بۆ سوار و پیادە ڕێ نەگیرابوو. لە دێی قەرەبلاغێڕا وەسەر کەوتم. هەتا دەگەیشتە ملەی چیا، بێپسانەوە، ژن و منداڵ و ماڵات و حەیوانی خێڵی بارزانییان بوو کە بێمەودا لە لای دێهاتی بۆکان و سەقزەوە دەهاتن و بەرەو «قونقەڵا» و «ئیندرقاش» و «دریاز» دەڕۆیشتن. بە هاتنەوەی هێزی حکوومەتی، ئەوانیش تەقوڕەویان تێکەوتبوو کە بەرەو خاکی ئێراق یان شووڕەوی خۆیان ڕزگار بکەن. مرۆڤ لە دیمەنی ئەو هەموو ژن و منداڵ و پیرەپیاو و پیرەژن و ماڵاتە کە وەپێش خۆیان دابوون، پەژارە دەیگرت. لە هەموو دەستەیەکی کە دەهاتن و دەمگەیشتنێ، لێیاندەپرسیم: سوار، داخوا هێزی دەوڵەتی بەرەگەی لێنەگرتووین؟

هاتم هەتا دەگاتە سەر بستووی بەرەو ڕووی گوندی «قەمتەرە»، ئەو کۆچ و خێڵ و بارەی بارزانییان پسانەوەی نەبوو. سەرووژێر بوومەوە بەرەو قەمتەرە، ڕاست ئەو شوێنەی ڕۆژی پێشوو تووشی «عەلیئاغا» و ڕەسووڵئاغای

جەوانمەرد» بووم. کەمێک واوەتر چەند ڕۆژ لەپێش‌دا لەگەڵ «سمایل‌ئاغای حیسامی» تووشی «سەدرولئیسلام» و «سەرهەنگ فیووزی» بووین. لەو جێ بیرەوەرییانە، دیتم ٩٠ تا ١٠٠ کەس چەکداری بارزانی، بە دوای ئەو خێلاتەدا دەهاتن و بەفریان دەبڕی. سێ‌سێ و چوراچوار بە پانی ڕێگا هەنگاویان دەهاویشت. کە ئەمن دیتم بە پانی ڕێیە تاق و جووت دێن، بڕێکم ترس ڕێنیشت، نەکا خەیاڵی خراپیان هەبێ. لەم کاتەدا چەک و چارەوێ بۆ ئەوان لە هەموو شت پێویستترە؟ نەکا تەما لە تفەنگ و ئەسپەکەی من بکەن؟ پێم ناحەز بوو لاڕێ بم، ڕاستەڕێش ڕۆیبام دەبوو ئەوان دڕ بدەن، ئەسپەکەی من قەدەمی خۆی تێکنەدەدا و ئەوانیش جێ هەنگاوی خۆیان نەدەگۆڕی. گەیشتینە ئاستی یەکتر، ئەمن سوار بووم و بە سەر ئەوان‌دا دەمڕوانی. دەستم بە نیشانەی سلاو هەڵێنا و سلاوێکی گەرم‌وگوڕم بە ڕووی پێشڕەوەکانیان دادا. چەند چەکدار کە لە پێشەوە بوون بە ڕاوێژی بارزانییانە ولامی سلاوەکەیان دامەوە. ئەمن جڵەوی ئەسپەکەم کێشا و ڕامگرت، ئەوانیش لە پێشمەوە ڕاوەستان. سێ کەسیان هاتنە پێشێ. یەکیان پیاوێکی گەڕاوە و ڕدێن‌سپی، چەقەڵ و لاواز و کەڵەگەت بوو، دووشیان لام وایە یەکیان مستەفا خۆشناو بوو. پیاوە ڕدێن‌سپییەکە تفەنگ و دەمانچەی لە خۆ دابوو، خەنجەرێکی سێگۆ تەڵای لە بەر پشتێندی چەقاندبوو. قەدەمێک لە وانی دیکە هاتە پێشتر و بە زاراوەی بارزانی و ڕاوێژی موکریانی کوتی: کوڕی من ماندوو نەبی، لە کوێ‌ڕا هاتووی؟ کوتم مامە گیان سلامەت بی، ئێستا لە دێی دۆستاڵی‌ڕا دێم، بەڵان دوێنێ چوومە مەهاباد و خەڵکی دێی شێخاڵیم و دەچمەوە بۆ وێندەرێ. زۆر لە سەرەخۆ پرسیاری کرد: ئەدی کوڕی من باس و هەواڵی مەهاباد چیە و خەبەری پێشەوای چدەزانی؟ کوتم مامۆگیان پێشەوا لەماڵی خۆی ئازادە و سپاش جارێ هیچ کاری نەکردووە، دوایەش بۆ کەس مەعلووم نیە دەیهەوێ چ بکا. لە پاشان پرسی: ئەدی نەتزانی بارزانی کۆمەڵگەیان لە کوێیە؟ کوتم دەڵێن بارزانی بە پتوونی لە گوندی «دریاز»ن. کوتی: ئەوەی لە کوێ‌ڕا دەزانی؟ کوتم ئەوەی لە فەرمایشی پێشەواڕا دەزانم کە جەنابی مەلامستەفا پیاوی ناردبووە لای پێشەوا کە بێ و لەگەڵ بارزانییان ڕوو لە جێیەکی بکەن و پێشەوا ولامی دابۆوە کە مەلامستەفا هەموو عێلی خۆی پێیە و ژیان و مردنیان پێکەوەیە، بەڵان ئەمنی سەد سەر و هەزار سەودا، کێ بێنم و کێ

بەجێ بێڵم، ئەو بڕوا سەری خۆی و عێلی خۆی دەرکا و ئەمنیش بە خودا بسپێرێ. مامۆ کوتی: وای لە قسێ وەها نەستەق؟ دایکان دەبێ هەر بۆ مێرانی ئەوها سەران لە هەشی نێن. پاشان کوتی: کوڕێ من، ئەمن پێم دەڵێن «مامەند قادری» لە قسێ و خەبەرەکانی تۆ کەلکم زۆر وەرگرت، وێدەچێ ئەتۆش لە داهاتوودا لە قاچاغ و قوچاغەکانی مەڵبەندێ بی، ئێمە دەستەمان زۆر لە دوایەن. زۆریان بێ چەک و ئەسلەحەن، مەبادا تووشی گیروگرفتان بی. واباشە ڕێیەکەی خۆت چەپەک بکەی، بەوی لاڕێیەدا کە بەرەو «حاجیاڵیکەند» دەڕوا، تووشی بارزانییان نابی. قسەمان تەواو بوو، خوداحافیزیم خواست و بە ڕێی گوندەکانی «حاجیاڵیکەند» و «غەوساباد» و «قۆرغان»دا چوومەوە شێخاڵی.

دوای حەسانەوەیەک چوومە لای حاجی حەمەدئاغا. کاتێک باسوخواسی مەهاباد و دیداری حاجی بابەشێخ و حەمەحوسێنخان و پێشەوام بۆ گێڕاوە، بە خەبەری فەرمانداری حەمەحوسێنخان زۆر خۆشحاڵ بوو، بەڵان تێبینی و بێباوەڕی پێشەوای لە داهاتووی خۆی، حاجیئاغای داچڵەکاند. باوەڕی هاتە سەر ئەوەی کە تێبینی پێشەوا هەنگێوەترە لە خۆشباوەڕی ئەوانی دیکە. حاجیئاغا لە گیرانەکەی خۆی و هەژار بە دەس سەرتیپ هومایوونی لە سەقز چاوترسێن ببوو و تێبینی پێشەوا بەتەواوی پەرێشانی کرد.

## گیرانی پێشەوا و حەمەحوسێنخان و سەدرولئیسلام

لام وایە ڕۆژێک یان دوو ڕۆژ دوای ئەو دیدارانە خەبەریان هێنا کە پێشەوا و حەمەحوسێنخان لە مەهاباد دەسگیر کراون و هەر ئەو ڕۆژە سەدرولئیسلامیشیان لە تاران گرتووە و ناردوویانەتەوە بۆ مەهاباد. پێشبینییەکەی پێشەوا وەڕاست گەڕا. چەند ڕۆژێک دوای گیرانی پێشەوا و ئەوانی دیکە، بەفرێکی قورس باری کە ڕێگای هاتوچۆی بەینی دێهاتی دووردەست و شاری کەم ببۆوە. لە دنیای کڕوماتی زستانی سڕ و بێدەنگیدا مابووینەوە. زۆر جاران لەگەڵ کاک خالید (شێواو = هێدی) سەروبنی کاری خۆمان و ڕۆژەکانی تاڵی داهاتوومان لێک دەداوە، بەڵان بەداخەوە کارەکە هێندە پێچوپڵووچ و ئیشەکە هێندە چەواشە بوو، چمان بۆ ساغ نەدەبۆوە.

## نامەیەک و هەواڵێکی ئاگاکەرەوە

مانگ‌ونیوێک لە گیرانی سەرانی کوردستان تێپەڕیبوو. ڕۆژێکی سوارێک لە دەرکی ماڵی من دابەزی و بانگی کرد ساحێب‌ماڵ! وەتاغێکی چکۆلەم هەبوو هێندێک کتێب و پەڕتووکی لە نێو تاقەیەکدا تێدا هەڵچندرابوو. کووره داییسا، وەتاغەکەم گەرم‌وگوڕ بوو. تەماشای کتێبم دەکرد کە گوێم لە دەنگی داواکاری خاوەن‌ماڵ بوو، خێرا چوومە دەرێ. دیتم سوارێکی سەروگوێ دابەستراو، زەنگاڵ و پووزەوانە هەڵکێشاو، جڵەوی ئەسپەکەی بەدەستەوە، چاوەڕوانی خاوەن‌ماڵ بوو. زانیم لە دووریڕا هاتووه و زستانی پێکوت کردووه. یەکێک لە براکانم لە نێو ماڵێ هاتە دەرێ. جڵەوی ئەسپەکەی لە میوانی وەرگرت. کوتم فەرموو میوانی بەڕێز بۆ ژوورێ. لە پێشخانەی وەتاغەکە پێڵاوەکانی تەکاند و بەفری زەنگاڵەکانی بە گەسک داماڵی و چووینە وەتاغی گەرم. میوان زۆر بەخێر بێی، دیارە ڕێگای ناخۆش و بەفری زۆر شەکەتی کردووی؟ کوتی: بەڵێ، ڕێگا ناخۆشە و لە «حاجیاڵی‌کەند»ی‌ڕا هاتووم و پیاوی ئاغای «عەزیزخانی حەیدەری»م. زۆری سڵاو دەگەیاندی و دەیگوت لەمێژە لێی بێخەبەرم. دەستی بە باغەڵیدا کرد و نامەیەکی هێنادەر و دایە دەستم. کوتم کاکە ئەتۆ ماندووی، جارێ چایەکی بخۆوە. توخوا عەزیزخان چۆنە؟ لەگەڵ زستان و ئەو دنیایەی چۆنی دەگوزەرێنێ؟ کوتی: عەزیزخان بیست ڕۆژ دەبێ هەر لە مەهابادێیە. دوێنێ بۆ سەردانی ماڵێ هاتۆتەوە و دەبێ سبەینێش بچێتەوە بۆ مەهاباد. نازانم دەوڵەت چ کارێکی پێیەتی وا هەر لەوێ ڕایگرتووە؟!

دیتم نامەیەکی دوولاپەڕەی بۆ نووسیوم. پوختەی کاغەزەکەی ئاوا بوو: کاک محەممەدی نووری ئەمن بیست ڕۆژ زیاترە لەسەر داوای فەرماندەی لەشکری مەهاباد لە ڕوکنی ٢ی ستادی ئەرتەش خەریکی وەرگێڕانی نووسراوە و هۆنراوەکانی ڕۆژنامەی «کوردستان» و گۆوارەکانی دیکەی کوردیم کە دەبێ بەشە سیاسی و شێعر و هۆنراوەکانی ئەم ڕۆژنامە و گۆوارانە وەرگێڕمە سەر فارسییەکی سەرە و ڕووناک. دوێنێ پێش هاتنەوەم بۆ ماڵێ، لە ڕۆژنامەی کوردستاندا، هۆنراوەیەکی «یا وەتەن یا مردنم»ی محەممەدی عەتری گڵۆڵانیم وەرگێڕاوەتە سەر فارسی. کە ئەم هۆنراوە بۆ ڕەئیسی ڕوکنی ٢ زۆر جێگای سەرنج بووە. لە ڕوانگەی ئەواندا ئەم هۆنراوە لە هۆنراوەکانی دیکە

هەنگێوەترە! دوای هاتنەوەم ، لە پێش هەموو کارێکمدا بە پێویستم زانی کە ئەو هەواڵەت پێ ڕابگەیەنم کە لێرە بەولاوە ئاگات لە خۆت بێ. وەک دەزانی هەژار هەڵاتووە و ئەتۆ و هێمن لە تۆڕێدان. دەبێ وریای خۆتان بن و خۆتان بپارێزن.!

## «عەزیزخانی حەیدەری» کێ بوو و چی بوو و چۆن بوو؟

بۆ ڕوونکردنەوە و ناسینی ئەو کەسانەی کە لەم بیرەوەرییەدا نێویان دێتە گۆڕێ ، دەبێ بە خوێنەرانیان بناسێنم کە کێ بوون و چ نەخشێکیان لە هەڵکەوتەکانی هەرێمدا بووە.

«عەزیزخانی حەیدەری» ، کوڕە گەورەی «عەلیبەگ»ی حاجیاڵیکەند ، ناودێر بە «سالارسەعید» بوو. لە زەمانی شایەتی ڕەزاشادا ، چەند دەورە نوێنەری مەهاباد لە «مەجلیسی شووڕای میللی»دا بوو. لەبەر ئەو پێشینە ڕووناکەی کە ئەو بنەماڵە بوویان ، «عەزیزخان» ئەو بیر و باوەڕەی حکوومەتی بۆ بەجێ مابوو ، بەڵان لەسەر ئەو پێشینە ڕووناکەی کە ئەو بنەماڵە ، لە دەورانی حکوومەتی ناوەندیدا بوویان ، عەزیزخان لە دەورەی بزووتنەوەی کۆمەڵەی (ژ.ک) و حیزبی دێموکراتی کوردستاندا ، هەستی نەتەوەویستی و نیشتمانپەروەری خۆی ، زیاتر لە ئەفرادی عێل و عەشیرەتەکانی دیکە نیشان دەدا و بەکردەوەی خۆی دیاری کردبوو ، لەبەر چاوی حیزبییەکان ، عەزیزخان کەسێکی خۆیی تەواوعەیار بوو ، لەو ڕێبازەدا نیزیکی ئارمانیمان پێکەوە زۆر پتەو بوو و زۆر جاران هۆنراوەیەکم هەبا لێیوەردەگرتم. ئەوینی ئاوات و ئارمانی نەتەوەیی کردبووە سیپارەیەک کە هەمیشە لە سەر دڵی دانابوو. لە کاتێکدا ڕوکنی ٢ی ئەرتەش بە پێشینەی خزمەتی سالارسەعیدی بابی لێی ویستبوو ڕۆژانە لە ڕوکن دانیشێ و تەواوی ئەو ڕۆژنامە و بلاوکراوانەی حیزبی وەرگێڕێتەوە سەر فارسی و نووسەر و ڕووناکبیرەکانی هەرێم بناسێنێ و بۆ حکوومەتیان دیاری بکا ، وەک لە دوایە دەرکەوت ، تەواوی دۆستان و ئاشنایان و ناسراوەکانی حیزبی لە ویستی سیاسی حکوومەت ئاگادار کردبوون کە خۆیان ئاشکرا نەکەن و ئەرکی ئینسانی و کۆمەڵایەتی خۆی نیشان دابوو. ئەوە بوو کە بەپەلە ناردبووی و ئەمن و هاوڕازەکانی دیکەی وەخەبەر هێنا. بە پیاوەکەی «عەزیزخان»م گوت: کاکە گیان ، سپاسی عەزیزخان دەکەم کە دۆست و ئاواڵان لە

بیر ناکا، ئەمنیش وڵامی سپاسی خۆمی بۆ دەنووسمەوە. گوتی: چونکە عەزیزخان سبەینێ دەچێتەوە شاری، دەبێ ئەورۆ وڵامەکەی بۆ بەرمەوە. خوداحافیزی کرد و ڕۆیشتەوە.

## دوای ساڵێک لەگەڵ عەزیزخان یەکترمان دیتەوە

دوای ساڵێک کە عەزیزخانم دیت، چونکە لە کاتی خۆیدا ئەندامێکی باوەڕپێکراوی حیزبی بوو، بۆ ئەوەی چلۆنیەتی ئەوە نیشان بدا کە چۆن ڕوکنی ۲ی ئەرتەش، ئەو کارە گرینگەی لەو کاتەدا بەوی ئەسپاردووە گوتی: «کاک عەتری (ژ.ک) و کاک نووری جاران، پێشینەی ژیانی باوکم، ئەو میراتەی بۆ ئێمە بەجێهێشت کە لە مەڵبەندیدا جێگەی بیر و باوەڕی حکوومەت بین. هەر لە ڕووی ئەو پێشینەوە (قرعه فال به نام من دیوانه زدند)، بەڵان شتێکی لەو ماوەیەدا سەرنجی منی ڕادەکێشا ئەوە بوو، کەسانێکی لە کاتی حکوومەتی پێشەوادا گوللەیان بە دەستی دەگرتەوە و سینگیان ڕەپێش دەخست و بە خۆ و عێل و تەبارەوە لە خزمەتی خێڵ و کۆمەڵ و پێشەوادا بوون، یەکیەک و دوودوو لە ڕوکنی ۲ وەژوور دەکەوتن، گۆوار و ڕۆژنامە و نووسراوەیان لە کون و کاژێراندا دەدیتەوە و دەیانهێنا و خزمەتگوزاری و فیداکاری خۆیان ڕادەگەیاند! گوتم: عەزیزخان دەزانم دەڵێی چی، دەڵێی وەک کابرای کرماشانیم بەسەر هاتبوو. دەگێڕنەوە لە کرماشان جێژنی «عومەرسووتان»یان بەڕێوە دەبرد و لە سینگی خۆیان دەدا و جنێویان بە حەزرەتی عومەر دەدا. کابرای سوننی لە سینگی خۆی ڕادەکێشا و دەیگوت: (چەمانم کۆرە یا عومەر، ئی کاری زۆرە یا عومەر). عەزیزخان پێکەنی و گوتی: «مەسەلەکە پڕ بە پێستی بوو، ئەوەت لە شێعرەکانت ئەنگێوەتر بوو. ئەو باسوخواسەی عەزیزخان لەو هەلومەرجەدا، دووڕوویی و ڕیاکاری هێندێک لە دانیشتوانی مەڵبەندی ڕادەگەیاند. بمرن ئەو کەسانەی بە دووڕوویی دەژین.

ئەو چەند مانگەشم لە ترس و خۆفدا لە گوندی شێخاڵی گوزەراند. دەمهەویست دەمەوبەهار ماڵم لە شێخاڵی بڕوا. «شێواو» و «عەتری» لە سەر بەڕەیەک جێیان نابێتەوە، واچاکە بۆ ماوەیەک خۆم حەشار بدەم و وەک کەروێشکی بازرە لانگۆڕکێ بکەم تا تەفوچەق کەم دەبێتەوە.

## هەرا و غەوغای ئیعدامی پێشەوا و یارانی

لە شار و دێهاتی دوور و نیزیک، غەوغا و هەرا و هەڵڵا پەیدا بوو. لە زۆر شوێن و ماڵان بوو بە شیوەن و قورپێوان، بۆچی؟ مەگەر چ ڕووی داوە؟ کوتیان، لە بەرەبەیانی ڕۆژی ١٠ی مانگی خاکەلێوەی ساڵی ١٣٢٦، پێشەوای نەمر، سەدرولئیسلام و حەمەحوسێنخانی سەیفی قازی، لە مەیدانی چوارچرای مەهاباد لە دار دراون و ئیعدام کراون. بەڵێ ڕاست ئەو مەیدانەی کە ڕۆژی سێزدەی مانگی بەفرانباری ١٣٢٥، یانی ٨٦ڕۆژ پێشتر، جێگای ئیعدامی خۆی دەسنیشان کرد، قامکی ئیشارەی بەرەو مەیدانی فەوتانی خۆی ڕاداشت و کوتی: «پێتان وا نەبێ قازی فریوی وادە و وەعید و تەڵەکەی خواردووە، خوێنی خۆم لە ڕێگای داوای کوردستاندا دەهاوێمە زەینی مێژوو و ئەستۆی نەتەوەی داهاتووی کوردستان.» جا بۆیە دەڵێم: هەر بە ژیاوی ماوی ئەی پێشەوا و ڕێبەری گیانبازی کورد و کوردستان.

کاتێک ئەمن ئەو بیرەوەرییە دەنووسمەوە کە ٥٦ساڵ و چەند مانگ، لەو ڕۆژە تاڵوتوونە تێدەپەڕێ. تەمەنم نیزیکەی ٧٧ساڵە و دەزانم زنجیرەی مەودا و درێژەی زەمان پساوە، گەڕاومەتەوە ئەوان کاتان، کە ئەوانەی بە چاو دیتوومن و بە گوێیان بیستوومن، شی دەکەمەوە و وەردی دەدەمەوە.

ئەو قەڵەمبەدەستانە، یان ئەو داستاننووسانەی کە لایان وابێ پێشەوای نەمر، فریوی وەعدەی قەواموسسەلتەنەی خوارد کە دابووی بە سەدرولئیسلام، یان خۆ هەڵخەڵەتاوی کۆمەک و یارمەتی پشتیوانی ڕووسەکان بووبێ کە نەیەڵن حکوومەتی ئێران خراپەی لەگەڵ بکا، ئەوانە مێژوو بەرەو لاڕێ دەنگ دەدەن.

کەسانێکی بارودۆخی ئەو ڕۆژانەیان لە بیر مابێ، یان پیرەپیاوان و پاکباوەڕان دەزانن، کاتێک هێزی بێگانەکان (ڕووس و ئینگلیس و ئەمریکا) خزانە ئێرانەوە، حکوومەتی ناوەندی شیرازەی پسا، عێل و عەشیرەت وەک دەورانی پێش ڕەزاشا بوونە خاوەن چەکوچۆڵ و تفەنگ. هەر عێل و عەشیرەتێک جوێجوێ و دەستەدەستە خزانە مەهاباد. مەهابادێکی سەدان بیرەوەری تاڵ و سوێریان لە دەورانی دەرەبەگی لە زەینیدا مابوو. بۆ بەرگری

لە کردەوەی ناحەزی دەرەبەگی لە ناوچەدا، جەنابی قازی محەممەد، بە هاوکاری پیرەمێرەکان و تیپی لاو و جەوانی شار، کەوتنە سەر ئەو خەتەی کە حیزبێکی یەکگرتوو لە هەموو چین و توێژێک بە ناوی کۆمەڵەی (ژ.ک) پێک‌بێنێ و پێکی هێنا. لە پێش ئەوەی‌دا ڕووسەکان تەشکیلاتی حیزبی دێموکرات دامەزرێنن، کۆمەڵەی (ژ.ک) بە مەرامنامەی تایبەتی خۆیەوە سەقامگیر ببوو و لە دێهات و شار و عێل و عەشیرەت و مەلا و شێخ و شوان، بانگ دەکرانە سەر ڕێگای یەکێتی و برایەتی و یەکگرتوویی و بە قەیدی قەسەم بە قورئان خەیانەت بە یەکتر نەکەن و لە ماڵی یەکتر ڕۆنەیەن.

ئەوانەی دەڵێن پێشەوا کۆمەڵە نەبووە، یان بێ‌خەبەرن، یان لە جەریانی ڕۆژدا نەبوون. دەنا پەنا و پشتیوانی دانانی بناغە و بینای کۆمەڵەی (ژ.ک) پێشەوا بوو. لە دوای داگیرکرانی ئێران لە ساڵی ١٣٢٠ بەولاوە، دەوڵەتی شوورەوی دەیهەویست لە هەرێمی داگیرکراوی خۆی‌دا، یانی «ئازەربایجانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا»دا ڕاوگە و پێگەیەک پێک‌بێنێ و بیکاتە بارمتەی پاشەڕۆژ کە لە داهاتوودا هەتا سێ قاتی بارمتەکەی ئیمتیاز لە ئێران نەستێنێ، گاڵ و گەزەکی نەگوێزێتەوە، وەک دیتمان واشی کرد!

هەر پێشبەند و پشتبەندی ئەو تێبینی‌یە بوو کە شوورەوی دوو جاران سەرۆک عەشیرەت و سەرعێلەکانی مەڵبەندی مەهابادی بۆ «بادکۆبە»بانگهێشت کردن. نووسەران و مێژوونووسان، نێونیشانی بانگ‌کراوەکانیان نووسییەوە کە لێرەدا پێویست ناکا دووپاتی کەمەوە. پسپۆران و مێژوونووسانی ڕووس بە سەر خوو و خەسلەتی عێل و عەشایری کورددا، لە هەموو ڕۆژهەڵاتناسانی دیکە شارەزاتر و ئاشناتر بوون و دەیانزانی سەرەگوریسێکی بدەنە دەست سەرعێلێک، ئەوانی دیکە دەبنە ملۆزم و گێرەشێوێن. بۆخۆیان دیبوویان حکوومەتی ناوەندی، «عەلی‌ئاغای عەلیار» (ئەمیرئەسعەد)ی کردە فەرمانداری مەهاباد و بەو کارە عێل و عەشیرەتی ناوچەی لێ وەخۆکەوتن و هەتا دەوڵەت لاینەبرد لە کۆڵی نەبوونەوە. هەر لە ڕووی ئەو حیسابگەرییە کۆن و نوێیە کە لە خوو و خدەی عەشایری لە دەستیان‌دا بوو، دەیانزانی قامک لە سەر هەرکامیان دانێن، ئەوانی دیکە دەیچووێنن و دەڵێن قرت. شوورەوی لە ڕووی

ئەو تێبینییانەوە هاتە سەر ئەو باوەڕەی کە شەخسی قازی محەممەد بۆ مەهابادی و دێهاتی و عێل و عەشایر جێگەی ڕێز و ئێحترامی پێویستە، باشترە ئەرکی ڕێبەری و پێشەوایی حیزبی دێموکراتی کوردستان بهاوێنە سەر ئەستۆی ئەو کە شیاوترین و لایقترین کەسی کوردستانە بۆ ئەنجامی ئەو ئەرکە.

## قازی محەممەد لە نێوان بەرزەخی (ئەریّ) و (نا)دا

قازی محەممەد لەو بەرزەخەدا وێستابوو، (ئەریّ) یانی لادانی بەرنامەی نەتەوەیی و ناسیۆنالیستی کۆمەڵەی (ژ.ک) کە بۆخۆی هانی دانانی دابوو کە ئێستا لە دڵ و دەروونی لاوان و پیران و شار و دێهاتدا جێگیر بووە؛ پێشەوا تێمابوو کە چۆن ئەو مەبەستە گرینگە بکاتە دەستەچیلەی حیزبی دێموکراتی دانەمەزراو؟ ئەگەر (نا)ش بێ، ڕووسەکان لەم تاڵووکەی بڕیاردان و تەماگرتنەدا بۆ پیادە کردنی بەرنامەی دارێژاوی خۆیان، بەپەلە و بێ بەرجەوەندی، بۆ مەسڵەحەتی ناوچەیی، کەسێک و عونسورێکی ناباب و ناسازگار لەگەڵ بیر و باوەڕی گشتی دەهاوێنە سەر ئەستۆی مەهاباد و بەرهەمی ناتەبایی و چەند لایەنە، دیسان مەهاباد دەکاتە مەکۆی جلیت و شەڕناخێوی نێوخۆیی؟ قازی محەممەدیش ئەوەی ئێستا کردوویە و دەیهەوێ بیکا، تەنیا بۆ خاتری پاراستنی ماڵ و منال و شەرەف و سەربەرزی نەتەوەی کورد و مەهابادە و هیچی دیکە.

## فەرموودەیەکی پێشەوای نەمر:

«دوای ئەوەی خۆم لە مەحکەمەی ویژدانی و نەتەوەیی هێنا بەر پرسیار، قازانج و زیانی پێشهاتەکەم بەراورد کرد، هاتمە سەر ئەوەی کە خۆم و داهاتووی خۆم لە پێناوی مەسڵەحەتی کوردستان بنێم. هەرچەند ئاخری کار نادیارە! بەڵان هەتا ئەو جێیەی چلۆنیەتی زەمان ئیجازە بدا، لە ڕێی سەربەستی مەڵبەند و نەتەوە تێدەکۆشم. کاتێک پێشهاتی زەمانی هاوکاری نەکردم، ئەوە خۆم فیدای خاکی نیشتمان و نەتەوەی خۆم کردووە و بە سەربڵێندی سەر دەنێمەوە.»

ئەوە بوو کە بەپێی تەشکیلاتی «دێموکرات فیرقەسی» ترکەکان، حیزبی دێموکراتیش لە مەهاباد داوای خودموختاری خۆی گەڵاڵە کرد. بەڕواڵەت حیزبی کۆمەڵەی (ژ.ک) دەرکی پێوەدرا، بەڵان بەرنامە و مەرامی کۆمەڵەی (ژ.ک) و

حیزبی دێموکراتی کوردستان، بە ڕێبەری پێشەوای نەمر، هەتا ئەبەد بۆ نەتەوەی کورد جێگای بیر و باوەڕە و ئیعتباری خۆی بۆ نەسلی داهاتووش پاشەکەوت کردووە و هەر هێشتوویەتەوە و هەر درێژەی هەیە.

مەبەستم لە نووسینی ئەم بیرەوەرییە واقیعەنیگاری و بۆچوون و گومان نیە، بەڵکوو ئەوانە هێندێکیان بەرهەمی هاوکاتی لەگەڵ پێشهاتەکان و هێندێکیان دەڕوانێتە ئەو دیدارەی کە لە دوایین ڕۆژەکانی ژیانی پێشەوای مەزن بەهرەم لێوەرگرت.

لە پاش ئیعدامی پێشەوا بۆ زۆر کەسان جێی حەسانەوە و حاوانەوە نەما. هەژار هەڵاتبوو، هێمن خۆی حەشار دابوو، عەبدوڵلای مستەوفی (سەعید ناکام) کە لە شاری «سلێمانی» ژن و منداڵی بەجێ هێشتبوو و هاتبووە مەهاباد و لە ڕۆژنامەی کوردستان‌دا کاری دەکرد و لەگەڵ «ساڵح ئۆقلیدۆس» کە لە شاری سنەڕا هاتبوو و هاوکار بوون و دەیان ئەندامی دیکەی کۆمەڵە و حیزبی دێموکرات وەک یەهوودی سەرلێشێواو، هەر ڕۆژەی لە کون و کاژێرێک‌دا خۆیان حاشار دەدا. ئەمانە نە ڕواڵەتی گەڕانەوەیان بۆ هەرێمی خۆیان بوو و نە حاشارگەیەک کە خۆی لێ پەنا بدەن؟ ئەمن لەوانە لە هەموویان تەنگەتاوتر و سەرلێشێواوتر بووم.

## جێگۆڕکێ چارەی کارە

لە مانگی بانەمەڕی ساڵی ١٣٢٦، بە ئیجازەی حاجی حەمەدئاغای حیسامی و مەسڵەحەتی ڕۆژ، ماڵم گوێزتەوە بۆ گوندی «مەڵلالەر» لای «قادرئاغای قارەمانی» کە پێشەکی ناسیاویمان بوو و خانوویەکی خۆش و خاوێنی دامێ کە ئەمنیش دەرس بە کوڕ و برازاکانی بڵێم. ڕۆژانە کە دەرسم بە منداڵان دەگوت، ئەسپاردبووم ئەگەر ژاندەرمە هاتنە دێ، پێم بڵێن و زوو خەبەردارم بکەن. ساڵەکانی ١٣٢٦ و ١٣٢٧ لەو گوندە مامەوە. ئەوانەی پێم خوێندبوون، ئێستا زۆربەیان یان کارمەندن و یان خانەنشین کراون.

لە پاییزی ساڵی ١٣٢٧دا بۆ یەکەمین جار لەگەڵ ئافرەتێکی بۆکانی زەماوەندم کرد. بەڵان ئەو گۆڕانکارییانە تەفاوەتێکی لە هەڵسوکەوتی ژیانمدا نەبوو. بە ناوی «ماجەراجوو» و «موتەجاسیر» و سەدان نێوونیتکەی ناحەزی دی، هەر

دەبوو لە کون و کاژێراندا خۆ وەشێرم و لە دامودەزگای دەوڵەتی خۆم ببوێرم.

لە دەمەوبەهاری ساڵی ١٣٢٨، شای ئێران «لێبووردنی گشتی» (عەفووی عوومی) ئیعلام کرد. لە لایەکی دیکەوە بە ناوی «کۆمۆنیست» و «ماجەراجوو» لێیان‌دەگەڕان و سۆراغیان دەپرسین. لەو حاڵەی‌دا ئەمن لە ژیان و لە گوندی «مەڵلالەر» زەدە ببووم و لە هەوڵی جێگۆڕکێ‌دا بووم.

## حاشارێکی دی و باشارێکی دی

لە مانگی جۆزەردانی ساڵی ١٣٢٨، بە هۆی یەکێک لە ئاشنایان کە ماڵی لە گوندی «عەنبار» بوو، شناسیم لەگەڵ «برایمئاغای عەلیار» کوڕی «عەلی‌ئاغای ئەمیرئەسعەد» و سەرۆک عێلی دێبوکری بۆ ڕێککەوت. بۆ ئەوەی دەرس بە کوڕەکانی بخوێنم، ماڵم هاتە ئەو گوندە و بوومە جیرانی «شێخ ئەحمەدی کۆر». شاگردەکانم چوار کوڕی برایمئاغا بوون و بریتی بوون لە «کاک مستەفا»، «کاک موعتەسیم»، «کاک سمکۆ»، «کاک کەریم» و «گوڵاوی‌ئاغا»ی براچکۆلەی «برایمئاغا» کە لاوێکی بە سەروسمێڵ و نەخوێندەوار بوو.

لە ماوەی دوو ساڵاندا، هەموویانم گەیاندە پۆلی شەشی سەرەتایی و ئیتر دەبوو لە شار بچنە قوتابخانەکانی ڕەسمی. گوڵاوی‌ئاغاش سەوادی خوێندن و نووسینی پەیدا کرد و دەستی لە خوێندن هەڵگرت. «مستەفا» بوو بە دیپلۆم و بە گەنجی ماڵئاوایی لە ژین کرد. «موعتەسیم» لیسانسی وەرگرت و ئەویش هەروەتر. «سمکۆ» و «کەریم» چوونە زانکۆی ئەفسەری و «سمکۆ» هەتا دەرەجەی «سەرهەنگ»ی ڕۆیی و لە شۆرشی گەلانی ئێراندا وڵاتی بەجێهێشت و ئێستا لە ئوورووپایە و «کەریم» بوو بە «سەرگورد» و هاتەوە هەرێم و بوو بە فەرماندەی لکێک لە هێزەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستان، کە بەداخەوە لە تێکهەڵچوونێکی حیزب و دەوڵەت لە لای بانە شەهید کرا، (رووحی شاد بێ).

## سووتمانێکی دڵتەزێن لە ژیانمدا

لە ساڵی ١٣٢٩، کردەوەی پشکنین و پرسیاری حکوومەت لە دێهاتدا هەر نەپسابۆوە و بەو ناوانەی کە باو ببوو، کەسانی پێشینەداریان لە مەڵبەندی «مەهاباد» و «موکریان»دا، هەر لە ژێر چاوەدێری و لێگەڕاندا بوون و ئەو ترس و لەرزەش لە دڵ و دەروونی ئەو جۆرە کەسانەدا هەر دەگەڕا.

ڕۆژێکی ژاندەرمە دێنە گوندی «عەنبار» و ماڵان دەگەڕێن. لەچی؟ لە کێ؟ کەس نازانێ. ژنێکی هاوسایە هاوار بۆ دایکم دێنێ و دەڵێ سەیزادە ئەوە ژاندەرمان ماڵان دەپشکنن و ئێستا دەگەنە ماڵی ئێوە. دایکیشم دەزانێ دەربەدەری و نەحەساوەییم لەسەر شێعر و نووسراوە و هۆنراوەی کوردییە و لە نێو دەفتەر و سیپارەی هۆنراوە و بیرەوەرییەکانمدا، وێنەی پێشەوا و شەهیدەکانی تری مەیدانی چوارچرای مەهابادیشی تێدا بوو. دایکم لە تاوان بە پەلە دەیانهێنێ و هەموویان لە گڕەمەشقەڵانی تەندوورەکە داوێ. گڕ زمانە دەکێشێ و ژاندەرمە دەگەنە ماڵێ، بەڵان لە چڕەدووکەڵ زیاتر چییان وەدەس ناکەوێ و دەڕۆنە دەرێ. لە مەزرا بووم، کە هاتمەوە ماڵێ، دایکم حاڵەکەی بۆ گێڕامەوە و کوتی: ڕۆڵە دەرەتانم نەمابوو، لە وەی زیاتر کە لە تەندووریان باوێم چارە نەدەکرا و لە دوای ئەو هەموو خۆ حاشاردان و خۆشارەوەکێیە، دە گیروگازیان دەکەوتی.

زۆر نارەحەت بووم، کوتم: دایە دەزانم وایە، بەڵان ئەمنت لە تەندوورەکە خستووە، ژیانی من سووتاوە. حەبەسابووم، سڕ ببووم، سارد ببوومەوە، وەک خەلەوخەرمان سووتاوی پیرەوەرزی پاییزیی دەستەشکاو مام. ئەوەی گوتبووم و بە بیرەوەری نووسیبووم بە وێنەکانەوە لەدەس چووبوون. لە کوێوە دەس پێبکەمەوە هەتا دەگەمەوە وێ؟ زەوق و شەوقی گوتن و نووسینم نەمابوو. بۆ چەند ساڵان کڕوکپ، دەمقووچاو و لێودوڕواو، دەمڕوانی و نەمدەدی! دەمدیت و تێگەیشتنم نەمابوو. لە خۆم، لە ژیان و لە گوندی «عەنبار»، لە «ئەحمەدی کۆر»، لەو خانووبەرەی بەرهەمی بیر و باوەڕ و ئارمان و ئیدەی تێدا سووتابوو و ئاور تێبەردرابوو، بێزارم و وەڕەزە بووم. ئەگەرچی باری بەڕێچوونم باش بوو، لە بەرهەمی کشتوکاڵ و مووچەی میرزا، بە باشی ژیانی خاوخێزانم پێکدەهات، زەحمەتی دەرسی منداڵانیشم نەمابوو. بەڵان ئەو سووتمانە شوێنەوارێکی ئەنگێوەی لە سەر ڕووح و ڕەوانم دانابوو کە هیچ خۆشییەک نەیدەتوانی برینی بیر و هۆشم سارێژ بکا و بمخاتەوە سەر ڕێبازی ئاسایی ژیان و ژیانەوە. ئاوات و ئامانج، هومێد و هیوا، «هەژار» و «هێمن» و «خاڵەمین» کە هەموویان پێکەوە شانبەشانی یەک سەریان لە نێو سیپە و سەنگەری سیپارەکانم هێنابووە دەرێ، لە کام نوێژگەی خودای دیکە، لە

ڕواڵەت و دیمەن‌دا بۆم دێنەوە قالبی هەڵبەست و هۆنراوە؟ هەر ئەو هاوار و بانگی نەسرەوتووی دەروونە بوو کە ویستم بە خۆگوێزتنەوە لە قەتڵگای بێچووەخوراوەکانم، ئاواڵە دۆڕاوەکانم، هێدی‌بوونەوەیەکی باوێمە دڵ و دەروونی خۆم؟

## بازێکی دیکە و ڕازێکی دیکەی ژیان

هاوینی ساڵی ١٣٣٢، بە ویست و خواستی «برایم‌ئاغای قارەمانی» ماڵم چۆوە «گۆلێ». وەک لە پێش‌دا ئاماژەم پێکرد، برایم‌ئاغای قارەمانی کە لە ساڵەکانی دوایی‌دا چوو بۆ حەج و بوو بە حاجی، سەرۆک و ڕدێن‌سپی تایفەی خۆی بوو. سەوادی نەبوو و کاروباری ئیداری و بنەماڵەی زۆر بوو و نیازی بە میرزا و نووسەرێکی ئاشنا بە کاری ئیداری و ڕەوشتی عێلاتی بوو و ئەو تایبەتمەندییەی لە من‌دا دیبۆوە. منیش کە ئەو حاڵەتی ناڕەحەتی ڕووحییەم تێ‌دا بەدی هاتبوو، دەمهەویست جێگۆڕکێ بە ماڵ و حاڵی خۆم بکەم. ئەوە بوو کە ماڵم هاتەوە ئەو گوندە و لە «گۆلێ» نیشتەجێ بووم.

## ئاڵوگۆڕێک لە باری سیاسی لە ئێران‌دا

لە زستانی ساڵی ١٣٣٢ بەولاوە، لە گوندەکان، نێوانی ئاغاوات و ڕعێتەکان، ڕووی لە ناکۆکی کردبوو. چونکە سەرۆک‌وەزیری کات «دوکتور موسەددیق»، دەیهەویست لە دێهاتان ئاڵوگۆڕێکی دنیاپەسند لە نێوان مالیک و ڕعێتەکان پێک‌بێنێ و داب‌ونەریتی شێوەی «فیئۆداڵیتە»، هێندێک بە قازانجی وەرزێڕ سەروبن بکا. لە پێکهێنان و پیادەکردنی ئەم بەرنامە و چەند لایەنی دیکە، لەگەڵ شای وەخت (محەممەدڕەزاشا)، زۆر بە ئاشکرا، جیاوازی سەلیقەیان پەیدا کردبوو. وادەبێ و وانابێ لە نێوان «شا» و «دوکتور موسەددیق» لە گوندان‌دا، کاری کردبووە سەر بیروڕای مالیک و ڕعێتەکان. لە دێهاتان پیاوە بەزیپک و لێهاتووەکانی وەرزێڕ، لایەنگری بیروڕای سەرۆک‌وەزیر بوون. دیارە مالیک و ئاغاوات و عەشایریش قازانجیان لەوەدا بوو کە وەدوای فەرمانی «شا» بکەون. ئاکامی ئەو دوو شێوە خواست و ویستە، کاری کردبووە سەر نێوانی مالیک (خاوەن‌زەوی) و وەرزێڕان. ئەم چەلەحان و دووبەرەکییە لە نێوان شا و

سەرۆک‌وەزیر درێژەی پەیدا کرد هەتا گەیشتنە مانگی گەلاوێژی ١٣٣٢ کە کێشایە هەڵاتنی شا لە دەس دوکتور موسەددیق بەرەو بەغدا و لە وێڕا بەرەو ئورووپا.

کاتێک ئامریکا و ئینگلیس و ئورووپا زانیان دوکتور موسەددیق بە قەولی پەتوو پەنایە، بەرگری لە هۆمەنی کۆمۆنیستەکان پێ ناکرێ و چەند وەزیرێکی هۆگر بە کۆمۆنیستەکانیشی لە کابینەیدا هەیە، وەپەلە کەوتن و بەرنامەی «کۆدەتایان» بە دەستی «سپەهبود زاهیدی» داڕشت. دوای سێ ڕۆژ کە کۆدتا سەریگرت، «شا»یان ناردەوە بۆ ئێران و موسەددیقیش گیرا. جا وەرە ئەوجار (کەرێ بێنە و مەعرەکەی بارکە)! داموودەزگای لایەنگرانی شا کەوتنە پالاوتنی (پاکسازی) ئەرتەش لە تاقمەکانی کۆمۆنیستی و «چەپ»ی و خاوێن‌کردنەوەی پایەگای شا و ئیداران لە لایەنگرانی «مارکسیست» و «کۆمۆنیست» و دژبەرانی ڕژێمی شا؛ لە دێهاتیش‌دا ئاغاوات و مالیکەکان بەربوونە تالان‌کردن و دەرکردن و کوشتنی ڕەعێتە سەربزێوەکانی لایەنگری موسەددیق، کە پێیان وادەبێ خەرج و پیتاک و بێگاری لە گوندان‌دا نامێنێ. هەتا نیزیکەی مانگ‌ونیوێک، بگرەوبەردە و هەڵێهەڵێ، لە دێهاتان‌دا سێبەری شوومی خۆی خستبووە سەر ڕەعێتە ڕۆژڕەشەکان (ئەودەم وشەی ڕەعێت، پێناسی گوندنشینەکان بوو). خودا دەزانێ لەو بگرەوبەردانەدا چەند ماڵ تالان کران و ئاوارە و دەربەدەری هەندەران بوون. نامهەوێ کای کۆن بە با کەم و دەوران تازە کەمەوە.

بۆخۆم لەو ڕۆژە ڕەشانەدا لە لای ئاغایان بووم و بۆ وان جێگای بیر و باوەڕ. توانیم هەر لە گوندی «گۆلێ» لە زۆر شالاوی توندی هێندێک لە ئاغایان بۆ سەر خەڵکی بێ‌تاوان بەرگری بکەم. لەو بزووتنەوە خۆخۆرییەدا بە پێویست نازانم ناوی کەسانێک بێنمە گۆڕێ و نامهەوێ وەک مامۆستا هەژار بیکەمە «چێشتی مجێور» و بروێش و پرپۆڵە تێکهەڵشێلم و تفی سەرەوژوور هەر ڕووی خۆمان دەگرێتەوە. ئاخر کەشکیش برای دۆیە و بیور دەسکی لە دار نەبێ، کوا دار دەبڕێ؟ ئێمە بازی ڕاوچین، پێمان دەگرن و بۆخۆیان دەیخۆن! زۆرێک لەو ئاغاواتانە کە تۆڵە و تەماح بەرچاوی گرتبوون، ئاوڕێکیان لە ڕابردوو نەدەداوە کە ئەندامی کۆمەڵەی (ژ.ک) بوون و بەدەسنوێژەوە سوێندیان بە قورئان خواردبوو کە پێکەوە برابن، هەڵمەت بۆ ماڵی یەکتر نەبەن و خەیانەت بە خۆیان

و نیشتمانەکەیان نەکەن، بەڵان بەداخەوە وەک مەلا «مارف کۆکەیی» دەڵێ:

کوردیش چ کورد، میللەتی خۆخۆرە پێکەوە
بۆ گیان وماڵی یەکتر، سمکۆڵ دەکەن لە خۆڵ

## ئەو هەڵکەوتە جێگەی سەرنجە:

کوتیان لەو کاتەدا دەستەیەک گۆپاڵبەدەست و تفەنگلەشان، شاڵاویان بۆ ماڵە مامۆستا «شێخعیزەددین» بردووە. ڕامکردە لای «برایمئاغای قارەمانی» و پێمگوت: پێت وایە جوانە، دەستەیەک چوماغبەدەست هەڵکەنە ماڵی سەید و عالمێکی وا کە ئەوڕۆکە لە کوردستاندا هاوتای نیە؟ کوتی: «نەمزانیوە. خێرا برۆ با بچین بزانین کێن و بۆ چوون.» بە پەلە گەیشتینە پێش دەرکی ماڵی مامۆستا. دەستەیەک کوتەکبەدەستی ئاغاواتەکانی لاوە، دەورەی حەسارەکەیان دابوو. سەیزادەی ژنی مامۆستا بە درێژایی حەسارەکەیان شاڵەکەی لە سەر عەرزی ڕاخستبوو کە وەسەر شاڵەکە نەپەڕن. برایمئاغای قارەمانی پیاوێکی دیندار و لە سەرەخۆ و بەئابڕوو بوو، کە ئەو دیمەنەی دی ناڕەحەت بوو و چوماغبەدەستی تەکاندەوە و چووینە ژووری. مامۆستا لە گۆشەیەکی دیوەکە هەڵتروشکابوو و سەیزادەی خێزانیشی لە پەنای خزیبوو. برایمئاغا چووە پێشێ و دەستی ماچ کرد و کوتی: «سەید، ئەمن لە خەجاڵەتی جەددی تۆ لە قیامەتێ چۆن سەر هەڵێنم؟ بە جەددی تۆ ئەو بەرنامەی لە «گۆلێ» پیادە دەکرێ، کار و ویستی من نیە.» مامۆستا فرمێسکی هاتە خوارێ و هیچی نەگوت. ئەمن هەڵمدایە و کوتم: ئاغای قارەمانی، دەبوو ڕێ نەدەی خزموخێش ڕعێتەکانی خۆیان بە کوتانەوەی ڕعێتی «گۆلێ» تۆ چاوترسێن کەن؟ لەپاشان برایمئاغا زۆری دڵخۆشی مامۆستای داوە و داوای لێبووردنی کرد و هاتینەدەرێ. بۆ ماوەیەک ئەو پاکسازی و گەسکلێدانە درێژەی هەبوو. لە دوایە بە بانگکردنی عەشایر و عێلات بۆ تاران و «شەڕەفیابی بە حوزووری ئەعلاحەزرەت» مەسەلە تەواو بوو کە خۆشم لەگەڵ ئاغای قارەمانی و سەرانی عەشایر لەو شەڕەفیابییە بەشدار بووم!

لە پاییزی ساڵی ١٣٣٤، گەورەترین زەربەی ڕووحیم بە وەفاتی دایکم (سەیزادە تەمینە) وێکەوت. دایکێکی دڵسۆز کە لە دوای وەفاتی بابم، جێی بابێتی بۆ منداڵەکانی گرتەوە و نەیهێشت دەس لە خوێندن هەڵگرم. مەرگی دایکم

هێندەی غەم و پەژارە لە ڕووحی منda بەدی هێنا کە تووشی نەخۆشییەکی توند بووم. دوای چاوپێکەوتنی دوکتوران لە شاری تەورێز، دیاری کرا کە گیرۆدەی نەخۆشی «سیل» یان «دەردەباریکە» بووم. ئاخرمانگی پاییزی ١٣٣٥، بۆ ماوەی پێنج مانگان، بە ژن و ماڵەوە لە میاندواوێ مامەوە و لە ژێر چاوەدێری دوکتوراندا بووم و دوای ئەو ماوەیە دوکتوری موعالیجم، چوار مانگی دیکەی حەسانەوە و موداوا بۆ نووسیم. لەم حاڵەدا زۆر لەگەڵ کاروباری ڕۆژگار سەروساختم نەمابوو. ئاواتم بوو لە کوێرەدێیەکی دوور لە غەوغای شار و دێ، بە کشتوکاڵەوە بخافڵێم و هێندە تێڕوانی جەفا و جەوری زۆردار لەگەڵ بێزۆران نەبم. کردەوەی ناحەزی مالیکان لەگەڵ ڕعێتی بێنەوا لە ساڵی ١٣٣٢، لە پێش چاوم نەدەکووژاوە. زاتی ئاغا و مالیکم ناخۆش دەویست. ئەوەی ناحەزی دەکردن و لە گەل و کۆمەڵی جوێ دەکردنەوە، ڕژێمی نەگریسی «ئەربابوڕعێتی» بوو کە بۆ ڕاگرتنی سەرۆکی خۆیان گوێلەمستی دوژمنانی نەتەوەی کورد بوون. ئەگەر برایمئاغای قارەمانی سەرمەشقی ئینسانییەت بوو، نەیدەتوانی لە نێو عێل و تایفەی خۆیدا لەو ڕایەڵوپۆیە جودا بێ و خەسڵەتی ئینسانی خۆی بپارێزێ!؟ هەر ئەو بەراوەرد و تێبینییە بوو لە بەهاری ساڵی ١٣٣٨، ماڵم لە گوندی «گۆلێ» باری کرد و چوومە گوندێکی چکۆلەی چەند ماڵی بە ناوی «شۆڕیجە» لای ئاغایەکی ڕعێتنوێن و مالیکێکی ئارام و بێوەی. مەزرا و کێڵگەیەکی زۆروزەوەندی لە بەر دەست نام کە هومێدی حەسانەوەم لە داهاتووی خۆم لە دڵی گەڕا کە بێدەنگ لەو کوێرەدێیە ئارامەدا، هێزی خۆم داوێمە سەر کشتوکاڵ و دەکەومەوە سەر بیروڕای ڕابردووی خۆم.

دەڵێن تەقدیر تەگبیران بەتاڵ دەکاتەوە. بە تەما نەبووم خۆم لەگەڵ کاری دنیا و جەماوەر تێکەڵ کەمەوە، ئیتر بێدەنگی و گۆشەگیری و تەنیایی! بەڵان چارەنووس داوایەکی دیکەی لە چارمم نووسیبوو. ڕۆژێک یەکێک لە ناسیاوەکانی گوندی «عەنبار» لێم وەژوورکەوت. دوای سڵاو و بەخێرهێنان کوتی: «میرزامحەممەد، کوڕەکانی «برایمئاغای عەلیار» کە قوتابی دەرسی تۆ بوون و پێت خوێندوون و چوونە دەبیرستان، بۆ تەعتیلات هاتوونەوە و زانیویانە ماڵت لەم کوێرەدێیەیە، بابیان هەڵپێچاوە کە ماڵت بێتەوە

«عەنبار»ێ. ئێستاش برایمئاغا ئەمنی ناردووە و دەڵێ خانووبەرەی چاک و مەزرای زەوەندی بە دڵی خۆی دەدەمێ، ماڵی بێتەوە عەنبارێ، ئەگەریش نەیەتەوە کورەکان زۆر بیریان کردووە، بۆ چەند ڕۆژێکی بێتە ئێرە و سەریان بدا.» کوتم کاکە گیان ماڵهاتنەوە بۆ «عەنبار» نا، بەڵان بۆ دیداری کورە شاگردەکانم، بەڵێ.

پاش نانی نیوەڕۆ لەگەڵی چوومە گوندی عەنبار. چوار کوڕی وریا و زرینگ (وەک لە پێشدا باسم کردن) و تێگەیشتوو کە مامۆستایان دی، گەشانەوە. بە گاڵتە و شۆخی دەورانی خوێندنیان، بردیانمە وەتاغێ و دەورەیان دام کە: «دەبێ ماڵت بێتەوە عەنبارێ. بە شادی ئەوەی کە ئێمە دەورەی دەبیرستانمان تەواو کردووە و بەرەو دانیشگا دەڕۆین، خانووبەرە و مەزرامان بۆ حازر کردووی و نایەڵین بچییەوە کوێرەدێی «شۆڕیجە».

لەو کاتەدا برایمئاغا هاتە وەتاغێ و لە کۆڕی گەرمی مامۆستا و قوتابییان خۆشحاڵ بوو و کوتی: «میرزا، کوڕان هەڵیانپێچاوم و داوات دەکەنەوە.» کوتم: برایمئاغا، دوو تیپ لەبەر چاوان نە دەگۆڕێن و نە گەورە دەبن، یەک ئەولاد و ئەوی دیکەش شاگردە. ئەو کوڕانە لەبەر چاوم نەگۆڕاون، ئەمنیش وەک تۆ خۆشم دەوێن، هەر ئەو هەستەش ئەمنی هێناوەتە لایان.

برایمئاغا کوتی: «دەمەوێ لێگەڕێی بنێرم ماڵەکەت بارکەن و بیهێننەوە «عەنبار»ێ. کوڕەکان هەموویان چاکەی مامۆستای خۆیان لە چاویدا بوو، بێئەوەی پرسم پێبکەن یان پێبزانم، خانووبەرە و جێی جووت و مەزرایان بۆ دیاری کردبووم. سبەینێ لە پێش ئەوەیدا لە خەو هەستم، وەسیلەی کۆچیان ناردبوو، بۆ پاش نیوەڕۆیە، ماڵوکۆچیان گەیاندە «عەنبار»ێ و لە شوێنی دیاریکراودا دامەزران و لە هاوینی ساڵی ١٣٣٨ی هەتاوی بوومە دانیشتووی یەکجاری «عەنبار» و جیرانی «ئەحمەدی کوێر» کە ئێستاش خانوو و زەوی و زەراعەتی خۆم و براکانم هەر لەو گوندەیە. لە گۆواری سروە، ژمارە ٥٨ی ساڵی ١٣٧٨ لە ژێر سەردێڕی «گورگەئاوڕێک لە ژیان و...» چونکە ویستوومە هێندێک لە باسەکان سەرپەڕێن بکەم و بە سەریان بکشێم. ڕەنگە زۆر جێگەی لەگەڵ ئەم بیرەوەرییە دووروودرێژە یەکتر نەگرنەوە، بۆ ئاگاداری دەڵێم ئەوەی کە دەبێ لە بەرچاو بگیرێ، ئەم بیرەوەرییەیە کە بە بەرینی و پێراگەیشتنی سووچ و

... ژیانەکەم هاتۆتە گۆڕێ و دێتە بەر چاوان.

... ئاماژەوێ لە سەر کەسانێک، یان چین و توێژێکی تایبەتی بدوێم یان ... گۆڕێ. باسی من لێرەدا لەسەر داب و نەریتی نەگریسی ڕژێمی «... ڕەعیێتی»یە. ڕژێمێکی لە دەورانی زەماندا دووبەرەکی و دووپۆیی لە نێو ... کۆمەڵدا پێکهێنابوو، ئیرادە و ویست و فەرمانی ناڕەوای دەهاویشتە سەر ... سنووی چینێکی ژێردەست کە پایە و بناغەی دووبەرەکی و یەکنەگرتوویی کۆمەڵی پێکدەهێنا کە بەداخەوە نە بۆخۆیان بە ئاوات گەیشتن و نە کۆمەڵ و نەتەوەیان پێگەیاند.

## لە هەل و هەلکەوتان‌دا دەگۆڕام، بەڵان نەدەدۆڕام

هەر ئەو بەرجەوەندە بۆتە هۆی سەرهەڵدانی کردەوەی ناحەز و نالەباری ئاغاواتەکان و ناکۆکی نێو خۆیان و نەتەوە، کاتێک شای ئێران لە ڕووی بەرنامەڕێژی ئامریکاوە، بۆ بەرگری لە شاڵاوی مەرامی کۆمۆنیستی شەش‌بەندی «ئینقلابی سپی» ڕاگەیاند کە سەربەندەکەی «هەڵوەشانی ڕژێمی ئەرباب و ڕعێتی» بوو؛ هەرچەند ئەمن و بنەماڵەکەم لە لایەن مالیک و عەشایر و ئاغاواتەکانی هەرێم جێی ڕێز و حورمەت بووین، بەڵان هەستی ئینسانی و دەروونی ئاگا بە سەر خوو و خدەی ناحەزی ئەو ڕژێمەدا ڕێی نەدا بێدەنگ دانیشم و لەو هەلکەوتە بۆ ڕووخاندنی بناغە و پایەیەکی کە لە دەورانی کۆن و نوێ‌دا هۆی ڕاوەستاوی ڕیشە و ڕەچەڵەی شایەتی بوو لە ئێران‌دا، لەو پێشهاتە کەلک وەرنەگرم. نەیەمە مەیدان و هەست و تەکانی نەتەوەی دیل و نوستوو بۆ ژیانێکی ئازاد و سەربەخۆ وەخەبەر نەهێنم و ڕاینەتلەکێنم. دەشمزانی ئەو بزووتنەوەیە تەکانێکی گرینگ و بناغەڕووخێنە و دەبێتە بەربەرەکانییەکی چینایەتی، بۆ هەموو چین و توێژەکان و ئەو هەویرە ئاو زۆر هەڵدەگرێ. ئایا لە هەلومەرجی ئاوادا ویژدانی بەخەبەر ئەمن دەبەخشێ کە حەق پێشێل بکەم و ناڕەوایی ببووژێنمەوە؟ ئەمنێکی کە ساڵەها بینەری ڕەوشتی ناحەز و کردەوەی ڕژێمی «ئەرباب و ڕعێتی» بووم کە لە هەموو دەورانێک بە دژی مەسڵەحەتی خۆیان و نەتەوەی خۆیان بزووتوونەوە، چۆن هەستی خۆم و خەڵک بۆ ... ئەو کۆت و زنجیرەی کە مەسڵەحەتی نیزامی شایەتی لە دەست و پێی

نەتەوەی کوردی هاڵاندووە، خۆم و نەتەوە هان نەدەم؟ دەمزانی تیپی دەرەبەگ بەربەرەکانی لەگەڵ دامەزران و پێشکەوتی یاسای «ئیسلاحاتی ئەرزی» دەکەن. دەمزانی ئەو مەیدانە بۆ یەکخستنی چینی چەوساوە بە ناوی ڕعێت، پیاوی خوێندەوار و نەترس و بەئەزموونی دەوێ. دەمزانی لەو بەربەرەکانییەدا گیروگرفتی زۆرم بۆ دێتە پێش، وەک بۆم هاتە پێش.

ئەمانە بیروڕا و پێشبینییەک بوون کە بە دڵی خۆمدا دەهاتن و لای هاوڕازەکان نەمدەدرکاندن. جا بۆیە بە ئیمان و باوەڕی توندەوە چوومە مەیدانی بەربەرەکانی و لایەنگری لە ویستی ڕعێت و گوندنشینەکانی مەڵبەندی موکریان و گەورکایەتی و محاڵ و تەواوی نیشتەجێیەکانی هەموو ناوچە و کەسانی خوێندەوار و ڕووناکبیری دێهاتی هاوکار و پشتیوانم بوون.

ڕەوتی ژیانی من لەو هەلومەرجە تازەدا، ڕەنگێکی دیکەی بەخۆوە گرت. ئاغاوات و گەورەمالیکەکان ئەمنیان لە ڕێنوێنی و پێشڕەوی دێهاتییەکان بە فەتایەکی گەورە دەزانی. چون ئەمن هەموو کوڕە خوێندەوار و پیاوە کارلەدەسهاتووەکانی دێهاتم بۆ داواکردنی مافی خۆیان بە پێی «ئیسلاحاتی ئەرزی» ئامادەی هاوکاری کردبوو. ئەوانەی لە بەرابەری بەڕێوەچوونی ئەو یاسایە کەڵەوەکێشییان دەکرد، لە دەزگای ئیجرای قانوونی ئیسلاحاتی ئەرزیدا دەناسران. ئاغاوات و گەورەمالیکەکانیش لە کاری خۆیان خافڵ نەبوون. زۆر جاران بە بەرتیل و دمچەورانە بە دەس مەئموورە بەرتیلخۆرەکان بەگرتنیان دەداین. دێهاتییەکان هورووژمیان بۆ ئیدارەکان دەهێنا و نەجاتیان دەداین و دووبارە لەگەڵ هاوکارە دڵسۆز و نەبەزەکەم، «میرزا محەممەدی ئەفخەمی» دەهاتینەوە مەیدانی بەربەرەکانی. ئەم بگرەوبەردە لە نێوان ڕعێت و ئەرباب بوو بە هۆی ئەوە کە ئەمن و محەممەدی ئەفخەمی بە ناوی ڕێنوێنێکی دڵسۆز و فیداکار لە ناوچەدا بناسرێین. ئێمەش هیچ هەل و دەرفەتێکمان لە دەس نەدەدا و لە ڕێی ئازادی « دێهقان (وەرزێر)ی ئازاد»، هەتا سنووری لەخۆبووردن ڕۆیشتبووین و پاشەکشەمان لە ڕەوت و ڕێبازی قانوونی نەدەکرد و هیچ هەل و هەلکەوتێکی پێویستمان لە دەس نەدەدا.

بۆ خوێندەواری بێچووە دێهاتییەکان لە «سپای دانیش» کەلکمان وەردەگرت و لە زۆربەی گوندەکانی ناوچە، قوتابخانەمان پێ ساز دەکردن. هێزی

خوێندەواری و زانستمان گەیاندە نێو گوندنشینان و بە شوێن دانانی کلاسی سەرەتایی بۆ منداڵان، هەوڵمان دەدا کلاسی بەربەرەکانی لەگەڵ نەخوێندەواری گەورەساڵەکان بەرینە دێهاتان و «دێهقانی ئازاد» باسەواد بکەین.

لە گوندی «داشبەند» و «عەنبار» بە یارمەتی و هاوکاری ئاوەدانی، دوو قوتابخانەمان ساز کرد و وەتاغی «سپای دانیش» لە کەناری دروست کرا کە ئەو قوتابخانە کاتێک «دوکتور خانلەری» وەزیری فەرهەنگ هات بۆ مەهاباد لەسەر داوای ئێمە هاتە «عەنبار» و «داشبەند» و ئەو دوو قوتابخانەی لەو دوو گوندە بە ناوی کۆمەگ و هاوکاری دێهاتییەکان کردەوە. لە ماوەی چەند ساڵێک لە درێژەی بەڕێوەبردنی قانوونی «ئیسلاحاتی زەوی»دا، یەکەمین «شیرکەتی تەعاونی ڕووستایی» لە «داشبەند» کرایەوە و بە دووی ئەواندا «خانەی ئینساف» دامەزرا و «دێهقانی ئازاد» لە بەرەکەتی هەڵوەشانی ڕژێمی ئەرباب و ڕعێتی و هەستی سەربەخۆیی لە کار و پیشەی خۆیاندا، بەرەو ژیانێکی خۆشتر، هەنگاوهاوێژ بوون.

## هاتنی سەرۆکوەزیر و هەیئەتی دەوڵەت بۆ مەهاباد

لە یادم نەماوە ساڵی چەند بوو کە سەرۆکوەزیری وەخت «ئاغای عەبباس هووەیدا» و چەند وەزیری دیکە هاتنە مەهاباد هەتا بزانن پێشکەوتی قانوونی ئیسلاحاتی ئەرزی لەو ناوچە کوردنشینەدا کە مەڵبەندێکی «فیئۆدالی» و «ملووکوتتەوایفی» بوو، چۆنە و چ شوێنەوارێکی شایەسەندی لەم هەرێمەدا هێناوەتە دی؟

فەرمانداری مەهاباد جەماوەرێکی زۆری لە ئاغاوات و مالیکەکان و تیپی عێل و عەشایر و وەرزێرانی سەربەخۆ (دێهقانی ئازاد)، لە «باشگای ئەفسەران»ی مەهاباد کۆ کردبۆوە و بە ناوی نوێنەری دێهقان و کەشاوەرزان، ئەمن و «محەممەدی ئەفخەمی» بۆ بەشداری لەو کۆبوونەوەدا بانگ کرابووین. بە ڕێنوێنی فەرماندار بۆ سالۆنی باشگا، عەشایر و مالیک و ئەربابەکان چوونە سالۆنێ کە سەندەڵی تێدا ڕیز کرابوون و ڕووبەڕووی جەماوەرەکە جێگەی هەیئەتی دەوڵەت دیاری کرابوو. نیزیکەی چوار هەتا پێنجهەزار کەس دێهقان و کەشاوەرزیش لە شەقامی پێش باشگا ڕاوەستابوون و تەنیا من و ئەفخەمی بە

نوێنەری وەرزێران لە کۆڕی دووسەدنەفەری ئاغا و مالیکان حوزوورمان هەبوو.

هێندەی پێنەچوو کە سەرۆکوەزیر (هووەیدا) و وەزیرەکانی هاوڕێی و بەرپرسانی ئازەربایجانی ڕۆژئاوا هاتنە ژووری هۆدەکە و جێگای دیاریکراویان. بەر لە وەی کە سەرۆکوەزیر بچێ دانیشێ، خوداڵێخۆشبوو عەللامە مامۆستا «مەلا حوسێنی مەجدی» چووە پێشێ و بەخێرهاتنی کرد و چەند هۆنراوەیەکی لە کاغەزێکی چکۆلەدا نووسیبوو، بۆی خوێندەوە کە سەرۆکوەزیر زۆری پێخۆش بوو و سپاسی لێکرد و چون جەماوەرەکە بەپێوە ڕاوەستابوون، چوو لە جێی خۆی دانیشت و هەیئەتی دەوڵەت و بەرپرسانی هەرێمیش لە دەوری دانیشتن. وێنەگر و هەواڵنووسان وە جموجۆڵ کەوتن. ئاغای سەرۆکوەزیر دوای ئەحواڵپرسی ڕووی لە ئاغاوات و مالیکەکان کرد و کوتی: «جەلەسەی هەیئەتی دەوڵەت ڕەسمییە، ئاغایان ئەگەر قسە و باس و ئیشکالێکیان هەیە بیڵێن هەتا لێیبدوێین و لێیبکۆڵینەوە.» یەکێک لەو کەسانەی کە بەرەوڕووی ئاغای هووەیدا دانیشتبوو کوتی: «جەناب ئاغای سەرۆکوەزیر، ئێمە قسەی شاردراوە و مەحرەمانەمان هەیە.» ئاغای هووەیدا کوتی: «جەلەسەکەمان بە تەواوی خۆماڵییە و غەوارەمان تێدا نیە.» دوایە کوتی: «ئاها، ئاغایانی وێنەگر و هەواڵنووسەکان بەتەواوی بچنە دەرێ.» ئەوان چوونە دەر و سەرۆکوەزیر کوتی: «ئاغایان، ئێستا وەک لە تارانێ جەلەسەی هەیئەتی دەوڵەتم پێکهێنابێ لەگەڵ بەرپرسانی مەحەللی ئاوایە، فەرموون ئەوجار فەرمایشێکتان هەیە بیفەرموون. ئەمن بۆیە لەگەڵ هەیئەتی دەوڵەت وەدەرکەوتووم، هەتا پێداویستییەکانی خەڵکی ناوچە بزانم، دەی فەرموون.» بێدەنگی و خامۆشییەکی چاوەڕواننەکراو جەلەسەکەی داگرت! ئەولیا و بەرپرسانی کاروباری ناوچە هەموو قوشقی و لە خۆیان دڕدۆنگ بوون. دیسان دوای ماوەیەک وتەکەیان دووپات کردەوە و کوتیان قوربان قسەی خسووسیمان هەیە و دەمانهەوێ مەحرەمانە عەرزت بکەین.

ئەمن فیتووی خۆم ناسیەوە، حاڵی بووم کە قسەی مەحرەمانەی هێندێکان، سەروگوێ کوتانەوەی من و «ئەفخەمی»یە. بۆ ئەوەی سەرۆکوەزیر تووڕە نەبێ، لە جێی خۆم هەستام و کوتم: جەنابی سەرۆکوەزیر، ئێمە دوو نەفەر لەم نێوەدا نوێنەری وەرزێران و دێقانەکانین، ڕەنگە ئاغایان ئێمە بە نامەحرەم

بزانن!؟ کاتێک ئەومم گوت، سەرۆکوەزیر لە بن عەینەکەوە بە وردی تەماشای کردین، یەکدوو جار سەری لەقاند. لە دوایە ڕووی لە فەرماندار کرد کە بەپێوە ڕاوەستابوو و کوتی: «هەر ئەم دوو نەفەرە لەم کۆڕەدا دێهقانن؟» فەرماندار ڕەنگی هێنا و برد و کوتی: بەڵێ قوربان، پۆلی وەرزێڕ و کەشاوەرز زۆرن و هەموو لە خەیابانێ ڕاوەستاون. ئاغای هووەیدا پێی وانەبوو کۆڕی حازر هەموو مالیک و ئەربابن، لای وابوو کۆڕەکە زۆربەیان وەرزێڕن و هەر ئەوەش بوو بە هۆی لابردنی فەرماندار. لەدوایە ئاغای هووەیدا کوتی: «زۆرباشە ئێوە بچنە دەرێ. لەدوایە بەجوێ لەگەڵ ئێوە دانیشتنم دەبێ.»

ئەوە شتێکی ئاشکرا بوو، مالیک و ئاغاواتەکان لە نۆبەی خۆیاندا زۆریان لە سەروسەکوتی ئێمە دوو نەفەر دابوو و بە ناوی ئینسانی ماجەراجوو و کۆمۆنیست و کەجڕەو ناودێر کرابووین. بەڵان تەواوی بەرپرسەکانی هەرێم، ئەمن و ئەفخەمییان بە کەسانێکی موباریز و دڵسۆز و فیداکار لە ڕێی پێشکەوتی یاسای «ئیسلاحاتی ئەرزی» و هەڵوەشانی ڕژێمی ئەرباب و ڕعێتی دەناسی و بە هەیئەتی دەوڵەتیان ناساندبووین و ئەو هەڵکەوتە بە قازانجی ئەم دوو نەفەرەمان تەواو بوو کە لە زۆر پێشهاتی دیکەدا فریامان کەوت. دوای چوونە دەری ئێمە، هێندێک لە مالیک و ئاغایان دەڵێن قوربان ئێمە قسەی مەحرەمانە دەخوازین و هەرکەسێک نیازی خۆی ڕادەگەیەنێ. لە پاش نیزیکەی سەعاتێک وەخت، جەلەسە تەواو بوو و ئاغایان دەهاتنەدەرێ بەڵان بە لچ و لێوی شۆڕ و نێوچاوانی تێکچڕژاو.

دیار بوو بەشی زۆری مالیک و ئاغاواتەکان لە کردەوەی مەحرەمانەخوازی تووڕە و تۆسن بوون کە ببوو بە هۆی ڕوو نەکردنی پێداویستی و داخوازەکانیان. دوای نیو سەعاتێک، ئەفسەرێک هات و کوتی: ئاغایانی نووری و ئەفخەمی کوان؟ ئاغای سەرۆکوەزیر دەفەرمێ بێنە ژووری جەلەسەکە.

کاتێک چووینە ژوورێ دیاربوو ڕواڵەتی هۆدەکەیان جەموجوور کردبوو. ئاغای هووەیدا لە پێشەوە دانیشتبوو و لە پێش میزەکەی دوو سەندەڵییان دانابوو و وەزیر و کاربەدەستانی هەرێم لە پشت سەرییەوە بەڕیز دانیشتبوون. ئاغای هووەیدا کە ئێمەی دی، هەستا و لە پشت میزەکەیەوە دەستی لە دەستی

ناین و بۆخۆی دانیشت و کوتی: «فەرموون دانیشن.» لەدوایە زۆر بە ڕێز و ئێحترامەوە کوتی: «لە خزمەتتان‌دام، هەرچی دەڵێن گوێتان بۆ ڕادەدێرم.» کوتم: جەنابی سەرۆک‌وەزیر، ئیجازەم بدە لە پێش‌دا خۆم بناسێنم، ئەمن محەممەدی نووری ئێستام و محەممەدی عەتری گلۆلانی، شاعیر و هۆنەری دەورانی پێشەوا قازی محەممەدی خودالێخۆشبووم کە ڕۆژنامەکانی ئەوکات هۆنراوەکانی من لە خۆیان‌دا دەنوێنن. دەزانم ئەو پرسیارە بۆ جەنابتان دێتە پێشێ کە عەتری گلۆلانی ئەوکات، چۆن بۆتە سەربازی گیانبازی «ئینقلابی سپی» و «شا و مەردوم» و ئەم گۆڕانکارییە بە پیرۆز دەزانێ؟ جەنابی سەرۆک‌وەزیر، ئەگەر پێشەوا قازی محەممەدیش مابا، ئەوڕۆ وەک ئێمە، ئەم گۆڕانکارییەی بە پیرۆز دەزانی و بزووتنەوەی ئەویش بۆ ئازادی ئینسان لە ژێر دەستی ئینسانان‌دا بوو. شا، ئەوڕۆکە شای ئێرانە کە پایەی سەریری سەلتەنەتی لە سەر شانی ۲۲میلیۆن دێهقان و کەشاوەرزی ئازادی ئێرانە، نەک پشتیوانی جەماوەرێکی کە دیتت ئەم هۆدەیان پڕ نەکردبوو. ئێستا نیزیکە بە ۲۰هەزار نەفەر دێهقان و کەشاوەرز لە خەیابانێ، بەپیر سەرۆک‌وەزیری «شا»وە هاتوون. جەنابی سەرۆک‌وەزیر، نەتەوەی کوردی ئاریاییی‌نەژاد بە ئازادی خۆیان، بە ئینقلابی سپی شایان دیتۆتەوە، ئەوڕۆ ئێمە هەست دەکەین وڵاتەکەمان خاوەنی هەیە و زوڵم بەرەو ڕەوینە.

زانیم وتەکانم بە باشی کاری کردۆتە سەر بیر و هەستی کۆڕی گوێگر. ئاغای هووەیدا سەری دەلەقاند و مژی لە «پیپ»ەکەی دەدا و گوێدێری وتەکانی بێ درۆ و ڕیام بوو. ئاوڕی داوە بۆ لای شانی چەپی و ڕوانییە «تیمسار سەییادیان» ڕەئیسی سازمانی ئەمنیەتی ئوستان. تیمسار لە جێی خۆی هەستا سەر پێ و کوتی: «جەنابی سەرۆک‌وەزیر، ئاغای نووری بێ‌پێچانەوە ڕاستی گوت. هەردوو ڕووکاری ژیانی لە ڕابردوو و ئێستادا ڕاستە و وەک دەڵێ هەر ئاوایە. جەنابی سەرۆک‌وەزیر، لە مەڵبەندی کوردنشینی ئازەربایجانی ڕۆژئاوادا، پێشکەوتن و سەرکەوتنی «ئینقلابی شا و مەردوم» زۆر پێناوداری لەخۆبردوویی و فیداکاری ئەم دووانەیە (نووری و ئەفخەمی). مەڵبەندی کوردنشینی ئەم هەرێمە، دیاردەی شیوەی «ملووکوتتەوایفی»یە و عەشیرەتگەری و عێل‌بەگییە. لە زۆر جێیان

ڕعێتی جاران نەیاندەوێرا لەو مافەی کە گۆڕانکاری پێی ڕەوا دیبوون، بەهرەی لێوەرگرن، لەخۆبردووی ئەم دووانە لەم ناوچەیە و لەم هەلومەرجەدا شتێکی شاراوە نیە.» تیمسار کۆتایی بە شیکردنەوەی وتارەکەی خۆی دا و دانیشتەوە.

دیار بوو سەرۆکوەزیر بەو سەفەر سیاسییەی کردبووی، دەیهەویست بارودۆخی پێشکەوتی گۆڕانکاری زەویوزار لە هەرێمی کوردنشیندا هەڵسەنگێنێ و هەستی عەشایر و ئاغاواتەکان لە بەرابەر پێشکەوتی گۆڕانکاریدا بەراوەرد بکا، کە لەم کۆڕەدا دەستی ئاغاوات و مالیکەکانی خوێندەوە و تێگەیشت ئەگەر بەربەرەکانی توندی وەرزێڕ و دێهقانان نەبایە، مالیکەکان نەدەچوونە ژێر باری ئەو گەلاڵەیە. ئاغای هووەیدا لە شیکردنەوەی تیمسار «سەییادییان» حاڵی بوو کە ئەمن لە وزەمدا بووە کە بە سەر شێوەی کاری ئەرباب و ڕعێتدا زاڵ بم و لەو ڕێیەدا حەز و ناحەزی پێشکەوتی گۆڕانکاریم لە هەرێمدا تاقی کردۆتەوە. لە دوایە ئاغای سەرۆکوەزیر لە سەرەخۆ پرسیاری کرد: «ئێستا چەوتی و چەوێڵی کاری دێنشینەکان یانی کەشاوەرز و مالیکەکان لە چیدا دەبینی و چۆنی تێدەگەی؟» کوتم: جەنابی سەرۆکوەزیر، هەروەکوو لە کۆڕەکەدا هاتۆتە دەستت، دێهقان هەروەک ڕابردوو لە کاری بێگاری و بێنەوبەرەدا، لە ژێر فەرمانی مالیکەکاندا نەماون و ئەو نافەرمانییە بۆتە هۆی کینە و ڕقەبەری لە دێیەکاندا. دیارە مالیک بۆ تەمبێکردنی دێهقانە سەربزێوەکان، دێنێ چەند باقە وێنجە لە حەساری خۆیدا ئاور تێبەردەدا و دەیکاتە هەراوهەڵلا و چەند نەفەر دەست و پێوەندی خۆی دەکاتە شاهیدی جورم و «سووڕەتجەلەسە»یان پێ مۆر دەکا و دەیباتە پاسگای ژاندەرمەری و چەند مەئمووران لەگەڵ خۆی دێنێ و شوێنەواری تاوانیش دیارە؟! چەند جووتیاری نەبەز وەپێش خۆیان دەدەن و ڕاپێچی دادگایان دەکەن. مووچە و مەزرا و زەراعەتی گیراوەکان لە دێدا بۆ ماوەیەکی زۆر بێخاوەن دەمێنێتەوە. هۆی ژیانی ئەوجۆرە کەشاوەرزە تەشقەڵەپێکراوانە لە مەزرایە لە ناو دەچێ و تەفروتونا دەبێ. گەواهی وتەکەم جەنابی «سەرهەنگ نازمی» ڕەئیس گورهانی ژاندەرمەرییە. هەر ئەمساڵ چەند جار هاواری کەشاوەرزی گیراوم هێناوەتە لای تۆ کە فکرێکی بۆ حاڵ و خەرمان و تفاقی لەبەینچووی ئەو بێگوناهانە بکە.

«سەرهەنگ نازمی» کوتی: بەڵێ جەنابی سەرۆکوەزیر، ئەو

تەشقەڵەوتوشقەڵە لە دێهاتدا زۆرە، بۆخۆم چەند جاران لەگەڵ ئاغای نووری چووینە لای ڕەئیسی دادگوستەری و ئەو پێشهاتانەمان شیکردۆتەوە، بەڵان کەم وابووە نەتیجەی لێوەرگیرابێ. ڕەئیسی دادگوستەری کوتی جەنابی سەرۆکوەزیر، زۆربەی کاتی دادگا سەرفی کێشە و دەعوای بەینی مالیک و زاریعانە.» ئەمن هەڵمدایە و کوتم: جەنابی سەرۆکوەزیر، ناکرێ لە دێهاتە گەورەکاندا، لە کەسانی جێی باوەڕی دادگوستەری، مەرجەعێک پێکبێ، هەتا ئەو جۆرە کێشانە هەر لە دێیەکەدا پێی ڕابگەن و داوای مفت و پووچکە، ڕوو نەکاتە دادگای شارەکان؟ ئاغای هووەیدا ڕووی کردە وەزیری «کیشوەر» (نێوخۆ) و کوتی: جەنابی وەزیر، ئەم باسەش یادداشت بکە کە لە جەلەسەی داهاتووی دەوڵەتدا، شیبکرێتەوە.

دیار بوو لە پێش ئەوەیدا بێینە لای سەرۆکوەزیر، ڕەئیسی ساواک (دەزگای پاراستن)ی مەهاباد و ورمێ، بزووتنەوەی بەجێی من و ئەفخەمی و بەربەرەکانی ئێمەی بۆ پێشکەوتی یاسای گۆڕانکاری لە ناوچەدا تێگەیاندبوو و بەچاکی شیکردبووینەوە.

ئاغای هووەیدا بۆ ئەوەی باشتر نەزم و نەبزی ناوچەی بێتە دەستی، دنەی دەداین بۆ ڕاگەیاندنی چلۆنیەتی هەرێمی کوردنشین زیاتر بدوێین، لە پەستا مژی لە «پیپ»ەکەی دەدا هەتا ڕووکاری حەز و ناحەزی ژیانی تازەی دێهقانی ئازادی بۆ ڕوونکەینەوە. هەر بۆ ئەوەش بوو لەگەڵ وەزیرەکان، بە هەرێمی کوردنشیندا دەگەڕان. لە دوایە پرسی: «پێم بڵێن دێهقان و کەشاوەرزەکان، بە چی یان لە چی دیکە ناڕەحەت یان دڵخۆشن؟» کوتم: جەنابی سەرۆکوەزیر، شتێکی دی کە بۆ کەشاوەرزان جێی سەرنجە، یاسای تازەی «حەقابە»یە (ئەو پووڵ و پارەی لە بەرامبەر کەلک وەرگرتن لە ئاو دەدرێ بە دەوڵەت). «حەقابە» یانی چی؟ ئاوی مەزرای ئێمە، یان کانیاو و کەرێزە، یان چۆماوە. کانی و چۆماو بەرەکەتێکی خوداییین. ئەو دێهاتانەی لە ئاوی چۆم کەلک وەردەگرن، بە خەرجی خۆیان، بەند هەڵدەبەستن، جۆگەکان جۆماڵ دەکەن، میراو دیاری دەکەن و دەوڵەت لەو بارەوە هیچ خەرجێکی وەئەستۆ نەگرتووە. ئەگەر وایە «حەقاو»ەی دەوڵەتی یانی چی؟ دەڵێن دەوڵەت جێگای ئەربابی گرتۆتەوە.

ئاغای هووەیدا ڕووی لە وەزیری «نیروو» (وزە) کرد و کوتی: جوابی بدەوە.

وەزیر کوتی: «ئاغای نووری بۆخۆت ساڵانە چەنـدە «حەقابـە» دەدەی؟» کـوتم: ئاغای وەزیر، بەپێی جووتێک «گا»جووت»، «حەقابە»ی داوا دەکەن. ئەمن سـێ جووتم «گا»ی بەرنیری هەیە، ساڵێ ١٥تمەن «حەقابە»یان دەوێ؟ بەڵان جەنابی وەزیر ئەتۆ لە بەرابەر ١٥تمەنی کە وەریـدەگری، لـە خـەرجوبـەرجی بەنـد و جۆماڵ و حەقی «میراو»دا، کام هاوکاریـت هەیـە؟ بۆیـە کەشـاوەرز و دێهقـان دەڵێن، دەوڵەت جێگای ئەربابی جارانی لـە ئێمـە گرتۆتـەوە! سـەرۆکوەزیـر کوتی: «ئاغای وەزیر ڕاست دەکەن، ئەگەر ئێوە بە ناوی «حـەقاوە» شـتێکی لـە کەشاوەرزان وەردەگرن، دەبێ لە بەرامبەردا هاوکاری یـان بەهرەدانەوەیـەکتان هەبێ بۆیان.

وتووێژ درێژەی بوو، کوتم: جەنابی سەرۆکوەزیر، مەسەلەیەکی دیکە کـە بۆ دەوڵەت دەبێ جێگەی سەرنج بێ، مەسەلەی عولـەما و ڕووحانییـانی وڵاتی ئێمەیە کە سـوننین. ئـەوان وەک ڕووحانییـانی شـیعە، لـە ڕێـی وەرگـرتنی «خومس» و «بەشی ئیمام» و «کۆڕی تازییە» و تازیەداری، ژیانیان تێروتەسـەل نیە. عولەمای ئێمە لە شار و دێهاتان ئەرکی دینی خۆیان بـەجێ دێـنن. جـاران ئاغاوات و دانیشتووی دێیەکان، شتێکیان بە ناوی «زەکات» و «بەرات» دەدانـێ، لەوەتی گۆڕانکاری هاتۆتە گـۆڕێ، «خـۆشنـشینەکان» کـە نەبوونـە خـاوەن زەویوزار، شانیان لە ژێر باری چاکە و دانی مووچە بە مـەلاکان ترازانـدووە و زیاتری ئەو ڕووحانییانەی کە بەشیان بە شوغڵی کەشاوەرزییەوە نیە، ژیانێکی نالەباریان هەیە و لە ئاستی بژیو و بەڕێوەچوون، بێجوابن؟ ئاغـای هووەیـدا دیار بوو ئەو مەسەلەی پێ گرینـگ بـوو، لـە پـشت شووشـەی چاویلکەیـەوە تەماشایەکی دانیشتووانی دەوروبەری خۆی کرد و یەکدوو جاران سەری لەقانـد و لە دوایە ڕووی لە وەزیری «کیشوەر» کـرد و کـوتی: «جـەنابی وەزیـر، ئـەم مەسەلەیە بنووسە هەتا لە بیر نەچێ.»

لە بارەی کەمبوونی «سپای دانیش» (مامۆستایانی قوتابخانە کـە لـە بـری سەربازی دوو ساڵ دەرسیان دەکوتەوە) بۆ دێهاتە دوورەدەستەکان باس کـرا کـە ناکرێ هەموویان لێرەدا بێنمە گۆڕێ، بـەڵان ئەوانـەی بـە زوویـی بەرهـەمیان وەدەرکەوت، بریتی بوون لە: ١ـ دانانی «خانـەهای ئینـساف» لـە گونـدەکان.

٢ـ بۆ عولەما و ڕووحانییەکانی شار و دێ، بە ناوی موڕەوویجی مەزەبی، مووچەیەکیان تەرخان کرد. ٣ـ هەتا یەکدوو ساڵان، وەزارەتی «نیروو» لە داواکردنی «حەقابە» پاشەکشەی کرد.

دوای ئەو باسە زۆرانە کە زیاتر لە سەعاتێکی کێشا، ئاغای هووەیدا بە مانای دوایی‌هاتنی دانیشتنەکە، هەستا پێ و لە پشت میزەکەی هاتە دەرێ و تۆقەی لەگەڵ کردین و لە دوایە ڕووی لە کاربەدەستانی هەرێم کرد و کوتی: «ئاغایانی کاربەدەست، ئاگاداری و چاوەدێری لەم دوو ئاغایەم لە ئێوە دەوێ.» و ئێمەش پاش ئەو باس‌وخواسە هاتینە دەرێ. نیزیک ١٥ هەتا ٢٠ هەزارکەس دێهقان و کەشاوەرز، لە شەقامێ چاوەڕێی هاتنەدەری ئێمە بوون. کاتێک هەیئەتی دەوڵەت هاتنەدەرێ، بوو بە هووریاکێشان و چەپڵەڕێزان. لە نێو هەراوهوریای دێهقانان‌دا هووەیدا و وەرزێڕانی تر، سواری ماشێنەکانیان بوون و بە دەست‌هەڵێنان ماڵاوایی‌یان کرد و بەرەو سەقز و کوردستان ڕۆیشتن و ئێمەش هەرکەس بۆ جێی خۆی بڵاو بووینەوە.

ئەمن لە کاتێکا ئەم بیرەوەرییە دەنووسمەوە، نە شا ماوە، نە سەریری سەلتەنەت، نە ئاغا و فێئۆداڵ، نە عەشیرەت و نە عێل‌بەگی. لە جێگای ئەم هەموو هەڵوەریوە لە خاک‌خزیوانە، عەبا و عەمامە و نەعلەین شین بوونەوە و سەریان هێناوەتە دەرێ!

## خانەهای ئینساف و ئەنجومەنی ئەیالەتی و ویلایەتی

دوای چەند مانگ لە هاتنی «هووەیدا» بە وڵاتدا، سەرەتای بەرهەمی هاتنەکەیان، یەک بە دووی یەک‌دا پیادە کران و بە قازانجی دانیشتووانی هەرێم وەدی‌دەهاتن، وەکوو: ١ـ دانانی خانەهای ئینساف لە دێهات. ٢ـ شیرکەتەکانی «تەعاونی ڕووستایی». ٣ـ پەرەپێدانی ڕواڵەتی «سپاهیانی دانیش» لە گوندە دوورەدەستەکان. ٤ـ بەشدارکردنی مامۆستایانی ئایینی شار و دێهاتی ناوچە لە مووچە و بەراتێک بە ناوی «موڕەوویجینی مەزەبی و دینی». ٥ـ پیادەکردنی یاسای «ئەنجومەنی ئەیالەتی و ویلایەتی» لە سەرانسەری ئێران.

بەکورتی: لە ساڵەکانی ١٣٤٠ هەتا ١٣٥٣، ئەوی پێداویست بوو بۆ خزمەت بە چینی دێهقاتی ئازاد و دێهاتی ژیان‌دۆڕاو، پێی‌دا ڕۆیشتم و وەئەستۆم گرت و

وەک: ١ـ ڕەئیسی خانەهای ئینساف. ٢ـ مودیرعامیلی شیرکەتی «تەعاونی ڕووستایی». ٣ـ بوون بە ئەندامی «ئەنجومەنی ویلایەتی». ٤ـ ئەندامی «ئەنجومەنی ئەیالەتی». ئەوانەم هەموو بە سەنگەرێک دەزانی کە کەلکی لێوەرگرم بۆ ڕووناککردنەوەی بیر و باوەڕی چینی بەشخوراوی دێهاتییەکان و دیفاع لە داوای ڕەوای کۆمەڵ و تێبینی ڕۆژ و دوارۆژی خۆیان.

## نەخۆشی دەردەباریکە و نەخۆشخانەی «بووعەلی» تاران

نەحەسانەوە و بزووتنەوەی بێپسانەوە بە شوێن ئامانج و ئاواتی کۆمەڵ و نیشتمان و هیوا و هومێدی پێکنەهاتووی کۆن و نوێ لە دەور و سووڕی ژیانمدا، بوو بە هۆی نەخۆشی دەردەباریکە کە لە لەش و گیانی بێقەرارم دیسان سەری هەڵداوە.

لە لایەن ئەنجومەنی ویلایەتی و ئەیالەتی، بۆ نەخۆشخانەی «مەسلوولان»ی «بووعەلی» تاران بەڕێ کرام.بۆ ماوەی شەش مانگان لە ژێر چاوەدێری دوکتوراندا مامەوە. لەو ماوەیەدا ڕۆژەکانی هەینی، «سوارەی ئێلخانیزادە» لاوی خۆشڕاوێژی شیرینکەلام دەهاتە لام و لە حەوشەی ئەو نەخۆشخانەیە کە جێیەکی زۆر دڵگر و گوڵپشکوێن بوو، پێکەوە لە سەر کورسییەکانی ڕیزکراو لە بن دار و نێو گوڵاندا دادەنیشتین.باسمان لە شێعر و شاعیری و هۆنراوەی کۆن و نوێ دەکرد و زۆرجاران هۆنراوەی لێوەردەگرتم و لە بەرنامە ڕێکوپێکەکانی خۆی لە «ڕادیۆ تاران» دەیخوێندەوە و پێیدەگوتم: «ئەتۆ شاعیری خەمانی.» کە هێندێک لەم وتووێژانە لە گۆواری «سروە»دا بلاوکرابۆوە و لە نووسراوەی «تاپۆ و بوومەلێڵ»دا باسێکی تێدایە. هەژار، هێمن، ئاوات، سوارە، هەموو بارگە و بنەی خۆیان پێچاوە و ڕۆیین. لەو کاروانە هەر ئەمن بەجێماوم کە بەتەنیا ماومەوە بێبەرگ و بێبەر!

لە دووهەمین مانگی زستانی ساڵی ١٣٥٣، بڕێک باری نەخۆشییەکەم سووک ببوو و بە ئیجازەی دوکتورانی چارەگەر لە بیمارستان وەدەرکەوتم و هاتمەوە ماڵی خۆم لە «عەنبار»ێ. ئاغاواتەکان و دێهقانی ئازاد، ئەهوەن ببوونەوە و وا دەرکەوت کە هەرکام بە بەشی دیاریکراوی خۆی ڕازییە، کە ئەوە ئاواتی هەرەگرینگی من بوو.

لە بەهاری ساڵی ۱۳۵۳، چۆمی «سیمینە» (تەتەهوو) بە سێلاو و لافاوێکی بێوێنە، هەموو ماڵ و خانووبەرە و مەزرا و داچێندراوە بەراوەکانی ڕامالی و وەبەر خۆی دا و لە بەینی برد. خانووبەرەی من بەشی زۆری تێکتەپی و تێکڕووخا و ناچار بووم خانوویەک لە بۆکان بەکرێ بگرم و براکانم لە دێ خەریکی سازکردنەوەی خانووبەرە و مەزرا و داچێندراو لە نوێ بن و ئەمن ناچار بووم ماڵ و منداڵ بگوێزمەوە و ببمە بۆکانی.

## چۆن بوومە نوێنەری مەجلیسی شووڕای میللی و بۆ بووم؟

لە ساڵی ١٣٥٤ کە هەڵبژاردنی بیستوچوارەمین دەورەی مەجلیسی شووڕای کات ڕاگەیەندرا، گوندنشینان و زۆربەی خەڵکی شاری دەورەیان دام کە دەبێ لە ئەندامەتی ئەنجومەنی ئەیالەتی و ویلایەتی دەس هەڵگری و لەو هەڵبژاردنەدا بەشداری بکەی هەتا لەوە زیاتر مافی ئێمە بە دەست نوێنەرانی داسەپێن بە فیڕۆ نەچێ.

دەبێ ئەوەش بڵێم کە دوای تێکچوونی ڕژێمی «ئەرباب و ڕەعێتی» سێ دەورە هەڵبژاردن پیادە کرابوو. دوو دەورەیان یەکێک بە ناوی «دوکتور مەدەنی» خەڵکی ورمێ بوو و چون لە پێشدا ڕەئیسی «ئیسلاحاتی ئەرزی» بوو و بۆ پێشکەوتی بەرنامەی «ئینقلابی سپی» بە سوودی دێهقانەکان جووڵابۆوە، لە دەورەی نوێنەری خۆیدا زیانی بۆ جووتیاران نەبوو، بەڵام لە دەورەی ۲۳دا کۆنەفێئۆداڵێکی هەرێم کە ساڵەها بوو لە تاران دەژیا و پلە و پشتیوان و لاگیرێکی زۆری پەیدا کردبوو و هەروەها خۆی بە حیزبی «ئێرانی نەوین»ەوە چەسپاندبوو، لە ئاکامدا کرایە تاقانە کاندیدا لە دەورەی ۲۳ی «مەجلیسی شووڕای میللی» و لەو هەڵبژاردنەدا بوو بە نوێنەری داسەپاوی شاری بۆکان و دەوروبەر. بەداخەوە چون بۆخۆی فێئۆداڵ بوو، وابەستەگی زۆری لەگەڵ چینی ئاغاوات و مالیکان هەبوو، بەو هۆیە دەردەسەر و گیروگرفتی زۆری لە دێهاتی ناوچەدا بۆ وەرزێران و جووتیاران بەدیهێنا و ناڵە و دادی «دێهقانی ئازاد»ی بە کردەوەی ناحەزی خۆی بەرز کردبۆوە.

هەر ئەو بیرەوەرییە تاڵە بوو کە دێنشینەکانی هەرێم و بەشێکی زۆری خەڵکی بۆکانی هان دا و هەڵیانپێچام کە دەبێ لە ئەنجومەنی ئەیالەتی و

ویلایەتی بکشێیەوە و لەم دەورە هەڵبژاردنەدا بەشدار بی و خۆت کاندیدا بکەی.

ئەمن کە ١٤ ساڵ بوو مەسڵەحەت و قازانجی خۆم لە پێناوی گۆڕانکاری و پێداویستی چینی دێهقان و کەشاوەرز نابوو، لێرەشدا وەک قوماربازی پاکدۆڕاو نەمتوانی پێداویستی ئەوان بە نابەدڵیش بێ، پێکنەهێنم. لە حاڵێکیدا چوومە بەر مەیدانێ، کە پشتیوانی ماڵی یان پاڵپشتێکی دەوڵەتیم نەبوو کە پاڵی وێدەم. لە ویست و خواست و ئیرادەی دێهقان و کەشاوەرز و رووناکبیرانی شاری زیاتر، پشتیوانێکم نەبوو کە لێی پشتئەستوور بم و پاڵی وێدەم و لە بەرامبەریشدا مەئموورە بەرتیلخۆرەکانی هەرێم، گوێلەمستی کۆنە ئەربابەکان و فەرمانبەری وان بوون. بەڵان داوای پەیتاپەیتای دێهقان و کەشاوەرزان و نووسینی تۆماری دووروودرێژی وان بۆ ئیدارات و مقامات، ئەمنی بەزاند و پێملیان کرم، چوومە پێشێ و هاوبەشیم لەو هەڵبژاردنە کرد و کوتم ئەوی ماویشمە، با بیدۆڕێنم.

لە بۆکان پەنجا نەفەر خۆیان ناودێر کردبوو. لەو دەوران لە ئێراندا سێ مەرحەلەیی بوو. هەیئەتی ئەنجومەنی شار لە پەنجا نەفەر، پازدە کەسی هەڵدەبژارد کە ناوی ئەو پازدە کەسەی بۆ ناوەندی ئوستان (ورمێ) دەنارد. ئوستانیش لەو ١٥ کەسە، پێنج نەفەری هەڵدەبژارد کە بۆ کۆمیسیۆنی پێڕاگەیشتنی «حیزبی ئێرانی نەوین» دەنێردران و حیزبیش لەو پێنج کەسە، سێی هەڵدەبژارد. هەر بەو شێوەیە کاتێک بە ڕادیۆ ناوی ئەو سێ کەسەیان ڕاگەیاند، یەکیان «محەممەدی نووری»، یەکیان ئاغای «پەرتەوییان» شارەداری بۆکان و ئەوی تریش «ڕەشیدی ئازادیخوا» دەبیری دەبیرستانەکانی بۆکان بوو. لە جەریانی دەنگداندا فێڵ و تەڵەکەی مەئموورانی ئینتیخاباتی کە سەر بە ڕەقیبەکانم بوون، نەیتوانی بە سەر ویست و خواستی کەشاوەرز و دێهقانەکاندا سەرکەوێ و ئیرادەی خودا و خواستی «دێهقانانی ئازادکراو» ئەمنیان خستە گەڕی چارەنووسێکی نادیار و تاڵوتوون.

## کاتێک بوومە نوێنەر چیم کرد و چیم بە سەر هات

لێرەدا دەبێ بڵێم لە ماوەی نیزیک بە چوار ساڵ کە لە «مەجلیسی شووڕای میللی»دا بووم، نەگۆڕام و نەدۆڕام. هەر ئەو دێهاتییە بووم کە لەوێرا هاتبووم.

لە لای من ئەوی گرینگ بوو، جێبەجێکردنی پێداویست و نیازی ئەو کەشاوەرز و وەرزێڕانە بوو کە ئەو ئەرکەیان هاویشتبووە سەر ئەستۆی من و خۆم بە نوێنەری چینێک دەزانی کە ژیان و گیانیان داوای حەسانەوە و حاوانەوەی دەکرد. بیرم لەوە دەکردەوە کاتێک بچمەوە هەرێم و بمهەوێ سەری ئەو خەڵکانە بدەم کە لە ڕێی سەرکەوتنی ئاواتیان، لە بەختکردنی ماڵ و گیان کۆتاییان نەکردووە، داخوا بۆ ئاورگی سارد و سڕی وان، دەستەچیلەی من چ دەبێ؟ خۆ من لە دەروونی خۆمدا پەیمانی وەفاداریم لەگەڵ ئەو چینە بەستووە. هەر ئەوە بوو کە ئەو شەرت و پەیمانەم نەدۆڕاند و هەتا دوایین هەنگاو هەر وا بە وەفاداری مامەوە و هەر ئەو ئیرادە و ئیمانە بوو کاتێک شا سەرنخوون بوو و «شۆڕشی گەلانی ئێران» سەرکەوت، هاتمەوە ناو چین و توێژەکەی خۆم و لە پەنایاندا حەسامەوە و ئێستاش هەر لەو پەناگایەدایە کە هەناسەی ساردی دوایین ڕۆژەکانی ژیانم دێنم و دەبەم.

بەداخەوە ئەگەر کوردەواری باغچۆڵەی گوڵ و گوڵزاریش بێ، بێ دڕکوداڵ نابێ. هەر لەو کاتەدا بوو دەستەیەک لەو دڕوودالانەی کە لاڕێ ببوون و دوژمنایەتی و کین و قاڕی کۆنیان لە دڵدا بوو، هاتن گرتیانم و بە ناوی نوێنەری دەورانی «تاغووت» تەحویلی «دادگای ئینقلاب»ی مەهابادیان دام. لە ڕۆژی پرسیاری دادگا، جووتیار و وەرزێڕێکی زۆری ناوچە ڕژانە دادگای ئینقلابی مەهاباد و نیشانیان دا کە ئەمن نوێنەری چینی کەشاوەرز و دێهاتییەکانی ناوچەی بۆکان بووم نە پشتبەستوو بە تاغووت و دەستیان لە خۆپێشاندان هەڵنەگرت هەتا ئازادیان کردم و هاتمە دەرێ.

## دوای هەڵبژاردن و یەکەمین دیدار لەگەڵ هەیئەتی دەوڵەتی ئاغای «جەمشیدی ئاموزگار» وەزیری «کیشوەر» (نێوخۆ)

ئاغای جەمشیدی ئاموزگار وەزیری کیشوەر (نێوخۆ)، دوای تەواوبوونی هەڵبژاردن، نوێنەرانی تازەی بۆ یەکترناسین لەگەڵ هەیئەتی دەوڵەت، بۆ تاران و لە هۆتێل «ئازادی» بانگهێشت کرد. نوێنەرانی تازە لە کاتی دیاریکراو، چووینە ئەو هۆتێلە و لە هۆدەیەکی زۆر گەورە سەرۆکوەزیر ئاغای «هووەیدا» و هەیئەتی دەوڵەت ڕاوەستابوون. ئاغای هووەیدا لە پێشەوە ڕاوەستابوو و

لەگەڵ یەکیەکی نوێنەرانی تازە کە خۆیان دەناساند دەستی دەداوە. لەبیرمە لەگەڵ «سالار جاف» کە پێشینەی ئاشنایەتیمان بوو، پێکەوە ڕاوەستابووین. دیاربوو ئاغای هووەیدا دەیناسی، چون کە خۆی ناساند، ئاغای هووەیدا لێی پرسی: «دەی سالار لەگەڵ مەردووخ چت کرد؟» ـ مەردووخ لە پاوە و هەورامان، دیاریکراوی هەڵبژاردن بوو ـ سالار کوتی: «قوربان، قووتم دا.» هووەیدا پێکەنی و کوتی: «بۆیە زگت هەستاوە.» سالار برێک زگزەلام بوو. ((«سالاری جاف» لە عێلی «جاف»ی ئێراق بوو کە لە کۆدتای ئێراقدا «داودبەگی جاف» لە ئێراق هەڵات و هاتە ئێران و شای ئێران پەنای دان و چاکەی زۆر لەگەڵ کردن. داودبەگ کوڕی زۆر بوون، کوڕی گەورەی «سەرداربەگ» بوو کە زاوای خوداڵێخۆشبوو پێشەوای نەمر «قازی محەممەد» بوو و لە دەرباردا کاری دەکرد. «سالار»یش برای چکۆلەی بوو کە بوو بە نوێنەری «پاوە» و «هەورامان» و لە شۆڕشی گەلانی ئێراندا گرتیان و ئیعدامیان کرد. «سەردار» دەگیر نەکەوت و چووە ئێراق. نۆبە گەیشتە من، کوتم: «محەممەدی نووری» نوێنەری بۆکان. هووەیدا پێکەنی و کوتی: «دەتناسم و چاکیشت دەناسم. مەگەر لە مەهاباد پێکەوە دیدارمان نەبوو؟ لەبیرم نەچۆتەوە لە دیدارەکەت بەهرەم وەرگرت.» دوای تەواوبوونی خۆناساندن، بۆ نانی نیوەڕۆیە میوانداریبیان لێکردین. ماوەیەک مابوو هەتا کردنەوەی مەجلیسی دەورەی ٢٤. دوای نەهار و دابی خوداحافیزی، یەکێک لە جێنشینانی وەزیران هاتە پێشێ و کوتی: «ئاغای نووری، جەنابی ئاغای «جەمشیدی ئاموزگار» وەزیری کیشوەر دەفەرمێ لە پێش ئەوەیدا بچێتەوە بۆکان، بێتە لام چاوم پێیبکەوێ.» کۆڕەکە بڵاو ببوو.

لەگەڵ «سالار» هاتینە دەرێ و چووینەوە بۆ ماڵی ئەوان و چون میوانی ئەو بووم، بۆ شەوێ «سەردار»ی براشی هاتە ماڵی سالار. «سەردار» پیاوێکی ڕێکوپێک و قەڵافەت جوان و دیپلۆماتێکی زیرەک بوو و ڕێی دەکەوت زاوای پێشەوای نەمر بێ. بنەماڵەی جاف بە تەواوی هەستێکی پاک و خاوێنی نەتەوەیی و کوردایەتییان هەبوو. ئەو باسە بۆ من هاتبووە پێشێ کە ئایا «وەزیری کیشوەر» نوێنەرەکانی دیکەشی ویستووە بیانبینێ؟ سالار لای وابوو بە کەسی دیکەیان نەگوتووە، دەیگوت دەنا بە منیشیان ڕادەگەیاند. لە خۆم زۆر

درۆنگ بووم کە ئایا بۆچی لە منی دەوێ بچمە دیداری؟ ڕەنگە بەدخواز کاری خۆی لەسەر کردبم؟!

## دیدار لەگەڵ ئاغای «جەمشید ئاموزگار»

سبەینێ کە هەستاین، کاتژمێر ١٠ی بەیانی بە ماشێنی سالار چوومە وەزارەتی نێوخۆ و خۆم بە ڕەئیسی دەفتەری وەزیر ناساند. ڕەئیسی دەفتەر چووە وەتاغی وەزیر و هاتەدەر و کوتی: فەرموو و دەرکەی بۆ کردمەوە و چوومە ژوورێ و بۆ دووجارەی بوو کە ڕواڵەتی ئاغای «ئاموزگار»م دەدی. کە دیتمی زۆر بە گەرمی و ڕووخۆشی لە پشت میزەکەی هاتەدەرێ و دەستی لە دەستمنا. کورسییەک لە پێش میزەکەی خۆی بوو لەوێی دانام و بۆخۆشی چۆوە جێگای خۆی دانیشت و ئەحواڵپرسی کردم و لە چلۆنیەتی بەڕێوەچوونی هەڵبژاردن لە ناوچەدا پرسیاری کرد. پەروەندەیەکی لە پێش دەستی بوو بەرگەکانی ئەمدیوەودیو دەکرد. پێکەنی و بە جەفەنگەوە کوتی: «ئاغای نووری شیوەی هەڵبژاردنی ئەم دەورەیەت پێ چۆن بوو؟ پێتوایە هەڵبژاردنێکی ئازاد بوو یان نا؟» کوتم: جەنابی وەزیر، ئەگەر ئەو هەڵبژاردنە ئازاد نەبووایە، کوا ئەمنت لە پێش خۆت دەدی؟ ئەمنێکی نە پشتیوانی ماڵیم هەبوو نە ئیداری، تەنیا پشتیوانی من دێهقان و کەشاوەرز و دێهاتی بوون. ئەگەر هەڵبژارنێکی ئازاد نەبایە، لەکوێ حیساب لەسەر من و دێهاتییان دەکرا؟ ئاغای ئاموزگار کوتی: «بەڕاستی وایە، لە دەورانی مەشرووتەوە هەتا ئەم دەورەیە، چاوەدێری دامودەزگای کات لە هەموو هەڵبژاردنێکدا دەهاتە گۆڕێ و لە بەرچاو دەگیرا! بەڵان لەو دەورەیەدا بە فەرمانی ئەعلاحەزرەت ئیرادە و ویستی خەڵک چاوەدێری کرا و هاتە گۆڕێ نەک خواستی دامودەزگا.»

«دەبێ بۆخۆت وەبەرچاوت هاتبێ کە ١٠ڕۆژ پێش هەڵبژاردن لە هەموو ناوچەکان، سێ نەفەر نوێنەر لە تارانڕا ناردرابوون کە یەکیان لە لایەن دەربار، یەکیان لە لایەن وەزارەتی نێوخۆ و یەکیشیان بە نوێنەرایەتی وەزارەتی پاراستنەوە بەڕێکرابوون. تەنیا کاریان ئەوە بوو، لە پێش هەڵبژاردن لە شار و دێهاتان، بەراوردی بیروڕای جەماوەر بکەن، لە ئاکامدا لە هەموو ناوچەکان هەر ئەوانە هاتوونە گۆڕێ کە داخوازی گەل و کۆمەڵ بوون.

بەڵگەی ئەم تێبینییەش وەک بۆخۆت دەڵێی بوونی خۆتە لێرە و ئەگەر وا نەبووایە ویستی کۆمەڵ بەهای پێنەدرابایە، ئەتۆ بەو پێشینەی کە هەتە و بە دواتەوەیە، نەتدەتوانی سەر لە سندووق بێنییەدەرێ و ئەلێرەبی.»

لە دوای ئەم قسانە، بەرگێکی لە نێو پەروەندەکەی پێشی دەرکێشا و دایە دەستم و کوتی: «ئەوەش بەڵگەیەکە کە نیشان دەدا ئیرادەی کۆڕ و کۆمەڵ حاکم بووە نە حکوومەت.» کاتێک تەماشام کرد، دیتم لاپەڕێک لە ڕۆژنامەی ژمارە ٣ی «کوردستانە» و شێعری «یا وەتەن یا مردنم»ی منی تێدایە کە ٢٨ساڵ لەمەوبەر، لە دەورەی پێشەوای نەمر «قازی محەممەد» لە مەهاباد دەردەچوو و بلاو دەبۆوە و ناحەزترین هەڵمەتی بە ڕژێمی شایەتی تێدایە و هاندەری کۆمەڵی کوردستانە بۆ خودموختاری و سەربەخۆیی کوردستان.

کەسانێک لە نەیاران و بەرهەڵستانم ئەو ژمارەیان وەدەست هێنابوو و ناردبوویانە وەزارەتی «نێوخۆ» هەتا بیکەنە بەڵگەی نەبوونی «سەلاحییەتم» لە مەجلیسی شووڕای میللیدا. کاتێک ئەو هۆنراوەم دیت و خوێندمەوە، نازانم ڕواڵەتم چی لێهاتبوو، بەلان نە عەرز قووتی دەدام و نە هەوا هەڵیدەلووشیم، هەموو هۆی شانازیم بە خۆم تواوە. هێشتا لەو بارەوە وڵامێکم نەدابۆوە، ئاغای ئامووزگار پیاوێکی زانا و تێگەیشتوو بوو، لام وایە حاڵەتی ڕووحی منی هەست پێکرد، کوتی: «ئاغای نووری ئەوەم بۆیە نیشاندای هەتا بزانی ئەتۆ بەو پێشینەی لە دەورەی «قازی محەممەد» بووتە و هەر بە دواتەوەیە، مەودات نەدەدرا کە لە زۆرترین «دەنگی» هەرێمی خۆتان بهێنییەوە.» لە پاشان پێکەنی و کوتی: «شا ئەو دوو حیسابانە تێکەڵ ناکا، ئەوەی بۆ ئەعلاحەزرەت دێتە گۆڕێ، ویست و خواستی مەردمە، دیارە خەڵکیش ئەتۆیان ویستووە و دەنگیان بۆ داوی و کردوویانی.»

هۆنراوەکەی لێوەرگرتمەوە و لە نێو پەروەندەکەی هاویشتەوە و کوتی: «هەتا مەجلیس دەکرێتەوە، هەموو پەروەندەی هەڵبژاردن لەم وەزارەتخانە دەبێ.» کوتم: جەنابی وەزیر، کاتێک ئاغای هووەیدا هاتبوونە مەهاباد، ئەمن بە نوێنەری دێهقانان لە دیداری بەشدار بووم و ئەو پێشینەی هونەری خۆم لەو زەماندا بۆ شیکردۆتەوە. ئاغای ئامووزگار نەیهێشت ویستەکەی خۆم بەتەواوی

ڕاگەیەنم، کوتی: «ئاغای نووری، نارەحەت مەبە، ویستی من لە دیداری تۆ هەر ئەوە بوو کە بۆ خەڵکی ڕوون بکەیەوە دەورەی ٢٤ی مەجلیسی شووڕای میللی، ئازادترین هەڵبژاردنە لە دەورانی «مەشرووتییەت»ڕا هەتا ئێستا.» لە دوایە هەستا پێ و بە حورمەتەوە بەڕێی کردم. کاتێک وەدەرکەوتم و ئێستا و ڕابردووم لێکداوە، هاتمە سەر ئەو بیر و باوەڕە کە «ئیعتبارنامە»ی من لە مەجلیسدا ڕەد دەبێتەوە، بەڵان ڕەد نەکراوە و بۆ نیشاندانی هەڵبژاردنی ئازاد لە دەورەی ٢٤، ئیعتبارنامەی من زۆر بە جوانی پەسند کرا.

## دیداری ئاغای هووەیدا و داوای «ئیعتباری عیمرانی» و جیرە و مەعاش بۆ حافزانی قورئان لە بۆکان

لە دوای کردنەوەی بیست و چوارەمین دەورە، نیزیکەی دوو مانگ لە کار و کردەوەی مەجلیس تێپەڕیبوو. کەوتمە سەر ئەو بیروڕایە بچمە دیداری ئاغای هووەیدا (سەرۆکوەزیر) بەڵکوو بۆ ئاوەدانی دێهاتی دواکەوتووی ناوچەی بۆکان بە کۆمەگ و یارمەتی خۆی بە هاوارمەوە بێ. بەو هومێدەوە ڕۆژێکی چوومە کاخی سەرۆکوەزیری و داوای دیدارم کرد. ڕەئیسی دەفتەرەکەی چووە ژووری و هاتەوەدەرێ و کوتی: جەنابی سەرۆکوەزیر ئیزنی داوە، فەرموو بچۆ ژووری. لەوکاتەوە کە ئاغای هووەیدا و وەزیرەکانی هاتنە مەهابادێ و خۆم پێناساندبوو، بە باشی دەیناسیم، ئەمنی لە ناوچەی فێئۆداڵی و عێلبەگی بە لاگرێکی نەترسی گۆڕانکاری «شا» و «مەردوم» دەناسی، لای وابوو لە تێبینی و گیروگرفتی مەڵبەندی کوردنشیندا خاوەننەزەر و ڕووناکبیرێکی ئەنگێوم. پێیخۆشبوو بەتەنیا چوومە لای، زۆر بە ڕێز و ماریفەتەوە وەریگرتم. دوای هەواڵپرسی لە خۆم و کاروبارەکەم کوتی: «پێم بڵێ ویست و خواستی ناوچەی هەڵبژاردەت چیە؟» کوتم: جەنابی سەرۆکوەزیر، ئەمن نوێنەری چینوتوێژێکم بە ناوی دێهقان و گوندنشینی مەڵبەندی کوردنشین و وەک لە پێشدا عەرزم کردووی، کەموکوڕی و ناتەواوییان یەکجار زۆرە. بەشی زۆریان ئاوی لوولەکێشییان پێویستە. زۆر ئاوایی مەدرەسەیان نیە، بەرقیان نیە، خاوێنکردنەوە و جۆماڵی کاریز و بیر و چاڵاویان دەوێ، مزگەوتی نیوەڕووخاویان لە ئەستۆدا ماوە، ڕێگا و پردیان دەوێ هەتا بەرهەمی زەوی و

ئاژەڵی خۆیان بگەیەننە بازاڕ. جەنابی سەرۆکوەزیر کاتی چوونەوەم بۆ مەڵبەندی هەڵبژاردەم ناچارم بچم بۆ سەردانی ئەو گوندانە. ئایا دیاری و باربووی عیمران و ئاوەدانی من بۆ ئەو نیاز و خوازانە چیە و چ دەبێ؟ ئەمن نوێنەری شارە گەورە و ئاوەدانەکان نیم، بۆ دیداری کاری بە سلاوێک و پلاوێک ئەرکی خۆم بەجێ هێنابێ. ئاغای هووەیدا گوتی: «دەزانم ئەتۆ لە مەڵبەندی هەڵبژاردەی خۆتدا، لە نوێنەرەکانی دیکە زیاتر لە ڕێی پێشکەوتنی گۆڕانکاری «شا و مەردوم»دا هەنگاوهاوێژ بووی و بزووتنەوەی تۆ لەم ڕێیەدا، دەبێ بۆ دێهاتییەکانی مەڵبەندی خۆت بەروبۆیەکی هەبێ. ئەمن لە «بوودجە»ی ساڵی ١٣٥٤، بە جوێ نۆسەدهەزار تمەنت بۆ حەواڵەی بانکی کەشاوەرزی بۆکانێ دەکەم کە بە چاوەدێری مەئمووری عیمران و ئاوەدانی و لە ژێر نەزەری ئەنجومەنی دێدا، پێداویستەکانی زەرووری پێ دابین بکرێ، بەڵان بۆ ساڵی داهاتوو هەر نوێنەرەی یەک میلیۆن تمەنی بۆ لە حیسابی شارەکەی داوێم تا ئەوانیش لەم یاسایە کەلک وەرگرن. دەکرێ ئەتۆ لە پاییز و زستانی ئەم ساڵدا کە دەچییەوە ناوچە، بە هێندێک نیازی سەرەکی دێهاتی نیازمەند ڕابگەی.» لەدوایە پێکەنی و کوتی: «کۆنە شاعیری کورد ئەمجار لێم ڕازی دەبی؟» بە ناوی سوپاس هەستام لەجێی خۆم کە بە ڕەسمی گەورەپیاوان سپاسی بکەم و بڕۆم. لە جێی خۆی هەستا و دەستی لەگەڵ دامەوە و بەڕێی کردم و دووپاتی کردەوە و کوتی: «ئاغای نووری، لە ڕێی ئاوەدانیدا بۆ هاوکاریت ئامادەم.»

## هەوڵ و هەڵوێستی من لەو ماوەیەدا چۆن بوو و چم کرد

لەو ماوەیەدا کە بە ناوی نوێنەر لە مەجلیسی شووڕای میللیدا بووم، ئەرکی دێهاتییەکانم زۆر کەوتبووە ئەستۆ، زیاتری میوانەکان و حاجەتکارەکانی من لە مەجلیسدا دێهاتییە دەستوپێ قەڵەشیوەکانی مەڵبەندی بوون کە ئیش و کار و گرفتی خۆیان دەهێنا تاران و دەهاتنە لای من لە مەجلیس. ئەمن دوای پەزیرایی لە ڕستوورانی مەجلیسدا هەتا سنووری دەسەڵات وەدووی پێداویستی وان دەکەوتم و نیازیانم جێبەجێ دەکرد.

لە کاتی پشووی مەجلیسدا کە زۆربەی نوێنەرەکان بۆ گەشت و گەڕان دەچوونە ئورووپا و چین و ژاپۆن، ئەمن دەهاتمەوە ناوچە و دێبەدێ و مەزرا بە

مەزرا دەگەڕام، یان لە بن سێبەری دیواری مزگەوتان لەگەڵ وەرزێڕانی ئاوایییەکان دادەنیشتم و نیاز و پێداویستییەکان وەکوو قوتابخانە و لوولەکێشی و بەرق و پرد و ... بەراوەردم دەکردن. لەگەڵ مەئموورانی عیمران و ئاوەدانی پێویستییە سەرەکییەکانمان هەڵدەبژارد و هەزینە و خەرجمان بەراوەرد دەکرد و ئەندامانی ئەنجومەنی دێ دەچوون و لەو ئیعتیبارەیان وەردەگرت و بە هاوکاری و هاویاری خۆیان ئەو پرۆژانەیان پیادە دەکرد.

لەو ماوەیەدا نیزیک ۳۰ تا ۳۵ بەرنامەی کارەبا (بەرق) و لوولەکێشی و قوتابخانە و مزگەوت و پرد و جۆماڵ و خاوێنکردنەوەی کەرێزە و کانیاو لە گوندان‌دا دامەزرا و پیادە کرا. ئێستاش ئەو بەرنامانە لە گوندەکانی دەوروبەری بۆکان زەق و زیندوون و ماون و کەیخودا و ڕدێن‌سپییەکانی دێهات لەبیریانە و لەبەر چاوانە.

لە ساڵی۱۳۵٦ بەولاوە، ئاغای «هووەیدا» لە سەرۆکوەزیری لاچوو و بوو بە وەزیری «دەربار» و ئاغای «جەمشیدی ئاموزگار» بوو بە سەرۆکوەزیر. بزووتنەوەی خەڵکی ئێران دەستی پێکردبوو. ئاخوند و عولەمای «مەشهەد» و «قوم» و شارەکانی دیکە، پەیام و ڕاگەیەندراوی «خومەینی»یان بڵاودەکردەوە. هێندێک بێ لایەن بوون و هێندێک لایەنگری ئازادی و ئاسایش، بەڵان ئەمن کارم بە هەرا و هەڵڵای هیچیان نەبوو، ئەوەی بۆ من گرینگ بوو، گیروگرفتی ماڵ و ژیانی خەڵکی وڵات بوو.

## دیدار لەگەڵ ئاغای «ئاموزگار» سەرۆکوەزیری نوێ و داوایەکی تازەی من

چلۆنیەتی ژیانی عولەما و مامۆستایانی ئایینی مەڵبەندی کوردنشین بۆ من ببووە جێگای سەرنج و لێکۆڵینەوە و هێندێک گرفتی ساز کردبوو. چون هێندێکیان بە ناوی «موڕەوویجی مەزهەبی» لە مووچە و پاداشێک بەشدار بوون و هێندێکیشیان بێبەش. باشتر ئەوەیە لەم هەڵکەوتە کەلک وەرگرم و ئەم جەریانە لەگەڵ ئاغای ئاموزگار بێنمە گۆڕێ، بەڵکوو چۆنیەتی بەڕێوەچوونی مەلاکان لە ناوچەی ئێمەدا سەبارەت بە مووچە و پاداش، یەکسان و جیاوازیان نەبێ. وەختم لە سەرۆکوەزیر وەرگرت و لە کاتی دیاریکراو چوومە کاخ.

ئەمن بۆ ئاغای ئامووزگار ببوومە ڕواڵەتێکی ناسراو (وەک پێشتر باسم کرد). دوای سلاو و ئەحواڵپرسی و دابی ئاسایی کوتم: جەنابی سەرۆکوەزیر، لە کاتی سەرۆکوەزیری ئاغای هووەیدا بەشێک لە نیازەکانی مامۆستایانی ئایینی مەڵبەندی کوردنشین کە هێندێکیان بە ناوی «مورەوویجی مەزهەبی» مووچەیەکیان بۆ تەرخان کرا، ڕادەیەک لە نیازەکانیان دابین کرا، بەڵان لەو بەهرەیە هەموویان بەشدار نەبوون و زۆرێک لەو تیپە، بە قەناعەت و تەنگدەستی بەڕێ دەچن. بەپێویستی دەزانم لە هەلکەوتی زەمانی ئەمڕۆدا دەوڵەت ڕواڵەتێکی جوانتر بە عولەما و مامۆستا ئایینییەکانی مەزەبی تەسەننون وەدەرخا و ئەمر بفەرمووی تێکڕای مامۆستایانی ئایینی لە ناوچەی کوردەواری‌دا لە مافی بەرامبەر بەهرە وەرگرن.

ئاغای ئامووزگار هەناسەیەکی هەڵکێشا و کوتی: «خۆزگە مامۆستایانی ئایینی شیعەش لە بابەتەکانی دینی‌دا ئاکاریان وەک سوننییەکان بایە تا ئەمڕۆ ئێمە لەگەڵ ئەو هەمووە بێ‌سەرەوبەرییە بەرووڕوو نەبووباین.» دیاربوو لە سەر ڕەوشتی حەز و ناحەزی ئاخوندەکانی شیعە و مامۆستایانی سوننی زۆر باسی لە باغەڵی‌دابوو کە دەریانخا و وەدەری‌نەخست. لە ئاکام‌دا هاتە سەر ئەو باوەڕەی کە کوتی: «ئاغای نووری کاتێک چوویەوە ناوچە، ناوی ئەو بەشە لە مامۆستایان کە لە ڕیزی مورەوویجینی مەزهەبی‌دا نەهاتوونە گۆڕێ، بۆم بێنە هەتا دەوڵەت لە بارەی ئەوان‌دا هەنگاوی پێویست ڕەچاو بکا.» بەو قەرارەوە دوای سپاسی زۆر و خوداحافیزی هاتمە دەرێ. پاش ماوەیەک کە هاتمەوە هەرێم و نێو مامۆستایانی موکریان و ناوچەی گەورکانم نووسی و لەگەڵ خۆم هێنامەوە تاران و هەتا ئەومم جێبەجێ کرد، ئاغای ئامووزگار گۆڕا و لاچوو و ئاغای «شەریف‌ئیمامی» دەوڵەتی «ئاشتی میللی» پێکهێنا و بوو بە سەرۆکوەزیر. کاری نیوەتەواوم لە ئەستۆدا ماوە.

## دیدار لەگەڵ ئاغای «شەریف‌ئیمامی» سەرۆکوەزیری تازە

دوای چەند ڕۆژان وەختم لە ئاغای «شەریف‌ئیمامی» سەرۆکوەزیری وەخت وەرگرت و چوومە لای. لە پێش‌دا لە چلۆنیەتی بزووتنەوەی خەڵک و مامۆستایانی ئایینی ناوچەی پرسیار کرد. کوتم: ئاغای سەرۆکوەزیر باسێک

لە نێو مامۆستایانی ئایینی کورددا نیە و خەڵکیش ئارام و بێدەنگن. ئاغای «شەریفئیمامی» کوتی: «بەڕاستی مامۆستایانی ئایینی ئەهلی سوننەت جێگای شانازی و سوپاسن، بەپێچەوانەی ئاخوندەکانی شیعە کە پەرچەمی پەشێوییان هەڵکردووە و ئیرانیان کردۆتە گۆمی خوێن و عەوامونناس مەلەی تێدادەکەن.» ئاغای شەریفئیمامی دەردی زۆر بوو بیڵێ و بیکا، بەڵان بۆخۆی چون ناوی دەوڵەتی «ئاشتی میللی» هێنابووە ئاراوە، لەو بارەوە، چی کردبا و چی گوتبا کە ئینقلابی ئاغای خومەینی و لایەنگرەکانی لەگەڵی ئاشت ببنەوە، کە نەبوونەوە؟!

لیستی مامۆستایانی ئایینی وڵاتم کە نووسیبوو، دامە دەستی و کوتم: بەرنامەی ئاغای ئاموزگار ئەوە بوو کە تەواوی مامۆستایانی ئایینی کوردی ئەهلیسوننەت بە ناوی موڕەوویجینی دینی لە مووچە و پاداشی بەرامبەر بەهرەوەر بن و ئەمەش ئاماری ڕاستەقینەی وانە. زۆری سوپاس نیشان دا لە تێبینی و مەسڵەحەتئەندیشی ئاغای ئاموزگار و لیستەکەی لە پەروەندەیەکدا بەجیا هەڵگرت کە لە کاتی خۆیدا دەستووری لەسەر بدا. بەڵان ئەویش فریا نەکەوت و بۆخۆی لەسەر کار لاچوو. ئاخوند و جەماوەری ئینقیلابی ئاغای خومەینی، «ئاشتی میللی»یان ناشت و گۆڕبەگۆڕیان کرد!

سەیر لەوەدا بوو لەسەر ئەو پشێوی و شێواوی ئەوزاع و ئەحواڵی وڵاتەدا کە سەگ ساحەبی خۆی نەدەناسییەوە، ئەمن لە کار و خواست و ویستی خۆم شل نەدەبوومەوە بێخەبەر لەوەی:

خانه از پـایبست ویـران است　　　خواجه در بند نقش ایوان است

## هەنگاوێکی بەکەڵک بۆ کوێرانی حافزەلقورئانی بۆکانی

کار و پێداویستییەکی لەو هەلومەرجەدا بۆ من زۆر گرینگ بوو، مەسەلەی کوێر و نابینایانی حافزی قورئانی بۆکانی بوو کە لەگەڵ مودیرکوللی (بەڕێوەبەری گشتی) «ئەوقاف» هێنامە گۆڕێ، بەو جۆرە کە ناونیشانی ئەو حافزانە کە ١٥نەفەر بوون، دام بە ئاغای مودیری کوللی ئەوقاف و پێم گوت: قوربان، کوێر و نابینایانی ئێوە دەبینم لە شەقام و سەری ڕێبازان بلوێر و شمشاڵ لێدەدەن و پووڵ لە ڕێبواران وەردەگرن، بەڵان نابینایانی ئێمە کە پازدە

کەسن، هەموویان حافزی قورئانن و ناکرێ بۆ بەڕێچوون و مەعاشی خۆیان لە کووچاندا قورئان بخوێنن و لە ڕێبواران پووڵ بستێنن و بێ جیرە و مەعاشن. دوای باسێکی کورت، جەنابی بەڕێوەبەری گشتی ئەوقاف، مانگانە نەفەری پێنجسەد تمەنی بۆ بڕینەوە کە لە لایەن ئیدارەی ئەوقاف بیاندەنێ. هەتا ڕۆژێکی حکوومەت لە سەر لاقی خۆی ڕاوەستا، ئەو مانگانەیە بە کوێران دەگەیشت، بەڵان کە خاوەن جڵوبەڕی خوار بوو، مووچەی کوێرەکانیش تێداچوو و چاوساغەکان قۆزتیانەوە و لە فڵقی خۆیان وەرێنا.

## کێ دەهات و کێ دەڕۆیی و چیمان کرد خۆبەخۆیی

لە هاوینی ١٣٥٧ و لە بەهمەن مانگی ئەو ساڵەدا، سەیروسەمەرەی زۆرم لە ژیانی دیت و بەسەرم هات. هەور و هەڵلای پێشهاتی ڕۆژگار وەها لە ئاسمانی بیرەوەریم هالا و لە تەپومژی کات و ساتی هەڵکەوتەکانی ناحەزی مەڵبەندێکدا تێکهاڵان کە وەک خەونی ئاڵۆز، دیار و نادیاری پێشهاتەکانم وا لێتێکەڵ بووە کە ناتوانم ڕواڵەتی پێویستی ئەو هەمووە پێشهاتە ناحەزانە بەڕوونی شێو کەم و وەردی دەمەوە و چڵ و گوڵ و دڕوودالی دەرخەمەوە و بیانژینمەوە.

لە نێو مەجلیسدا نوێنەرێکی زۆروێژ بووم و وتاری پێش دەستوورم لە سوورەتی وتاری مەجلیسیاندا لە کات و ساتی خۆی هەر ماوە. دوایین وتارم لە ڕۆژی پێنجشەممۆ یازدەی مانگی ئابانی ١٣٥٧ کە ڕۆژنامەی «ئیتلاعات»ی ژمارە ١٥٧٤٩دا چاپ کراوە لە ژێر سەردێڕی «دوژمن چی لە ئێمە دەوێ؟». ئەوەش لە کاتێکدا بوو کە ئینقلابی ئێران گەیشتبووە ئەوپەڕی توندی و تیژی و لە هەموو شارەکانی ئێران هەموو ڕۆژێ خۆپێشاندانی خوێناوی و وڵاتسووتێن هەبوو. لە «شیراز»، «ئیسفەهان»، «کرمان»، «مەشهەد»، «قوم»، «تەورێز»، «کوردستان» و «ئازەربایجانی ڕۆژئاوا»، ڕۆژ نەبوو ڕۆژنامەکان بە خەتی درشت لە سەردێڕی باسەکانیاندا خەبەری چەندین کووژراو و سووتانی چەندین ئیدارە و بانکان نەنووسن. دۆست و دوژمنت بۆ ساغ نەدەبۆوە و ئەورۆ و سبەینێت لێڕوون نەبوو داخوا چت بەسەردێ.

مەملەکەت هێندە شیرازەی پسابوو و تێکەڵوپێکەڵ بوو، هەتا ڕادەیەکی وا کە

هێندێک لە نوێنەرەکان وەک ئاغای «پزیشکپوور» و هاوڕێیانی، یانی ئاغای «بەنیئەحمەد» و «ئیسحاقینەژاد»، وەک دزی ناشی سەریان لە کادێن دێنا دەر و لە وتارەکانیاندا لەباتی خەڵک ڕێنوێنی بکەن و ئاورێ وەکووژێنن، بۆخۆیان فوویان لە ئاور و گڕەمەشخەڵی دەرێ دەکرد کە ببوو بە سووتانی لێرەوار و تەڕ و ویشکی پێکەوە دەسووتاند. پێیان وابوو بە دیفاع لە خراپکارەکان خۆیان خوێنشیرن دەکەن و دەبنە خۆشەویستی میللەتی و «وەجیهولمیللەت»، بەڵان لە دوایە لە هەموو دژبەرێک خوینتاڵتر و ناحەزتر هاتنە دەرێ.

سیاسەتی ئینگلیس و ئەمریکا و ئوورووپا بەپێچەوانەی ڕژێمی شایەتی لە ئێراندا بوو. کاتێک شووڕەوی ئەفغانستانی داگیر کرد، ئەمریکا و ڕۆژاوا پێیانوابوو ڕژێمی شایەتی ژەنگی هێناوە و گەندەڵ و پووکاوەتەوە و بەربەرەکانی لەگەڵ شاڵاوی مەرامی «کۆمۆنیستی» پێناکرێ، مەگەر ڕژێمێکی دینی و مەزهەبی بتوانێ لە هێرشی دنیای کۆمۆنیستی پێشگیری بکا. ئینگلیس و ئەمریکا و ئوورووپا لەسەر ئەو بیر و بڕوایە ساغ ببوونەوە کە ڕژێمی شایەتی ڕەپاڵ نێن و شێوازێکی توندی دینی و مەزهەبی و حاکمێکی بێڕەشمە و هەوسار، بۆ ئەو سیاسەتە و هاندانی خەڵک لەم ڕێبازەدا، «فەزای بازی سیاسی» (کەشوهەوای ئازادی سیاسی) لە سەرانسەری ئێراندا پێویستە و ئەم بەرنامەشیان پیادە کرد و لە دەرکی نەتەوەکانی ڕەنگاوڕەنگی ئێران، وشتری خۆیان یخ دا. ئەو تەڵە و تەڵەکەی غەرب کە بۆ خەڵکی گۆڕانکاری نەدیوی ئێرانی ساغ نەبۆوە کە لە ژێر پەردەی سیاسی غەربەوە چ مەولوودێک سەر دەردێنێ. لە هەلومەرجێکی وادابوو کە نوێنەرە زبر و زرینگەکانیش ڕایەڵوپۆی ئەو تەونەیان بەپێچەوانە تێوەدەدا.

## ئیرادگرتنی نوێنەری ورمێ و لۆمەی نەتەوەی کورد و وڵامەکەی من

لە کۆبوونەی ڕۆژی سێشەممۆ ۳ی مانگی ڕەزبەر، ئاغای عەلی نەزمی نوێنەری ورمێ، لە وتاری خۆیدا شاڵاوی بۆ کوردەکانی ڕۆژئاوای ئێران هێنا و کوتی: «کار گەیوەتە ڕادەیەک کە لە ڕۆژئاوای ئێراندا، ئەم دروشمانە دەدەن و دەڵێن کە لاوانی کورد دەبێ بە جلوبەرگی کوردییەوە بچنەوە قوتابخانە و بە زمانی کوردی قسان بکەن و دەبێ زمانی کوردی لە قوتابخانەکان بخوێندرێ و بە

دەرس بیڵێینەوە و لەم شاڵاوانە زۆری درێژدادڕی کرد.

ئەمن بە ناوی نوێنەرێکی کورد کە ئەم وتارەم بیست سەرم سووڕ ما، لەسەر ئەو هەموو ناکۆکی و کەمایەسییانە کە لە تەواوی ئوستانەکانی ئێراندا سەری هێناوەتەدەرێ و سەگ خاوەنی خۆی ناناسێتەوە، ئێوە وشتری چارەڕەشی و بەدبەختی خۆتان دێنن لە پێش دەرکی کاول و کلێسی کوردەکان یخی دەدەن و خەتای قەنبەری دەهاوێنە ئەستۆی عومبەری؟

بۆ جوابی ئاغای نەزمی لە جەلەسەی داهاتوودا وتارێکم دا و ناونووسیم کرد. لەم جەلەسەدا لە ژێر سەردێڕی (دوژمن چی لە ئێمە دەوێ؟) ڕۆژنامەی ئیتلاعات لە ژمارەی ١٥٧٤٩ی خۆیدا بڵاوی کردەوە. لێرەدا بۆ ئاگاداری خوێنەرەکان تەنیا پوختەیەک لە وتارەکە دێنمەوە و چۆن بە زمانی فارسی بووە بە پێویستی نازانم دەقی تەواوی بنووسمەوە.

«...مانی هەر نەتەوەیەک ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە پاراستنی فەرهەنگ و شارستانییەتێکە کە تێیدا دەژی و دەبی بیسەلمێنن کە نەتەوەی کورد توانیویەتی لە هەموو هەلومەرجە ناخۆش و دژوارەکانی مێژوویی‌دا، فەرهەنگی ئارییایی کە کورد یەکێک لە سەرەکی‌ترین ڕەگەزەکانی ئەو نەتەوەیە، بە ساغی ڕاگرێ و بیگەیەنێتە ئێستا و ئەگەر باقی نەتەوەکانی دیکەی ئێرانیش فەرهەنگ و داب و نەریتی خۆیان وەک ئێمە پاراستبا، ئێستا تووشی ئەو ڕۆژە ڕەشانە نەدەبووین و ئەگەر کوردەکانی ئێران، جلوبەرگی کوردی لەبەر دەکەن و بە زمانی خۆیان قسە دەکەن، لە ڕاستی‌دا ڕاستەوخۆ خزمەت بە فەرهەنگ و نەتەوەی خۆیان دەکەن و بە هیچ جۆرێک نابێ وەکوو تاوانێک بڕواننە ئەو مەسەلەیە.»

«...خەڵکی ئێمەش وێڕای خەڵکی هەموو شارەکان لە شەپۆلی پێکهاتوو کە تەنیا دەسکردی ئێمەی کورد نیە، بێبەش نەبوون و خۆیان نیشان داوە و ئەو شێوە توندوتیژانە چارەسەری پەشێوی ناوچە ناکەن و داوا دەکەم ئەو تاوانبارانەی بوون بە هۆی شەهید و بریندار بوونی چەند کەس لە هاووڵاتییان، بە سزای خۆیان بگەیەنن.»

«...چارەڕەشی و ژیانی هەژارانەی خەڵکی ناوچە و بەتایبەت ئەو فەرق و

جیاوازییە کە لە چاو ناوچە غەیرە کوردەکان بەدی دەکرێ، داوا لە دەوڵەت دەکەم ئاوڕێکی دڵسۆزانە و ڕاستەقینە لەو خەڵکە بداتەوە و لە هەنگاوی یەکەمدا، «بۆکان» کە لە دابەشکردنی وەزارەتی نێوخۆ بە «بەخش» حیساب کراوە، ببێتە «شار» و لە بوارەکانی سازکردنی قوتابخانە لە دێهاتەکان و پشتیوانی زیاتر لە کەشاوەرزان لە لایەن بانکی کەشاوەرزی و هەروەها بەهێزکردنی «شیرکەتی تەعاونی»یەکان بە ئامانجی بەرەوڕوو بوون لەگەڵ هێندێک سەرمایەدار و دەوڵەمەندی هەلپەرست، زیاتر سرنج بدەنە بە ناوچە کوردنشینەکان.»

ئەم وتارە لە کاتی پشێوێنی وا توند لە هەرێمدا، بۆ سەفی موخالیف و موافیق لە دەرەوە و ژوورەوەی وڵات، بە دوو ڕووکاردا لێکدانەوەی لەسەر کرا و لە ڕۆژنامەکاندا دەنگی دایەوە. بە تەلەفۆن، هەڕەشەوگوڕەشە، یان بارەکەڵلا و ئافەرینی زۆرم لێدەکرا. بەوەی چاک بوو، هەڵکەوتی نالەبار، پێشهاتی چاوەڕواننەکراو، ڕۆژانە هێندە کتوپڕ بوو، ئەوانە لە بیر دەچوونەوە. ئێران وەک جەنگەڵی ئاورتێبەربووی لێهاتبوو و خەڵک یان فوویان لێدەکرد و یان دەیانگەشاندەوە، یان هێندێک بە لاوێچ و بە مستان ئاویان پێدادەکرد هەتا بیکووژێننەوە. چاک و خراپ وا تێکهاڵابوون، کەس کەسی نەدەناسییەوە. ڕۆژنامەکان هەر خەبەری خۆپێشاندان و سووتان و ڕووخاندنیان لە شارەکاندا دەنووسی. وامەکەن، وانابێ، هاوار و دادی نوێنەرە دڵسۆزەکان و دەزگاکانی نەتەوەیی بایەخی نەبوو. ڕۆژنامەکان شێوازی ڕێنوێنی و ئەهوەنکردنەوەیان وەخۆ نەگرتبوو. هەر باسی کوشت و کوشتار بوو کە تیراژی ڕۆژنامەکانی بردبووە سەرێ و بازاڕی بۆ گەرم داهێنابوون. کەیخودایی و نێوبژیکردن کاری کۆتابوو، ماتیش دەرمانی نەجات نەبوو. دەیانگوت: ئەوەی لە شاردابێ، دەبێ لە کاردابێ. ئەوەی بێتەڕەفە، بێشەڕەفە!

## لە هاوینی ساڵی ١٣٥٧ ماڵ و منداڵم هێناوە بۆکان و نەمبردنەوە

لە پشوودانی هاوینی ساڵی ١٣٥٧، کاتێک ماڵم هێناوە بۆکان و دیتم هەوا تەمە، ئیتر ماڵ و منداڵم نەگوێزتەوە تاران و بۆکان بوو بە نیشتمانی یەکجاریم. بۆخۆم بەتەنێ لە هۆتێلێک مابوومەوە و ڕۆژانە زیاتر لە مەجلیسدا

دەمامەوە، چون لە سێ کۆمیسیۆندا ئەندام بووم، زۆر جاران نیوەڕۆم لە ڕستووورانی مەجلیس دەخوارد و زیاتری ڕۆژەکان ئەوانەی کاروباریان هەبوو دەهاتنە لام و چونکە زۆربەیان دێهاتی و خۆولاتی بوون لە کار و کردەوەی بۆکان بێخەبەر نەبووم. بۆکانیش وەک شارەکانی دیکە نائارامی دەورەی دابوو.

## خۆپێشاندانێکی خوێناوی لە بۆکان

ڕۆژێک لە خۆپێشاندانێکی قەرەبالغدا، دوو لاوی بۆکانی کووژران و چەند کەسێکیش بریندار بوون. ئەمن لە بۆکان لە ماڵە خزمێکی دانیشتبووم کە خەبەریان دامێ. کە هاتمە نێو شار، ولات ئارام ببۆوە و خەلک بلاوەی کردبوو. چوومە پێش دەرکی شارەوانی، ڕەئیسی شارەوانی سەروانێکی جەوان بوو و وادیار بوو بە فەرمانی ئەو دەستووری تەقەیان لە خۆپێشاندەران کردبوو. تەرمی کووژراوەکانیان ڕاگوێزتبوو بۆ ماڵی خاوەنەکانیان. لەو کاتەدا ڕەئیسی دادگوستەری بۆکانیش پەیدا بوو، هەردووکمان ئیرادمان لێگرت کە نەدەبوو دەستووری تەقە بدا و ئەو کارەساتە بخولقێنێ. ئەویش کوتی: خۆپێشاندەران دەیانهەویست شالاو بۆ شارەبانی و ئیدارات بێنن و ئەمن ناچار بە بەرگری بووم. (ئەو سەروانە دوای ماوەیەک لە ورمێ ئیعدام کرا.)

لەگەڵ ڕەئیسی دادگوستەری چووینە بەخشداری. دیاربوو «بەخشدار»، کاربەدەستانی ئوستان و مەهابادی لە ڕەوتی خۆ پێشاندانەکە گەیاندبوو. بۆ لای ئێواری ئوستانداری ورمێ و فەرماندار و فەرماندەی تیپی مەهاباد «سەرهەنگ پزیشکپوور»، هەموو لە بەخشداری بۆکان کۆبوونەوە. ئەمن بە فەرمانداری مەهابادم گوت: پێویستە تەلەفوون ئیمام جومعەی مەهاباد (مامۆستا شێخ عیزەددین) بکەی بەپەلە و خێرا بگاتە بۆکان، چون ئەو کوژراوانە نەنێژراون و هەروا لە مزگەوتێن. ئەمشەو و سبەینێ جەماوەر کۆدەبنەوە و سبەینێش بۆ ڕێورەسمی ناشتنی ئەو جەنازانە، تەواوی بۆکان ڕەگەڵ دەکەوێ. مامۆستا شێخ عیزەددین جێی ڕێز و حورمەتی هەموانە و لە دووپاتی فیتنە و غەوغا، پێشگیری پێدەکرێ. «قاسمئاغای موهتەدی»ش لە مەهابادە و ڕاسپێردراوە ئەویش بێتەوە، لێرە بێ چاکترە. قاسمئاغا بۆخۆی کە گەورەی بنەماڵەی موهتەدییە، یەکێک لە کوژراوەکان خزمی ئەوە و بوونی ئەو دووانە

(مامۆستا و قاسمئاغا) بۆ بەرگری لە فیتنەی دیکە و ئارامکردنەوەی شار زۆر پێویستە. ئوستاندار کە ئارامکردنەوە و دابینکردنی شاری زۆر بە گرینگ دەزانی، پێشنیاری منی پەسند کرد و بە فەرماندارى گوت زووتر ئەم کارە جێبەجێ بکە.

«سەرهەنگ پزیشکپوور» دەستووری دابوو گوردانێک سەرباز بە تۆپ و تانک و ئەسلەحەوە برێژنە بۆکانەوە. بۆ لای ئێواریێ مامۆستا شێخ عیززەددین و قاسمئاغا کە پێگەی بنەڕەتی بوون، بۆ ئارامکردنەوەی خەڵکی شار گەیشتنە بۆکان و هاتنە بەخشداری. مامۆستا بێ مەحتەلبوون چووە ئەو مزگەوتەی کە جەنازەکان و جەماوەر لەوێ بوون. دیداری مامۆستا بۆ خەڵک هۆی ئەهوەنبوونەوە بوو. فەرماندار و هێندێک لە بەرپرسی ئیدارات لەگەڵ قاسمئاغا بۆ دڵداری چوونە ماڵی لاوە کوژراوەکان. لە لایەکی دیکەوە خەبەریان هێنا کە جەماوەرێکی زۆر لە تەورێز و شارەکانی دیکە وەڕێکەوتوون کە بە هاواری خۆپێشاندەرانی بۆکانەوە بێن. ڕەئیسی ساواکی مەهاباد داوای لێکردم هەرچۆنێک بێ وەزعەکە ئارام بێتەوە، منیش دەستەوداوێنی کاک «سەلاحەددینی موهتەدی» بووم کە خەڵک لەگەڵ خۆی بەرێ و نەهێڵێ بێن بۆ بۆکان و بیانگێڕێتەوە و کاک سەلاح پیاوانە توانی پێشگیری لە هەر جۆرە فیتنەیەکی دیکە لە بۆکاندا بکا. دەبێ بڵێم کاک سەلاح لاوێکی زیت و زیرەک و مەرد و ڕەند بوو و بە هەستێکی توندی ناسیۆنالیستی و نەتەوەپەرستی و ئازادیخوازانەوە دەژیا و دەژوا. لە بنەڕەتدا بنەماڵەی موهتەدی لە نێو عێلی دێبوکری، خاوەنی خوو و خەسلەتی نەتەوەپەرستی بوون کە قاسمئاغای کەیخودا و کاک سەلاحی لاو نموونەی ئاشکرای ئەم خدەیە بوون و هەمیشە جێگای ڕێز و حورمەتی نەتەوەخوازانی هەرێم بوون.

لەو هەلومەرجەدا ئەوەی بۆ دەوڵەت و دامودەزگا گرینگ بوو ئەوە بوو کە نەیەڵن داوێنی غەوغا و پشێوی درێژ بێتەوە. ئەو ویستەش بە هاوکاری «مامۆستا شێخ عیززەددین» و «مەلا ئەبووبەکری شەفیعی» و «قاسمئاغا» و تا ڕادەیەک «کاک سەلاح» وەدیهات. خەڵکی شار بەتەواوی لە مزگەوت و دەوری تەرمەکان کۆ ببوونەوە. دەمزانی هێندێک لە نەیاران لەم جەریانەدا بەدژی من دەبزووونەوە، بەڵام ئەمن ئەوە نەبووم کە ئەرکی هاوکاری و دڵسۆزی خۆم لەم

کاتەدا بەجێ نــەهێنم. شــەوێ هەســتام چوومــە مزگــەوت. بــەردەرک و دالان و ڕێڕەوی مزگەوت پڕ بوو لە گەنج و لاوی شــار و مزگــەوت چــیمکــوت بــوو لــە کەیخودا و ڕدێنسـپی و حــاجی و سـۆفی. مامۆســتا شــێخ عیــزەددین و مــەلا ئەبووبــەکری شــەفیعی لــەملا و لــەولای میحرابەکــەوە پاڵــیان دابــۆوە. دوای سلاوکردن ڕاست ڕۆیشتم بەرەو میحراب و لای مامۆستایان. هەردووکیان هەستان و لــە نێــوان خۆیــان دایاننــام. بێدەنگییــەکی ســامدار مزگــەوتی داگرتبــوو. مامۆستایان بەخێرهاتنیان کردم و دەشمزانی هێندێکیان هاتنی منیان لەم کاتەدا بۆ مزگەوتێ پێ چاک نەبوو، بەلان ئەمن نوێنەرێک بووم کــە ئــەو خەڵــکە بــە ئەمینداری خۆیان هەڵبژاردبووم. من لە پێش ئەو هەلکەوتەدا هۆی مانەوەی خۆم لە مــەجلیسدا بــۆ تیپــی ڕۆشــنبیر شــیکردبــۆوە کــە مانــەومم بــۆ پێــشهاتە نالەبارەکانی ولات بەکەلکترە هەتا نەمانەومم. زەحمەتی هاتنی مامۆستا شێخ عیزەددینم هاویشتە سەر ئەستۆی خۆم و کوتم: جەنابی شێخ، لەبەر پێشگرتن لە خوێنڕێژی و فیتنەی دیکە، ئەمن هاتنی تۆم لەم کاتــەدا بــۆ بۆکــان زۆر بــە پێویست زانی. خەڵک هەستیان بریندار بووە، تــۆ کــە جێــی بــاوەڕی خەڵــکی مەهاباد و بۆکانی، دەتوانی ئاوێک بەو ئاورە داکەی. سبەینێ لە بــەڕێکــردن و ناشتنی تەرمی ئەو دوو لاوە بۆ گۆڕستانی شار، نەهێڵی هەســت و ئیحــساساتی گەنج و لاوان کارەساتەکە دووپات کەنەوە؟ مامۆستا کــوتی: هــەتا ئێــستا لــەو بابەتەوە سەرکەوتوو بووم. بەتەمام سبەینێش زۆر بــە ئــارامی ئــەو جەنازانــە بنێژین.

هەر ئاواشی کرد و سبەینێ لە دەوری سی تا چل هــەزار نەفــەر لەگــەڵ ئــەو جەنازانە بەرەو گۆڕستان ڕۆیبوون. لە سەر قەبران یەکێک هۆنراوەی «یا وەتەن یــا مــردنم»ی مــن کــە لــە دەورانی کۆمەڵــەی (ژ.ک) و پێــشەوادا هۆنرابــۆوە، خوێندبوویەوە.

بە ئیزنی مامۆستا هەستام بە نێو جەماوەردا وەدەرکەوتم. تەماشایان دەکردم و هیچیان نەدەگوت. ئەمنیش هیچم پێنــەبوو بیــڵێم! ئــەوەی دەبــوو بیــڵێم لــە چوونەومم بۆ تاران لە مەجلیسدا بە سەرۆکوەزیر و هەیئەتی دەوڵەتم ڕاگەیاند و داوای سزادانی تاوانبارانم کرد.

شەودرەنگ بوو، چوومەوە بەخشداری و دەمزانی میوانەکانیش کاتی حەسانەوەیانە.

سبەینێ زوو هەستام و چوومە بەخشداری. خەڵک دەچوونە پێش دەرکی مزگەوت و سەربازەکان بە چەکەوە کووچە و کۆڵانیان ئاخنیبوو. دوو تانک لە پێش شارەداری ڕاگیرابوون. چوومە بەخشداری. لە پێش دەرکە خزمەتکاری بەخشداری گەیشتە لام و کوتی: دەهاتم لە دووت. ئاغای ئوستاندار ئەتۆی دەوێ. چوومە سەرێ، دیار بوو جەلەسەی باس و ڕاوێژیان پێکهێنابوو کە بریتی بوون: ١ـ ئاغای ئوستاندار. ٢ـ فەرمانداری مەهاباد ٣ـ سەرهەنگ پزیشکپوور ٤ـ ڕەئیسی سازمانی ئەمنییەت (ساواک)ی مەهاباد. ئاغای ئوستاندار کوتی: ئاغای نووری چاکتر ئەوەیە کە ئەتۆ بە ناوی نوێنەری بۆکان لەو خۆپێشاندانە لێرە بووی و ئێمە لێپرسراوانی ناوچە دەبێ چلۆنیەتی پێکهاتنی ئەو خۆپێشاندانانە بە مقاماتی سەرەوە ڕابگەیەنین، باشترە کە تۆ نوێنەری ناوچەش لەو شووڕایەدا حوزوورت هەیە. ئێمە لێرەدا هاتووینە سەر ئەو باوەڕە کە ئاغایانی «موهتەدی» هەڵسووڕێن و بەڕێوەبەری ئەم خۆپێشاندانە لە بۆکان بوون. ئێمە سەرپەرستانی کاروباری ناوچە لەسەر ئەوە ساغ بووینەوە کە ئاغای «قاسم ئاغا» و نەفەرێکی دیکەیان بگرین هەتا فیتنە دووپات نەبێتەوە و لە مقاماتی سەرەوە بخوازین تەکلیفی تاوانباران مەعلووم بکا. لام وایە ئەتۆی نوێنەریش لەم نەزەرەدا هاوڕێ بی؟

هێشتا ئەمن وڵامم نەدابۆوە فەرمانداری کوتی: یەکێک لە کوژراوەکان خزمی «قاسمئاغا»یە و چەند کەسی دیکە بریندارن کە برازا و نیزیکانی ئەون. لەوەدا جێگای شک و دوودڵی نیە کە ئەم خۆپێشاندانە بە ویست و هاوکاری بنەماڵەی «موهتەدی» پەرەی گرتووە.

گوتم: جەناب ئاغای ئوستاندار، ئەمنیش بە ناوی نوێنەری بۆکان دەتوانم لەو بارە بیروڕای خۆم دەربڕم. خۆپێشاندانێکی کە لە بۆکان کراوە، درێژەی ئەو خۆپێشاندانانەیە کە لە تاران و تەورێز و شیراز و ئیسفەهان و قوم و کاشان و باقی شارە گەورەکانی ئێراندا کراوە. ئەو هەمووە قەتڵ و کوشتار و سووتانی ئیدارات و ڕووخاندنیان بە سەر یەکدا کە لەو شارانە کراوە و بۆتە مۆدێل و سەرمەشق بۆ شارێکی چکۆلەی وەک بۆکان، دەبوو خەتاکار و تاوانباران لەوێ

بگرن و تەمبێیان بکەن هەتا بووبانە عیبرەت بۆ بۆکان. دەوڵەت بزووتنەوە و بەربەرەکانی لە بەرامبەر خۆپێشاندان هەیە و دەیکا. بەڵان ئێستا لە هیچ شارێک بە ناوی تاوانبار نە کەسیان گرتووە و نە ئیعدام کراون. ئەوانەش کە باسیان دەکەن یانی بنەماڵەی «موهتەدی» و بەتایبەت «قاسم ئاغا»، لە دەورانی کۆن و نوێ لە ناوچەی کوردنشین‌دا خزمەتگوزاری ئاو و خاکی نیشتمان بوون. بەپێچەوانەی ئەوەی ئێوە لەسەری ساغ بوونەوە، ئەمن پێم وایە کە ئەم بنەماڵە دەبێ دڵخۆشییان بدەنەوە و دڵدارییان بکەن کە لێرە بەولاوە هاوکاری زیاتریان لە ئارامکردنەوەی شارەکەی خۆیان هەبێ. ئەوانە نابێ فیدای هەڵلا و هەنگامەیەک بکرێن کە سەرانسەری ئێرانی کردۆتە گۆمی خوێن. جەنابی ئاغای ئوستاندار، ئەمن لام وایە پاش نەهار تێکڕا بەکۆمەڵ بچینە نەخۆشخانە و سەردانی ئەو بریندارانە بکەین و دڵخۆشییان بدەینەوە و دڵدارییان بکەین و بیانکەینە زەخیرەی داهاتوو. «سەرهەنگ پزیشکپوور» کوتی: ئاغای نووری ئەگەر بنەماڵەی موهتەدی وەک ئەتۆ دەڵێی وەتەن‌دۆستن با ڕاگەیەندراوێک بلاو بکەنەوە و ئەو خۆپێشاندانەی خەڵکی بۆکان مەحکووم بکەن و بێزاری خۆیان دەربڕن!؟

گوتم: جەنابی سەرهەنگ، ئەوەی ئەتۆ دەیفەرمووی ڕاگەیەندراوێکی وا نەک هەر بە دژی خەڵکی بۆکانە، بەڵکوو بە دژی تەواوی خەڵکی ئێرانە. ئەوە جوانە تەکلیفێکی ئاوا، ئەویش لە هەلومەرجێکی وادا لە بنەماڵەیەکی ناسراو لە هەرێمدا؟ جەنابی سەرهەنگ، مەگەر ئەوانەی لە خۆپێشاندان بەشداری دەکەن هەموویان هاوڕان؟ نیوەی زیاتریان ناڕازین! لە مەجلیس‌دا موافیق و موخالیفی تێدایە. ئاغای پزیشکپوور براگەورەی تۆ هەمیشە لە سەفی دژایەتی‌دایە. ئیزنم بدە بڕیارەکەی تۆ ئاوا بسازێنم کە «قاسم‌ئاغای موهتەدی» وەفاداری خۆی و بنەماڵەی خۆی بە تۆ کە لە سپادا نوێنەری «شا»ی و بە جەنابی ئوستاندار کە نوێنەری وەزارەتی نێوخۆیە ڕابگەیەنێ و شێوازی ڕابردووی ڕەچاو بکا.

کاتێک جەدەلەکە بوو بە ئی من و ئاغای پزیشکپوور، ئاغای ئوستاندار وەدەنگ هات و کوتی: ئاغای نووری دەی ئەگەر ئەوەی دەیڵێی وایە، با ئاغایانی موهتەدی بڕیاری وەفاداری خۆیان سەبارەت بە ڕژێمی «شا»یەتی وەدەرخەن و بینووسن، ئەودەم ئێمەی بەرپرسانی ناوچە قسەیەکمان نامێنێ.

گوتم جەناب ئاغای ئوستاندار، لێرەدا دواییت بە هەموو باسێکی نالەبار هێنا. بۆ نەهار جەنابت و باقی ئاغایان میوانی منن و دێنە ماڵی من. تەلەفۆن دەکەم قاسمئاغای موهتەدیش بێتە وێ و مەسەلەی لەوێ حەل دەکەین. ئاغای ئوستاندار قەبووڵی کرد و هەستاین هاتینەدەرێ. قاسمئاغاش دەهات کە ئاغایان بانگهێشت بکا بۆ ماڵە خۆی؛ ئوستاندار گوتی: قاسمئاغا ئەتۆش لە ماڵە نوێنەری خۆت میوانی. (دەبێ ئەوەش ڕابگەیەنم کە باس و جەدەلی من و مقامات زۆر لەوەی گوترا زیاتر بوو بەڵان کورتم کردەوە هەتا گەیشتووینە ئەو جێیەی کە تێیداین.)

لە ڕێیە بەسەرهاتەکانم بۆ «قاسمئاغا» شیکردەوە کە قسەمان لەسەر چی براوەتەوە. قاسم ئاغا زۆری پێ باش و ڕازی بوو. هاتینە ماڵێ و دانیشتین و قاسمئاغا لەگەڵ ئوستاندار و سەرهەنگ لە بارەی پێشینەی بنەماڵەی خۆی کە بە درێژایی زەمان خزمەتیان بە ئاو و خاکی نیشتمان کردووە و بە نیزامی سەلتەنەتی وەفادار بوون، زۆر دوا. لەپاشان کوتی: لەو هەلومەرجەشدا کە ناوچە تێیدا دەگیردایە، جارێکی دیکە بنەماڵەی «موهتەدی» وەفاداری خۆیان بە نیزامی سەلتەنەتی دەردەبڕن. ئوستاندار و باقی مقامات بەسپاسەوە داوای هاوکارییان لێکرد کە لەم گێژاوەدا ئارامی و هێمنی لە شارەکەیاندا وەدی بێنن و پێشینەی ڕووناکی خۆیان جارێکی دیکە بژێننەوە. جەماوەر کە بۆ بەڕێکردن و ناشتنی جەنازەکان چووبوون، زۆر بە ئارامی و بێدەنگی گەڕابوونەوە نێو شار و بڵاوەیان کردبوو.پاش نەهار، ئاغای ئوستاندار و هاوڕێیانی بەتێکڕا چوونە نەخۆشخانە بۆ سەردانی بریندارەکان و تا ڕادەیەک بۆکان ئارام ببۆوە. لێپرساوان و کارگێڕان هەرکام گەڕانەوە شوێنی خۆیان و جەماوەر بڵاوەی کرد و هەرکەس وەشوێن کاری خۆی کەوت.

ڕۆژی دوایی ئەمنیش بە دڵپڕی و پەرۆشییەوە چوومەوە تاران و لە مەجلیس بۆ وتاری پێش دەستوور ناونووسیم کرد. لە نۆبەی وتاری خۆمدا بەسەرهاتی بۆکانم وەک هەبوو شیکردەوە و داوای سزای تیرئەندازەکانم لە سەرۆکوەزیر کرد. بەداخەوە دەقی وتارەکەم لە دەستدا نیە هەتا بۆ ئاگاداری خوێنەران بینووسمەوە.

## نوێنەرێکی کە چوار ساڵ پیادە دەچووە مەجلیس و پیادە دەگەڕاوە

ئەمن ناتوانم ڕووداو و هەلکەوتەکانی دەورانی نوێنەری خۆم هەنگاو بە هەنگاو بنووسمەوە. نیزیکەی چوار ساڵ پیادە دەچوومە مەجلیس و دەگەڕامەوە مەیدانی «ژالە» بۆ ماڵە خۆم. جا ئەو هەنگاو بە هەنگاوی پڕ لە ڕووداوم بۆ ناگوێزرێتەوە نێو دەفتەری بیرەوەرییەکەم. بەتایبەت ئەوەی لە ساڵی ١٣٥٧ هەتا سەرنخوونی ڕژێمی شایەتی ڕووی داوە، ئەگەر بیر و زەینم یاریم بکەن، ئەوەی جێگەی سەرنجە، حەز و ناحەزی کارەکان و کەسان وەبیر دێنمەوە و دەیخەمەوە زەینی بەرەی داهاتوو و عیبرەتی نەسلی حازر.

## ڕووداوی خۆپێشاندانی مەیدانی «ژالە» لە تاران

لە دوای ڕووداوی خۆپێشاندانی مەیدانی «ژالە» کە کێشابوویە خوێنڕێژی و کوشتارێکی زۆر وەک خۆپێشاندەران دەیانگوت، شوێنەوارێکی توندی لە سەر بیروڕای گشتی دانا و ئاسەوارێکی خراپی لە نێو دەستەی موافیق و موخالیف وەدیهێنا کە بوو بە هۆی لاچوونی دەوڵەتی ئاغای «جەمشیدی ئاموزگار» و هاتنە سەرکاری دەوڵەتی ئاغای «شەریف‌ئیمامی» بە ناوی دەوڵەتی «ئاشتی میللی». لە ڕۆژێکدا کە ئاغای شەریف‌ئیمامی هاتە مەجلیس کە دەنگی باوەڕپێکراوی (ڕەئی ئیعتماد) وەرگرێ، هێندێک لە نوێنەرەکان کە وەک کەڵەبابی بێوەخت دەیانخوێند، لە حاڵێکی وادا کە مەملەکەت بە تەکانی بوومەلەرزەی «شۆڕش» هەڵشێلدرابوو و وڵات نیازی بە ڕێنوێنی و ئامۆژگاری و ئارامی هەبوو، چەند کەسێک لە نوێنەرە وەختنەناسەکان، بۆخۆیان دەستەچیلەی ئاورهەڵایسێنی مەعرەکە بوون، ئەویش لە پشت کورسی خەتابەی مەجلیسی شووڕای میللی؟! ئاغای شەریف‌ئیمامی هاتە پشت «تریبۆن»ی مەجلیس و بە ناوی دەوڵەتی «ئاشتی میللی» خۆی ناساند و داوای «دەنگ»ی کرد و کوتی: «نیشانەکانی دەوڵەتی من ئەوە دەبێ، دووبەرەکی نەمێنێ و ئاشتی لە نێوان میللەت و دەوڵەت پێکبێنم و ئەوەی مەسڵەحەتی ئێمە و جەماوەر بێ، پێیدا بڕۆین.» ئاغای پزیشکپوور لە سەر کورسییەکەی خۆیڕا نەڕراندی و کوتی: «میللەت ئەتۆی ناوێ، ئەتۆ بە دەستی خوێناوییەوە هاتوویە مەجلیس.» مەجلیس بەو قسە تێکهاڵا و غەوغا پەیدا بوو. زۆرێک لە نوێنەرەکان

هەستان بچن لێی‌دەن، هەرای نوێنەران و دەنگی زەنگی سەرۆکی مەجلیس کردی بە هەرا و هەڵلایەکی وا توند کە کەس لە کەس حاڵی نەدەبوو. بۆ چەند دەقیقە زەنگی بێبڕانەوەی ڕەئیس، غەوغای بێدەنگ کرد. دوای ماوەیەک بێدەنگی درێژەی بە کاری خۆی دا و ئاغای «شەریف‌ئیمامی» دوای تەواوبوونی وتارەکەی بە ناوی سەرۆک‌وەزیری دەوڵەتی ئاشتی میللی داوای دەنگی کرد و زۆربەی نوێنەرەکان دەنگیان دایە. لە دەنگدان‌دا ئاغای «پزیشکپوور» و سێ کەس لە هاوکارانی هەڵاتنەدەرێ. ئەوەیە کە چارەڕەشی لە ئەستۆی نەتەوەیەک هالا، زاناکانیشی دەبنە پارسەنگی ئەو نەگبەتی و چارەڕەشییە.

چو تیره شود مرد را روزگار        کند آنچه را کش نیاید به کار

جا سەیر لەوەدایە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئێران، ئاغای پزیشکپوور هەڵات بۆ دەرەوە و دوای تۆبە و نەدامەت ڕێگایان دا بێتەوە ئێران. ئاغای «بەنی‌ئەحمەد»یشیان گرت و زیندانییان کرد و لە پاش پەت‌پەتێن و زەجرێکی زۆر، ئازادیان کرد و بەڕەڵلا بوو. چرا عاقل کند کاری که بازآرد پشیمانی؟

هەتا بەرەو ڕۆژی ۲۲ی بەهمەن دەڕۆین، ڕۆژبەڕۆژ وەزع شێواوتر و وڵات پەرێشانتر دەبێ. کاری دەوڵەت لە پێشگیری و بەند و بەست ترازابوو. ڕۆژنامەکان بۆ هەواڵی داغ و دڵسووتێن دەسکەوتیان زۆر بوو. دەوڵەت و میللەت تێکنەدەگەیشتن و داوا و ویستیان یەکتری نەدەگرتەوە. ڕاگەیەندراوی ئاخوندەکان بازاڕشێوێنتر بوو و دەیانگوت: «مرغ یک پا دارد»! دەوڵەتی ئاشتی میللیش چی پێنەکرا و کاتێک دیتی لەگەڵی ئاشت نابنەوە، بۆی دەرچوو.

## دەوڵەتی «تیمسار ئەزهاری» هاتە بەر مەیدان

دەوڵەتی «تیمسار ئەزهاری» هاتە بەر مەیدان و لە پێش هەموو کارێک‌دا حکوومەتی نیزامی لە چەند شاران ڕاگەیاند. کار خراپتر بوو، هەرا داغتر بوو. شەوانە لە سەربانان دەنگی «ئەڵلاهووئەکبەر» گوێچکەی زەمانەی کەڕ دەکرد. تیمساری سەرۆک‌وەزیر لای وابوو هەمووی نەوارن و پڕکراونەوە و لە سەربانان دایانناون کە هەتا ڕۆژ بێدەنگ نابن. درۆ و ڕاستی، فێڵ و تەڵەکە و بوختان هێندە زۆر بەربڵاو بوو، هەموو کەس و هەموو جێیەکی دەگرتەوە. دەیانگوت ئەوەی بێتەڕەفە، بێشەرەفە. بەڵام بێتەڕەف زۆر بوون و لە ترسی شەپۆلی

ڕۆژگار ماتەیان هەڵگرتبوو و وەک کەروێشکی بازرە لە خوزە خزابوون.

تیمساریش هیچی پێنەکرا، نە ئاور کووژاوە، نە ئاشی ئاشووب لە گەڕان کەوت، نە نەوارەکان لە سەربانان بێدەنگ بوون.

(امام می‌فرماید: شاه باید برود.) (ئیمام دەفەرمێ: شا دەبێ بڕوا.)

دیارە شا دەبێ بڕوا، کارەکان تەواو بوون، ئیمام لە «کوێت»ەوە هەڵیانفڕاندووە و لە بن داری «نۆف لۆ شاتۆ»ی فەرانسە جێی بۆ چاک کراوە. ڕادیۆکانی «بی.بی.سی»، ئەمریکا، فەرانسە و ئاڵمان خەبەری ڕۆژانەی ئیمام و وتووێژەکانی بڵاو دەکەنەوە. پردی هەوایی لە بەینی «نۆف لۆ شاتۆ» و تاران هەڵدەبەسترێ و پەیکی خۆشخەبەری ڕادیۆکانی ئوورووپا فاتیحای ڕژێمی «شا»یەتی لە ئێراندا دەخوێنن. دیارە دەبێ (شاه برود!) «تیمسار ئەزهاریش» بە کەروفەڕی نیزامی خۆیەوە، بواری پەڕینەوەی لە تۆفانی بزووتنەوەی ژوور و شەپۆلی سیاسەتی دەرەوەی وەگیر نەکەوت و بە باریکەڕێی ئوورووپادا تێی‌تەقاند و پاشەڕۆکی خۆی لە سەرۆک‌وەزیری ڕاگەیاند.

شا پێش ڕۆیشتنی خۆی یەکێک لە سێ تفەنگدارانی ناسراو (دوکتور کەریمی سەنجابی، داریووشی فرووهەر، شاپووری بەختیار) یەکیانی کە «شاپووری بەختیار» بوو کردی بە سەرۆک‌وەزیر و ڕەوانەی مەجلیسی کرد و پێی‌گوت: هەتا ئەتۆ دەنگی باوەڕپێکراوی وەرنەگری ئەمن ناڕۆم. ئاغای بەختیار بە ورەیەکی پتەو و لەخۆڕادیوانە بۆ ناساندنی خۆی و وەرگرتنی دەنگی باوەڕپێکراوی، هاتە مەجلیس و دوای ناساندنی خۆی و بەرنامەی کاری دەوڵەتەکەی، زۆر بەرزەفڕانە داوای دەنگی پشتیوانی کرد و بەشی زۆری نوێنەرەکان، دەنگیان دایە و وەزیرەکانیشی بە تەواوی قبووڵ کران.

شا کاتێک لە دەنگی پشتیوانی مەجلیس خاترجەم بوو، چوو بۆ فڕۆکەخانەی «مێهراباد» و دوای ڕشتنی دوو دەنک فرمێسکی گەش، یەکیان بۆ ئێران و یەکیان بۆ دانیشتووانی، بەرەو دیاری نادیار هێندە فڕی تا لە چاوان ون بوو. ئەوجار بزانین ئاغای شاپووری بەختیار هەتا کوێ دەڕوا و مانگی ڕەمەزان نیوەچڵ دەکا.

لە چاردەی مانگێدا «خەلقوڵڵا» و جەماوەر بەعام دەبینن چەند چڵەمووی ئیمام لە نێوەڕاستی مانگێدایە؟!

## شا و شوورای سەلتەنەتی

شا پێش ڕۆیشتنی خۆی، شوورای سەلتەنەتی کە بریتی بوون لە ٧کەسی ساماندار: سەید جەلالەددینی تارانی، ڕەییسی شوورای سەلتەنەتی. ڕەئیسی مەجلیسی شوورای میللی، جێگری ڕەییسی شوورای سەلتەنەتی و ٥ کەسی دیکە لە ئەرتەشی و سیناتۆر و پیاوماقووڵانی ئەم شوورایە هەتا ڕۆژێکی ئاغای سەید جەلالەددینی تارانی چوو بۆ فەرانسە و لە خزمەتی ئیمامدا تەریکی خۆی لەم شوورایە دەربڕی! هیچ کارێکی لە دەستی نەهات و نەیکرد. لەو ماوەیەدا کە ئاغای شاپووری بەختیار بوو بە سەرۆکوەزیر، ئێران بەتەواوی شڵەقابوو. وەک جۆلانە ڕادەژا، خۆپێشاندان، دروشم دان، کۆبوونەوەی بێپسانەوە و... دنیا چاوەڕوانی دوا هەناسەی مەدەنییەتی چەندهەزار ساڵەی ئێران بوو کە دەبوو بە بەدرەقەی ئاغای بەختیار، گیان بە دەستەوە بدا و ژیانی لەمێژینەی خۆی بە خاکی فەرامۆشی بسپێرێ.

هەر لەو سەردەمەدا کە ئێرانی ئاریایی لە گیانەڵادا بوو، نوێنەرانی دوو مەجلیسی «سەنا» و «شوورا» دیدارێکمان لەگەڵ ئاغای سەرۆکوەزیر پێکهێنا و داوامان لێکرد کە ئاغای بەختیار سەفەرێک بۆ فەرانسە بکا و ئاغای خومەینی بدوێنێ بۆ ئەوەی مەملەکەت لەوە زیاتر تووشی دووبەرەکی نەبن. قەتڵ و کوشتاری نێوخۆیی نەیەتە پێشێ و تەشریفی بێتەوە ئێران و دەستووری ئارامبوونەوەی گشتی بدا و هەر چۆنێکی بۆخۆی پێی باش بوو، ڕێوشوێنی داهاتووی وڵات دامەزرێنێ. «شا»یە ڕۆیشتووە و کەسێک نەماوە سەرپێچی لە فەرمایشی بکا و ئێمە نوێنەرانی دوو مەجلیس بۆ ئارامی و ئاسایشی مەملەکەت هاتووینە سەر ئەو بیر و بڕوایە کە ئەتۆ ئەم ڕاسپاردە بەڕێوەبەری.

هەر لەو سەردەمەشدا بوو کە سەید جەلالەددینی تارانی چووبووە لای ئیمام و ئەویش گوتبووی هەتا خۆی تەریک نەکا لە شوورای سەلتەنەتی، ئەمن وەریناگرم. ئەویش دیارە سپاردەکەی هەتا ئەوێ بوو و تەریکی خۆی پێشکەش بە ئیمام کردبوو. دەڵێن لە پێش ئەویشدا ئاغای «دۆگلاس» قازی بەناوبانگی ئەمریکی چووبووە فەرانسە ئیمام بدوێنێ. ئیمام فەرمووبووی هەتا لە کاری خۆی، خۆی تەریک نەکا، نایدوێنم؟! ئەویش دیارە کارەکەی خۆی پێ‌گرینگتر بووە و پاشەوپاش کشابۆوە بۆ «یەنگی دنیا»ی خۆی.

نوێنەرەکانی دوو مەجلیس ئەو نیگەرانییەمان هەبوو کە بە ئاغای بەختیاریش هەر ئەوە بلێ کە دەیلێ. بەڵان ڕۆچوو دەس بە هەموو پووشوپەڵاشێک دەگرێ و مەملەکەت لە حاڵی نوقمبوون و ڕۆچوونداببوو. کاری هێندێک لە «عیبادوڵلا» هێندەی پێچ و خەم هەیە، دزی و ئاشکرای وەکک کاری خوایە و کەسی تێناگا. لەو کات و سەردەمەدا کە شا دەبوو بڕوا، کوتیان شا گوتوویە: چۆن «هایزێر»ی ئەمریکی سێ مانگە هاتۆتە ئێران و ئەمن نەمزانیوە؟! (ئەم قسەیە لە مەجلیسدا باس کرا.) جا نازانم شا هێندە گێل بووە، یان «هایزێر» هێندە زۆرزان؟! مەسەلەی کوردەیە کە دەڵێ: «شوێن شوێنی کەرێ، چنگ چنگی هەیاسێ، پیاو سەری لەو کارەی دەماسێ.» با کارمان بە سیاسەتەوە نەبێ.

## ئاکامی بەرنامەی دیداری بەختیار و ئیمام خومەینی

دوو ڕۆژ دوایە، ئاغای سەرۆکوەزیر داوای دیداری نوێنەرانی سەنا و شوورای کردبوو کە بچنە کاخی سەرۆکوەزیر. کاتێک نوێنەران چوونە لای، سەرۆکوەزیر، کابینەی دەوڵەتیش هەموویان لەوێ بوون. دوای دامەزران و دانیشتن ئاغای بەختیار کوتی: «ئاغایان، نوێنەرانی بەڕێز، ئەمن بە پێشنیاری ئێوەی ڕێزدار دەمهەویست بچمە فەرانسە بۆ دیداری ئاغای خومەینی و ویستی نوێنەرانی سەنا و شوورای پێڕاگەیەنم. فڕۆکەشم ئامادە کردبوو کە بچم. بەڵان لە پێشدا بە تەلەفۆن لەگەڵ ئیمام دوام. دەزانن ئیمام لە وڵامی مندا چی فەرموو؟ کوتی: هەتا خۆت لە سەرۆکوەزیری تەریک نەکەی نامهەوێ بێیە لام یان بمبینی. وەک بە جەلالەددینی تارانی و دۆگلاسی ئەمریکیشی گوتبوو بە منیشی هەر ئەوە ڕاگەیاند.» لە دوایە پێکەنی و کوتی «ئەوە گۆوارێکی فەرانسە لەو بارەوە نوکتێکی بەتامی نووسیوە کە ئەمن بە فارسی بۆتان دەخوێنمەوە. ئەویش ئەوەیە، دەنووسێ: خوای گەورە جوبرەئیلی ناردە خزمەت ئیمام خومەینی. ئەویش هات و بە پێشخزمەتی ئیمامی گوت: عەرزی ئیمام بکە جوبرەئیل هاتووە و خوا ناردوویە و کاری پێتە. پێشخزمەت هاتەوە لای و کوتی ئیمام دەفەرمێ: هەتا خۆی تەریک نەکا لەو کارەی کە دەیکا، نامهەوێ ببینم؟!» جەماوەر زۆر پێکەنین. لە پاشان ئاغای بەختیار کوتی: «ئاغایان، نوێنەرانی

سەنا و شوورا، ئەمن حازر نیم خۆم بەرکەنار بکەم و تا دوایین هەناسەم ڕادەوەستم و پایەداری دەکەم.» ئاغای بەختیار ڕاستی گوت، تەریک نەبوو، بەڵان تا ئاخرین ڕۆژەکانی دوایین هەناسەی‌دا بە یاری بازەرگان لە بازەرگانەوە بۆی دەرچوو کە دەرچوو.

## ئیمام هاتەوە

ئیمام هاتەوە و زۆرکەسی دیکەش بە دوای هاتنەوەی ئیمامدا هاتنەوە بۆ شارە شیرین و خاوەن مێژووەکەی ئێمەش یانی «مەهاباد». «مامە غەنی هاتەوە، یاخوا بەخێر بێتەوە!».

لە ڕۆژی ٢٢ی ڕێبەندانی ١٣٥٧، شۆڕشی گەلانی ئێران بە ڕێبەری ئیمام خومەینی سەرکەوت. تەرازووی خێر و شەڕ داندرا. نامەی کردەوەی چاک و خراپان هاتە گۆڕێ و دەرگای بەهەشت و جەهەننەم کرایەوە. بەپێی نامەی کردار ئومەتیان هێنا پێی حەق و حیساب. چاکەکان بە دەرکی دەوڵەت‌دا چوونە بەهەشتی ناز و نیعمەت و بەدحیسابەکان بە باریکەڕێی پردی سەرەنگرێ‌دا بەرەو دیاری نادیار وەڕێخستران و بەڕێکران.

ئەمن کە لە ڕیزی ساڵحان‌وتاڵحان و لە بژاردەی تێشکاو و تێکشاوان‌دا نەبووم، خۆم لە مەیدانی حیسابی بەدحیسابان بوارد و دوای چەند ڕۆژان گەڕامەوە هەرێمی خۆم و نێو ئەو خەڵکەی ئەمنیان هەڵبژاردبوو. لە بۆکان و لە گوندی «عەنبار» نیشتەجێ بوومەوە و هاتمەوە سەر پەت‌وسینگی خۆم.

چون کاروباری دەوڵەتی تازەپێداکەوتوو بە دەست پێداکەوتووانەوە بوو، هەر شار و شارۆچکەیەک حکوومەتێکی سەربەخۆی پێک‌هێنابوو و کەس خەتی کەسی نەدەخوێندەوە. دەوڵەت هێشتا نەیتوانیبوو لە مەڵبەندی کوردنشین دەسەڵات پەیدا بکا و چیمکی داکوتێ. کەسانی چەکدار لە بۆکان بە ناوی «حیزبی دێموکرات» و «کۆمەڵە» و «خەبات» و «موجاهیدین» و «راه کارگر»، لە تورک و فارس و لوڕ و کورد، هەرکام بە ئاهەنگی تایبەتی خۆیانەوە دەژیان و دەبزووتن. ئەوانەی بە ئاواتی کورد و کوردستانەوە بزووتنەوەی نەتەوییان کردبووە ئارمانی خۆیان، بریتی بوون لە «حیزبی دێموکرات» و «کۆمەڵە» و «خەبات». ئەوانیش بەداخەوە لەباتی یەکگرتوویی و پاڵوێکدان، کەوتبوونە

کێبەرکێ و قینەبەری لە دەوری یەکتر. لەو ماوەیەدا کە حکوومەتی تازە پێداکەوتوو مەودای حوزووری لە مەڵبەندی کوردەواریدا نەبوو، لایەنەکانی سیاسی کەوتبوونە کەڵەوەکێشی و ڕقەبەری لەگەڵ یەکتر و ئەوەی نەتەوی دەبوو لەگەڵیان بکا، خۆبەخۆ دەیانکرد، سەرێک بوون و هەزار سەودا.

## مەلا و مامۆستا ئایینییەکانمان چی؟

بەداخەوە مامۆستا و ڕێبەرە ئایینییەکانیشمان لەباتی یەکگرتن و یەکباوەڕێ، ملیان لەبەر ملی یەک نابوو. لە شارەکانی سنە و سەقز و بانە و بۆکان و مەهاباد و شنۆ، مامۆستایان خۆیان ببوونە هۆی ناتەبایی و دووبەرەکی خۆیان و نەتەوەکەیان. بەپێچەوانە، ئاخوندەکانی شیعە لە نێو خۆیاندا و بۆ مەسڵەحەتی کاری خۆیان و تەبەعەی خۆیان لە دەوری یەکی وەک خۆیان کۆ بوونەوە. پلە و پایەی ڕێبەری و ئیمامەت و قوتبی مەداریان دایە و ئەو ڕێکوپێکییە بوو کە توانیان شای ئێران هەڵدێرن و حکوومەتێکی جمهووری ئیسلامی پێکبێنن. ڕۆژێک کە ئیمام بۆ ناودێری حکوومەتەکەی کوتی: (جمهووری ئیسلامی، نە وشەیەک زیاتر و نە وشەیەک کەمتر!) تەواوی ئاخوند و حوجەتولئیسلام و ئایەتوڵلاکان تێکڕا کوتیان: «سمعنا و اطعنا یا امام!» بەڵام مەلاکانی ئێمە قۆڵقۆڵ و تیپتیپ بوون، ئەوەی یەکیان دەیگوت ئەوانی دیکە ڕەدیان دەکردەوە. گەورەترین عالمەکانمان یان لە هەڵەبوونی خۆیاندا تێداچوون، یان ئاوارەی دەرەوە و دوورەوڵاتان بوون. دوای ساڵێک لە کوردستاندا نە بۆخۆیان مان، نە تۆرەمە و حیزبەکانمان. لێرەدا نامهەوێ گێرەشێوێنی مەزەبی و نەتەوەیی ناودێر بکەم، چون هەر بۆخۆمان بووین و لە خۆمان بووین.

## «نووری» و «دادگای ئینقلابی ئیسلامی» لە مەهاباد

لە هاوینی ساڵی ١٣٥٨ لە بۆکان بووم. بێ دەنگوباس، ناحەزیم زۆر دەدی و پیشم دەخواردەوە و قڕوقپ دەرکی بێدەنگیم لە خۆم پێوەدابوو. هێندێک لە بێچووە قینلەبەرەکان کە لای خۆ ئەندامی حیزبی دێموکرات یان کۆمەڵە بوون و بۆ ڕزگاری گەل و کۆمەڵ چەکیان لە شان کردبوو، قین و تووڕەیی دەورانی

تێکچوونی« ڕژێمی ئەرباب و ڕعێتییان» لە بارەی ئەمنی نەتەوەپەرست لـە دڵدا ڕاگرتبـوو و لـە ترسـی خەڵـکی دێهـات کـە وەک بـوت ئـەمنیان دەپاراسـت، نەیاندەوێرا ڕاستەوخۆ پشم و غاری خۆیان دەربڕن و بۆخۆشـم لێیـان‌دڕدۆنـگ بووم. جەوان بوون و بێ‌ئەزموون. نامەیەکم بۆ مام «هێمن» نووسی کـە ئـەویش هێنـدە نـەبوو لـە ئێـراقڕا هـاتبۆوە مـەهاباد. ئـەو لـە ئێـراقڕا گـەڕابۆوە نیشتمانەکەی و ئەمنیش لە تارانڕا. بەشی ئێمەی نەتەوەخواز لەمێژە وایە، کە یەکێک لە هەرێمدا ساغ دەمێنێ و ئەوی دیکە یاساغ دەبێ. هـەموو بـەو دەردەوە گیرۆدە بووین. «هەژار»، «هێمن»، «ئـاوات»، «هێـدی»، «عـەتری گـلۆلانی» و «سەعید ناکام» (عەبدوڵڵای مستەوفی)، بە نۆبە ساغ و یاساغ دەبووین.

بۆ مام «هێمن»م نووسی: مامەگیان، وڵاتەکـەمان چـەقوتەفەکـەی تونـدە، زیاتر قینەبەری و کۆنەحیساب لە ئارادایە، کەس کەس ناناسـێتەوە. حیـسابی ڕۆژ لە کاردایە و کاریان بە ڕابردوو نەماوە. ئەتۆ لەو هەلومەرجەدا ئاگـات لـە کۆنە هاوڕێیان و تازەلێقەوماوان بێ. جوابێکی بۆ نووسیبوومەوە کـە ئێـستاش ماومە، نووسیبووی: «کاک نووری جارێ ئاگات لە خۆت بێ، لەم تەفوچەقـەدا بزانین چمان لەگەڵ تازەپێداکەوتووان پێدەکرێ.» کە کەوڵ و پێستیان لە عەرزی دام، بەداخەوە مام «هێمن» فریانەکەوت قەباڵەم بخوێنێتەوە.

## لاوانی ناشی و نەتەوەی بێ‌ئەزموون گرتیانم و دایانم بە نەتەوی

ئێوارەیەک ئەو تیپە ناشـی و سـەربەخۆیانە، بـە چەکـدارێکی زۆرەوە لـە بۆکـانڕا، دەوری ماڵـەکەیان دام و وەک تاوانبـار و خـەتاکارێکی لەمێژینـەی کوردستانیان وەگیرهێنابـێ، بـە ئێـسکۆرتی چەنـد جیـب و ماشـێن و دەیـان پێشمەرگەی حیـزبی دێمـوکرات، لای ڕۆژئـاوا سـواریان کـردم و بردیـانم بـۆ مەهاباد. کچێکی گەورەم بە دیتنی ئەو دیمەنە وەعەرزیکـەوت و بێهـۆش بـوو. چون لەو سەردەمەدا هەر کەسیان گرتبا و تـەحویلی دادگـای ئینقلابیـان دابـا، کاری دەکەوتە دەست «کرام‌الکاتبین». بەو حاڵەی و لەو حاڵـەیدا بردیـانم بـۆ شاری مەهاباد. شارێکی کـە جووڵانـەوەی هەسـت و بـیری دەورانی کۆمەڵـەی (ژ.ک)م بوو. شاری پێشەوای نەمر و شەهیدەکانی تر. شـاری بزوێنـەری بـیر و باوەڕی «هەژار» و «هێمن» و «ئاوات» و «هێدی» و «عـەتری گـلۆلانی» و سـەدان

لاوی دیکەی گیانباز لە ڕێی نیشتماندا. ئەوە لە دوای ٣٢ ساڵ شەهادەتی پێشەوای مەزن، یەکێک لە شاگردانی مەکتەبی پێشەوا، بە ناوی تاغووتی یان «مفسد فی‌الأرض» یان «محارب با خدا و رسول» لە شاری مەهاباد وەک حەواریوونێکی بەرنە پێی تۆڵە، خۆم بە سەربڵیند دەزانم کە لە شاری پێشەوای شەهید، شانازی شەهادەتم بە نەسیب بێ. بێخود نەبوو کە ئەم خەیاڵاتە ڕووی تێکردبووم. هەتا ئەو ڕۆژە ١٥کەس لە نوێنەرانی مەجلیس ئیعدام کرابوون و نیزیک ٣٠کەسیش هەڵاتبوون بۆ دەرێ و زۆری دیکەشیان گیرابوون. بەڵان ئەمن دەمهەویست لە نێو کۆمەڵ و نیشتمانی خۆمدا بمرم یان بژیم.

لەم بیرەوەرییەدابووم، ماشێنی پشتەوەی چەکدارەکان وە ماشێنی ئێمە کەوت و نیشانی ڕاوەستانی دا. ڕانەندەی ماشێنەکەی ئێمە ڕایگرت. لە ماشێنی پێشەوە چەکدارێک دابەزی و هات بەو پێشمەرگەی پەنا دەستمی گوت: ئەتۆ دابەزە بچووە جێگاکەی من سواربە، ئەمن لە لای ئاغای نووری سوار دەبم. وا دیاربوو ئەو فەرماندەری دەستەکە بوو. لە لام دانیشت و ئەحواڵپرسی کرد و کوتی: نامناسی؟ تاریک بوو، کوتم: برام هیچکامتان ناناسم. ناشزانم ئێوە کام گرووهن، کۆمەڵەن، دێموکراتن یان خەباتن، یان پێشمەرگەی موسوڵمانن؟ پێشمەرگەی موسوڵمان ناسناوی ئەو کەسانە بوو کە تفەنگیان بۆ خزمەت بە حکوومەت لە شان کردبوو. ئەوەش ناسناوێکی تازە بوو کە یەکێک لە مەلایانی تەرازئەوەڵی کورد لە شاری سنە دای بەو چەکدارانە کە لە خزمەتی جمهووری ئیسلامیدا بوون، کە بەداخەوە ئەو عالمە زانایە، لە ڕێی ئارمانی میللی و ئیسلامی خۆیدا، هەتا ئاخرین هەناسەی ژیانی لە زیندانی جمهووری ئیسلامیدا بوو. زۆرێک لەو عالمانەی هەرێم یان ئیعدام کران، یان تەریکەنیشتمان بوون.

ئەو پێشمەرگەیە کوتی: ئەمن عیسازادەم، ئەندامی حیزبی دێموکراتم. ئاغای نووری ئەوەش بزانە کە من خۆم بە ئەمەگداری تۆ دەزانم. ئەمن لە ڕژێمی پێشوودا لە بەشی هونەری «ئامووزش و پەروەریش»دا کارم دەکرد. یەکێک لە ترکەکان دەیهەویست جێگۆڕکێم پێبکا. تۆ کە نوێنەری بۆکان بووی، هاوارم بۆ نای، لەگەڵ من هاتییە مەهاباد و ئەمنت لە جێگای خۆم هێشتەوە. ئەمن هەتا ڕووحانی ڕژێم لە ئیدارەی ناوبراودا مابوومەوە و پاش ڕووخانی ڕژێم، تفەنگم

هەڵگرت و بوومە پێشمەرگە و ئەندامی حیزبی دێموکرات. زۆربەی ئەندامانی حیزبی دێموکرات ڕازی بە گرتنی تۆ نەبوون، بەڵان کرا. ئەمن بۆیە هاتمە لای تۆ، دەمهەوێ ئەمشەو بتبەمە ناوەندی حیزبی دێموکرات و لەوێش لەگەڵ سەرانی حیزب بە تەلەفۆن بدوێم بزانم چم بۆ دەکرێ. ئەمن پێناوداری چاکەی تۆم.»

گوتم: «جەوان، ئەمن لەگەڵ خوالێخۆشبوو ئاغای عیسازادەی بابت زۆر ئاشنا بووم. کە تۆ کوڕی ئەوی شانازیت پێدەکەم. ئەمنیش ئەگەر لە نیشتمانی خۆم دڕدۆنگ بام، ڕێگای ڕۆیشتنم هەبوو، دەمهەوێ هەتا مردن لە باوەشی کۆمەڵ و نیشتمانی خۆمدابم.» عیسازادە ڕووی کردە ئەو سێ پێشمەرگەی کە لە پشتەوە دانیشتبوون گوتی: «ئەوکاتە ئاغای نووری کورد و نیشتمانپەرست بوو، ئێمە گەزەگەزەمان نەدەزانی. هەر کوردێکی حەساوە نەبوو لە دەورەی هەڵوەشانی ڕژێمی ئەرباب و ڕعێتی ڕێنوێنی ئازادی کەشاوەرزان و دێهاتییەکان بوو لە چنگ ستەمی شێوازی فیئۆدالیسمی.» دوو کەس لەو پێشمەرگانە کوڕە دێهاتی بوون کە بزووتنەوە و نەبەزی منیان لەو دەورە دیتبوو و دیار بوو لە گرتنی من ناڕازی بوون، کوتیان: «بەڵێ ئێمە بە ناوی مەردێکی شۆڕشگێڕ لە ڕێی ڕزگاری چینی دێهقان و کەشاوەرز کردمانە نوێنەر و ناردمانە مەجلیس.» ئەو کوڕە دێهاتییانە کە ئێستا چەکی حیزبیان هەڵگرتووە بە چاکی دەزانن هێندێک لە بێچووە فیئۆدالەکان کە بوونە ئەندامی حیزب، بۆ تۆڵەئەستاندنەوە لە یەکتر بوونە حیزبی و هۆی کێشەکێشی نێوان حیزبی دێموکرات و کۆمەڵە هەر ئەوانن کە دەیانهەوێ تێکڕۆبێن. هەتا ئەم وتووێژە کرا، گەیشتینە مەهاباد و لەڕێوە بردیانم بۆ مقەڕی حیزب. بەرپرسانی حیزب لەوێ نەمابوون. هێندێک چەکداری حیزبی لە پێش دەرکە ڕاوەستابوون. دەستەی هاوڕێی من کە ٢٠نەفەرێک دەبوون، هاتنە ژووری حیزبەوە. ئاغای عیسازادە شارەزای حاڵوباڵ بوو. چەند دانە یارەڵماسی و دوو هێلکەی هێنا و بۆی دانام و کوتی دەزانم برسیتە و شامت نەخواردووە. بۆخۆشی تەلەیفوونی لە «مامەغەنی» کرد. بەڵێ هەر ئەو «مامەغەنی»یەی دوای ٢٥ ساڵ گیران لە ڕێی خۆشەویستی ئەستالین، بەخێر هاتەوە و ڕۆیشتەوە و نەهاتەوە. عیسازادە بە مامەغەنی گوت: محەممەدی نووری، نوێنەری خەڵکی بۆکانمان گرتووە و هێناومانە کە

بیدەین بە دادگای ئینقلابی ئیسلامی. ئەتۆ دەڵێی چی، چی لێبکەین؟ دیاربوو مامە جوابی دابۆوە کێ دەستووری داوە، فەرمانەکەی بەڕێوەبەرن. عیسازادە کوتی: بۆخۆم شەوێ دەتبەمە دادگای ئینقلاب و لە لاشت دەمێنمەوە تا بزانم چت بەسەردێ. سواری ماشێنیان کردم بۆ مقەڕی دادگا، لە «باشگای ئەفسەران»ی ڕژێمی پێشوودا. کێشکچی ئێمەی بردە ژوورێ. کە تەماشام کرد، مەئمووری پەزیرایی مەلای جیرانی خۆم بوو لە بۆکان. تەختێکی خاوێنی دامێ بۆ نوستن.

سبەینێ بەر لەوەی دادگا دەس‌بەکار بێ، بە ئاغای عیسازادەم گوت: دەکرێ تەلەفوونی مامۆستا شێخ عیززەددینم بۆ بگری؟ کوتی: بەڵێ دەکرێ. تەلەیفوونی مالیم گرت. ئەلۆ ئەلۆ. جوابی داوە بەڵێ، دەنگی مامۆستا بوو، دەنگی ناسیم. کوتی: ئەی‌ئەی فلانی ئەوە لە کوێڕا دەدوێی؟ کوتم: مامۆستا لێرەڕا، لە مەهاباد. کوتی: ئەی بۆ نەهاتوویە ماڵی خۆمان؟ کوتم: مامۆستا وەختایەک لە مەهاباد هاتمە لات پێم کوتی، هەرکات دەوڵەت یا خود حیزبەکان پێداویست بوو پرسیارم لێبکەن، خەبەرم بدەنێ خێرا بۆخۆم دێم. مامۆستا کوتی: دەی جا چ بووە، لە کوێڕا دەدوێی؟ کوتم: مامۆستا لە دادگای ئینقلابی مەهابادڕا. دوێنێ نوێژی شێوان دەستەیەک لە برایانی حیزب دەوری ماڵەکەیان دام و وەک تاوانبار یان جینایەتکارێک تێکیانەوەپێچام و هێنامیان و تەحویلی دادگای ئینقلابیان دام. دیارە دەیانهەوێ بە ناوی نوێنەری «تاغووتی»، یان «مفسد فی‌الأرض» ئیعدامم بکەن و چیدی نا.

دیاربوو مامۆستا بەو خەبەرە تێکچووبوو، بە تووڕەیی و دەنگی نووساوەوە کوتی: ئاغای نووری، لەسەر ئەو سەرەڕۆیی و کارە ناحەزانەیە کە من چەند ڕۆژێکە بە حکوومەت و ئەو لایەنە سیاسییانەم ڕاگەیاندووە کە هەتا هەرێم ئاوا بێ‌سەرەوبەرە بێ، هەر پاسدار و چەکدارێک ئەوەی بۆخۆی پێی‌خۆش بوو بیکا، ئەوە ئەمن لە مەیدان چوومە دەرێ. نوێنەرایەتی ئیمام خومەینی لە فەزایەکی وادا، پێشکەش بە خۆی. ئێستاش نارەحەت مەبە. تەلەفوون لە مامۆستا «عەبباسی» ڕەئیسی دادگا دەکەم کە ئەتۆ کێی و بەراستی دەستەی چەکدارانی بۆکانی ناحەزترین کارە کردوویانە. کوتم: مامۆستا ویستم لە جەریان‌دابی، دەنا لێیگەڕێ ئەوەی دوژمنانی نیشتمان دەیانهەوێ، بە دەستی خۆبەخۆیی

لەگەڵ یەک پێکیبێنن. ئەگەر من مانەوەم لە خاکی نیشتمان‌دا بە پێویست نەزانیبا، ئێستا یان لە ئامریکا بووم یان لە ئوورووپا. مامۆستا بە نارەحەتییەوە کوتی: ئەوەی لە دەستم بێ و بە پێویستی بزانم دەیکەم.

دیاربوو چەکدارەکان (پێشمەرگەکان!) کردەوەی خۆیان بە دادگا ڕاگەیاندبوو. کە هاتن کوتیان: فەرموو بۆ وەتاغی ڕەئیسی دادگا. کە چوومە ژووری دیتم مەلایەکی ڕدێن‌سپی و گەڕاوە بە ناوی مامۆستا «عەبباسی» لە پشت میزی ڕیاسەت دانیشتووە. (دیاربوو دەبێ سەرۆکی هەموو دادگایەکی ئینقلاب، مەلا یا ئاخوند بێ.)

سەلامووعەلەیک و عەلەیکەسسەلام. فەرموو دانیشە.

پرسیار: ناوت چییە؟ وڵام: محەممەدی نووری. پ: شوغڵ؟ و: ئێستا کەشاوەرزم. پ: پێشینە؟ و: نوێنەری ناوچەی بۆکان لە مەجلیسی شووڕای میللی. درێژەم دا و کوتم: مامۆستا ئەتۆ مامۆستایەکی کورد و خۆولاتی، ئیزنم بدە تەنیا پرسیارێکم هەیە بیکەم و وڵامم بدەوە، لەپاشان چی دەفەرمووی لە خزمەتت‌دام. ئەویش ئەوەیە: ئەمنیان بە تاوانی چی گرتووە و هێناویانم؟ مامۆستا کوتی: دەڵێن ۱ـ ئەتۆ نوێنەری تاغووت بووی. ۲ـ کە هاتوویەوە گوندی «عەنبار» لە مزگەوتێ تاریفی شات کردووە و لە سەروگوێلاکی جمهووری ئیسلامیت داوە.

گوتم: مامۆستا ئەویندارى چاو وبرۆی شا نەبووم، ئەمن شیفتەی خزمەتی نەتەوەی خۆم بووم و هەتا ماوم شێوازی نەتەوەویستی لە ژیانی خۆم‌دا ناکووژێنمەوە و لەو ماوەدا نوێنەرێکی دڵسۆزی وڵاتەکەم بووم. ئەمجار ئەمن پێشینەیەکی پاک و خاوێنم لەگەڵ ڕژێمی شایەتی نەبوو، هۆنراوەی کوردی (یا وەتەن یا مردنم) وێنەیەکی پێشەکیمە لەگەڵ ڕژێمی پاشایەتی و لە بارەی ئەوەی‌دا کە لە مزگەوتێ دانیشم و تاریفی شایەکی ئاوارە بکەم کە جێیەک شک نابا تێی‌دا وەحەسێ، ئەویش لە کاتێک‌دا کە پشم و غەزەبی جمهووری ئیسلامی لەگەڵ موخالیفان و نەیارانی خۆی لە ڕۆژ ڕووناکترە، دەکرێ بە خراپە لە بارەی بدوێی. ئەوە شتێکی ئاشکرایە، کەسێکی لە مەڵبەندێک‌دا شیاوی ئەوە بێ بیکەنە نوێنەر، شعووری لێکدانەوەی چلۆنیەتی ئێستا و ڕابردووی هەیە.

مامۆستا عەبباسی زۆر لە سەرەخۆ و بە ئارامی بیستیاری وتەکانم بوو و بە هۆی ناسیاوێکی کە بۆخۆی لەسەر ژیانی ڕابردووی من بووی و ئەو ئەسپاردەی مامۆستا شێخ عیززەددین، دیار بوو لەو پێشهاتە زۆر ناڕەحەت بوو، گوتی: گوزاریشی درۆی پێشمەرگەکانی بۆکانی لە کار و کردەوەکەیان ناحەزتر و ناشیانەترە. ئەمن لێرەدا بەتەنێ چم پێناکرێ؟ دادستانی دادگا دەتوانێ پێی ڕابگا. ئەتۆ ئێستا دەچیە وەتاغی دادستان، تا بزانین ئەو دەڵێ چی. مامۆستا هەستا و تا دەرکی دادستانی بەڕێی کردم و بە پێشخزمەتەکەی گوت: بیبە ژوورێ.

لەگەڵ کابرا چوومە وەتاغی دادستان. دادستان لاوێکی قیتوقۆز و خەپەتۆڵە بوو. لەدوایە زانیم شۆرەتی «ئارمان»ە و کوڕەکوردێکی خۆولاتییە. دیسان سەلاموعەلەیک و عەلەیکەسسەلام و فەرموو دانیشە و پرسیار و وەڵامی دووبارە.

پرسیار: ئاغای نووری گوزاریشیان وا داوە کە لە مزگەوتی دێی خۆتان بە شاخوباڵی ڕژێمی تاغووتیت هەڵگوتووە و سەروسەکوتی جمهووری ئیسلامیت کوتاوە؟ ویستووتە لەو بابەتەوە چ بەرهەمێک وەرگری؟

وەڵام: ئاغای دادستان، ئەوەی جەنابت ئاماژەی پێدەکەی، دەبێ وتەی حۆل و دێوانەیەک بێ. لە هەلومەرجی وادا کە دەبینی «کەڵ بە موویەک بەندە»، کەسێکی شیاوی نوێنەری مەڵبەندێکی هەبێ، ئایا هێندە گێژ و وەختنەناس دەبێ؟

پرسیار: ئاغای نووری کاتێک ئەتۆ دەتزانی ڕژێم تاغووتییە و موفسیدی فیلئەرزە، چۆن شعووری ئینسانی ئیزنی دای لە خزمەتی ڕژێمێکی ئاوادا بی کە خودا و پێغەمبەران لێی بێزارن.

وەڵام: ئاغای دادستان، ئەو پرسیارە ئەگەر لە جێی خۆیدا بکرێ، دەبێ لە وەزیرەکان و ئەمیرانی سپا و بەڕێوەبەرانی ڕژێم بکرێ نەک لە من. ئەمنێکی بە ناوی نوێنەر لە خزمەت چین و توێژێکیدام کە تۆ ئەوڕۆ پێیاندەڵێی موستەزعەف. ئەمن لە خزمەت نەتەوەیەکدا بووم کە نیازیان بە نوێنەرێکی دڵسۆز و ئاشنا بە دەردان هەبوو. پێسپاردەی من لە خزمەت خەڵکدا بوو نە خزمەتی شا و بە سەرفرازی و ڕووسووری ئەسپاردەی ئەوانم بەجێ دەهێنا.

بەڵان جەنابی دادستان، ئیجازەم بدە ئەمن پرسیارێکم هەیە کە لام وایە دەبێتە وڵامی زۆربەی پرسیارەکانت. ئەویش ئەوەیە: کاتێک بۆخۆت لە قوتابخانەکانی سەرەتایی هەتا دانیشگا بووی، لە دۆعای سبەینان‌دا دەتانگوت: خودا، شا، میهەن. کاتێک ڕێوڕەسمی دوایی‌هاتنی دانیشگات بەجێ دێنا، بۆ لە لیباسی قەزاوەت‌دا سوێندتان دەخوارد کە بە ئەرکی خۆتان و نەتەوە و شا خەیانەت نەکەن و پاسداری «قانوونی ئەساسی» بن. ئەوە پرسیارێکە کە لام وایە جوابی زۆرێک لە پرسیارەکانی تۆی تێدابێ. دادستان هات وڵامم بداتەوە، فریا نەکەوت کە هەرا و هەڵلا پەیدا بوو.

## خۆپێشاندانی جووتیارانی دێهاتی بۆکان لە پێش

## دادگای ئینقلابی ئیسلامی مەهاباد

کە هەرا و هەمهەمەی هەزاران کەشاوەرز و گوندنشینی بۆکانی و خودی بۆکان لە خەیابانی پێش دەرکی دادگا پەیدا بوو. جوابی پاسەوانی پێش دەرکیان نەدابۆوە و هرووژمیان هێنابووە نێو وەتاغەکان. هەرا و هوریای ژووریّ لە هەمهەمەی خەیابان کەمتر نەبوو، دادستان هەستا لە پەنجەرەی وەتاغەکەوە تەماشای خەیابانی کرد. هەزاران کەشاوەرز و گوندنشین هەرایان دەکرد: محەممەدی نووری نوێنەری بەڕاستی ئێمە بوو، ئەوانەی گرتوویانە ئینقلابی نین و دژی چینی چەوساوە و زەحمەتکێشانن، دژی ئینسانی واقعی نێو ئەو چین و توێژەن.

دادستان بە چاوپێکەوتنی ئەو جەماوەرە لێی حاڵی بوو کە بەڕاستی نوێنەری خەڵک بووم نەک نوێنەری حکوومەت. سەری هێناوە ژووریّ و ڕووی لە جەماوەر کرد کە هاتبوونە نێو وەتاغ و ساڵۆن و هۆدەکانیان قەرەباڵغ کردبوو، گوتی: ئێوە بچنە دەریّ. بەڵێنی دەدمم کە ئەو جۆرە نوێنەرانەی ویستیاری خەڵک بوون، لەبەر چاوی ئینقلابیش ڕێز و حورمەتیان ڕادەگیریّ. تکاتان لێدەکەم بچنەدەریّ، پاڵ ئەوانی خەیابانیّ. ئەوانەی هاتبوونە نێو ساڵۆن و هۆدەکانەوە، زۆریان حاجی و ڕدێن‌سپی و خوێندەوارەکانی شار و دێ بوون، کوتیان: جەنابی قازی، نە ئەوانەی هاتوونە ژووریّ و نە ئەوانی لە خەیابان ڕاوەستاون، لە جێی خۆیان نابزوون و ناڕۆن، مەگەر «محەممەدی نووری»مان

بدەیەوە دەستی و ئەگەر پێویست بێ، تاهەتایە دەمێنینەوە.

دادستان تێمابوو چبکا و چۆن ئەو جەماوەرەی لە نێو هۆدەکانی دادگا وەدەرخا. هەتا وەخت بەسەردەچوو، جەماوەری خەیابان زیاتر دەبوو و وەرزێرەکانی دەوری مەهاباد کە هاتبوونە شاری و بەو خۆپێشاندانانەی دێهاتییەکانی بۆکانییەوە دەلکان. خەیابانی پێش دادگا بەتەواوی بەسترابوو، دادستان ناچار بوو بە تەلەفوون لەگەڵ دادگای ئینقلابی تاران بدوێ و داوای چارە بکا. دوای وتووێژێکی زیادی تەلەفوونی هاتەوە نێو کۆڕ و جەماوەر و کوتی: وەرزێرانی بەڕێز، ئەمن لەگەڵ دادگای ئینقلابی تاران بە تەواوی دواوم و چلۆنیەتی حاڵی دادگای ئینقلابی مەهابادم پێڕاگەیاندوون. بەرهەمی بیروڕای دادگای ئینقلابی مەرکەز ئەوەیە: ئەو نوێنەرانەی کە خەڵک شکایەتیان لێیان نیە، یان قاتڵ و ساواکی نەبوون، بۆ دادگای ئینقلابی ئیسلامیش جێگای ڕێز و حورمەتن. براکان ئەوە دیارە کە ئاغای نووری خەڵک ویستوویەتی و دەیهەوێ. ئاشکرایە کە قاتڵیش نیە و نەبووە و بۆ ساواکیبوونیشی لەگەڵ ئیدارەی ئیتلاعاتی مەهابادیش دواوم، لەم ئیدارەیەش ڕوون بۆتەوە کە ساواکی نیە و نەبووە. ماوە لە ئیدارەی ئیتلاعاتی ئوستانیش پرسیار بکەم، دەزانم وڵامی ئەوێش «نا» دەبێ. ماوەم بدەنێ هەتا سبەینێ، دوای پرسیارەکەم، ئاغای نووریتان بۆ ئازاد دەکەم بێتەوە بۆکان. ئەورۆ درەنگ بووە ئێوە بڕۆنەوە. لەگەڵ دادستان ئەوەی گوت بوو بە هەمهەمە لە ساڵۆن و وەتاغەکاندا و کوتیان: ئاغای قازی، ئێمە ئێرە بەجێ ناهێڵین و هیچمان بە بێ ئاغای نووری ناڕۆینەوە.

کاتژمێر دووی پاشنیوەڕۆ بوو. ئەمن کوتم: ئاغای دادستان ئەگەر وایە، لێگەڕێ ئەمن ئەو جەماوەرەی بەرمەوە بۆکان. بۆخۆم بەیانی زوو دێمەوە دادگا. دادستان دیتی لەوە زیاتر ڕێگای چارە نیە. کوتی: ئاغای نووری ئەگەر وایە، کەسێکی مەهابادی بێ کە زامنی هاتنەوەت بێ، ئێوە بڕۆنەوە. کوتم ئاغای دادستان زامنم لە مەهاباد زۆرە، بەڵان لێگەڕێ بۆخۆم زامنی خۆم بم. ئەگەر پێبەندی ئەو میللەتە نەبام، ئێستا لێرە نەدەبووم. دادستان قبووڵی کرد و کوتی: فەرموون بڕۆن، سبەینێ چاوەڕێتم، ئاواتمە هەر وا بە ڕووسووری لە نێو ئەو

خەڵکەدا بژی. دەنگی جەماوەری نێو ساڵۆن و وەتاغەکانم دا کە هەستن برۆینە دەرێ. هاتینە دەرێ و بوو بە هوریاکێشان و ئەوانەی لە خەیابان ڕاوەستابوون ئارامم کردنەوە و نیزیکەی چل هەتا پەنجا ماشێن لە جیب و ئوتووبووس و تەراکتۆر سوار بووین و بەرەو بۆکان وەڕێکەوتین.

لە گوندی «داشبەند» دابەزیم و کوتم: ئاغایان زۆرتان منەتبارم. لێرە بڵاوەی دەکەین. هەرکەس بڕواتەوە بۆ دێ و جێ و ماڵی خۆی. ئەمنیش سبەینێ دەچمەوە دادگای مەهاباد و پێویستم بە ئێوە نەماوە. جەماوەرەکە هەموو دابەزیبوون و لە دەورم ئاڵقەیان دابوو. تێکڕا کوتیان ئەگەر پێویست بێ هەتا چلۆنیەتی کاری تۆمان بۆ ساغ نەبێتەوە، یەک مانگی دیکە بخایەنێ، دەورت چۆڵ ناکەین و دووبارە لەگەڵت دێینەوە مەهاباد. کوتم: برایانی خۆشەویست، لام وایە ئەو بزووتنەوە گشتییە، کاری من و داهاتووی من لە پێش ئەو حکوومەتە وەچاک ناگێڕێ. کوتیان ئاغای نووری حکوومەت یان هەموومان دەگرێ و زیندانیمان دەکا، یان ئێمە بێتاوانی تۆ بۆ دەوڵەت ئاشکرا دەکەین. دیتم خواستی ئەو خەڵکەم پێتێکناچێ، کوتم: ئەگەر وایە جەماوەرەکە زۆر زوو بڵاو بن بۆ دێیەکانی دەوروبەر وەک «عەنبار» و «هەباسئاوا» و «ئەسپۆغە» و «دونگوز». سبەینێ لێرە کۆدەبینەوە و دەچینەوە مەهاباد.

شەوێ لە داشبەند مامەوە. سبەینێ بەر لەوەی ئەمن هەستم، حەشیمەتەکە کۆببوونەوە. ڕێی وتارم نەمابوو. ئەمن لە پێشەوە و جەماوەر بەدوامەوە. لە پێش دادگایە تکام کرد ئەورۆ دادگای داگیرنەکەن. سێچوار ڕدێنسپی خۆیان ڕەگەڵ خستم و چووینە وەتاغی دادستان. هەتا ئێمە چووبووین دادستان لەگەڵ ئیتلاعاتی ورمێ دوابوو و وڵامی ئەوانیش هەر نا و نا بووە.

دادستان سپاسی کرد لە کردەوە و ڕابردووی من، کوتی: ئەگەر ئینقلاب تەڕ و ویشکی پێکەوە نەسووتاندبا، دەبوو بتکەنەوە نوێنەرەکەی جاران. ئەگەر تۆ ئەرکی پێسپێردراوی خۆت بە ڕووسووری پێکنەهێنابا، ئەو خەڵکە ئاوا جوابگۆی ئەرکناسی و ئەمەگداری و وەزیفەزانی تۆ نەدەبوون. لەوەی کە حکوومەت داوای مووچەی مانگانە لە نوێنەران دەکاتەوە، ئەمن بە ناوی دادستان شەرم دەمگرێ. لە دوایە ئەو پێشمەرگانەی و بۆکانی بانگ کردن کە ئەمنیان گرتبوو. ئەوەی ڕاستی بێ ناحەزان و خەنیمانی من لەو هەلومەرجەدا

ئەم داوەیان بۆ نابوومەوە هەتا بە قەولی خۆیان تۆڵەی دەورانی پێشووم لێبکەنەوە. بەڵان لە ڕاستیدا من نوێنەری ئەو هەزاران کەسە بووم ، کە بەپێچەوانەی هەنگاوی ناحەزی ئەوان، ئەمنیان بە قارەمانی ئیدە و ئارمانی میللی و نەتەوەیی خۆیان ناساند. دادستان ئەو چەکدارانەی بانگ کرد کە هێنابوویانم و پێیگوتن: کێ بە ئێوەی ئەسپاردووە کە خەڵکی بگرن، یان بە ویستی خۆتان تاوانبار دیاری بکەن؟ لە دوایە دادستان ڕاگەیەندراوێکی بۆ ڕادیۆ نووسی کە: «هیچ دەستە و لایەنێک بێ فەرمانی دادگای ناوچە، مافی گرتنی کەسیان نیە و دادگا بۆخۆی بە کاری خۆی ڕادەگا.»

کوڕە بۆکانییەکان نامهەوێ ناویان بێنم، هەرسێکیان ئەندامی حیزب و خوێندەوار و باسەواد بوون. نەیاندەزانی کە هێندێک بێچووەگەورک کەوڵی مەڕیان لە خۆ وەرێناوە و دەیانەوی کین و تووڕەیی کۆنەڕقیان وەرگرنەوە.

دوای ماڵاوایی لە دادستان، ئەو جەماوەرەم لەگەڵ خۆم بردە کومیتەی حیزبی دێموکرات. بەداخەوە لە سەرانی حیزب، تەنیا «کەریمی حیسامی» و «حەمەدەمینی سیراجی» لەوێ بوون کە هەردووکیان کۆمۆنیستێکی دووئاتەشە بوون نەک ناسیۆنالیستێکی وەتەنپەرست. دەمهەویست حیزبی دێموکرات، کۆبوونەوەیەک لە دێی عەنبار پێکبێنێ و بیروڕای حیزبی بۆ خەڵک شیکاتەوە. دوای دیداری مامۆستا شێخ عیززەددین و سپاس لە کردەوەی مامۆستا عەبباسی، هاتینەوە بۆکان. نەمویست ئەو جەماوەرە بە خەیابانی شاریدا بێن، بە جادەی کەمەربەندیدا هێنامیانەوە ماڵێ و دوای سپاسی زۆری من، بڵاوەیان کرد.

## ئەندامی حیزب کێ بوو؟ حەمەدەمینی سیراجی

## لە چی دەگەڕا و چی گوت؟

دوو ڕۆژ پاش ئازادبوونم، بە وەرزێرە گوندنشینەکانم ڕاگەیاندبوو کە حیزبی دێموکرات کۆبوونەوەیەک لە دێی عەنبار پێکدێنێ. بۆ ڕۆژی دیاریکراو ئامادە بن. دوای سێ ڕۆژ، دوو لاوی خەڵکی عەنبار هاتن و کوتیان کۆڕەکە پێکهاتووە و پێنج کەس لە ئەندامانی حیزب هاتوون. ئەمنیش لەگەڵیان سوار بووم و چوومە مزگەوتێ کە جێی کۆبوونەوەکە بوو. مزگەوت چیمکوت بوو لە

وەرزێـرانی دەوروبــەر. لــە پـێش دەرکـی مزگـەوتیش گـەنج و لاوانی لادێـی ڕاوەستابوون.

کە چوومە ژوورێ، ئەندامێکی حیزبی قسەی بۆ دەکردن. لە نیزیک میحـرابی مزگەوتێ دانیشتم. چوارکەس لە ئەندامانی حیزب بەڕیز لـەولاتر دانیـشتبوون. نەمزانی ئەو ئەندامە لە پێش‌دا چی گوتبوو. لە دوایی‌دا کوتی: «ئەندامی نەبەز و بەڕێزی حیزب، کاک «حەمەدەمینی سیراجی» بەیاناتێکی هەیە و دەیهەوێ لـەو کۆڕەدا بە چینی زەحمەتکێشان و کارگەرانی بێبەش و بژیوی ڕاگەیەنێ.» پاشـان ئاغای سیراجی بۆ ناساندنی ئەرکی خۆی و کاک کەریمی حیسامی و مامەغـەنی کە سالانێکی زۆر لە دوورەولات و غوربەت‌دا چیها چەوسانەوە و چەرمەسەری لە ڕێی ئارمان و ئاواتی خۆیان و لە ڕێی ئازادی و بەختەوەری ئەو چینە دیویانە و نەبەزیون کوتی: «لە دوورەولات بـۆ ڕوونـاک کردنـەوەی ئـەو دەولّـەتانە کـە پشتیوانییان لە ئامانجی پیرۆزمان دەکرد و ئێمە بە کردەوە و ڕادیۆ و ڕۆژنامە و گۆوار کارمان گەیاندۆتە ئەوڕۆکە، ڕۆژێکـی ئـاوا دەراوڕوون بـۆ گەیـشتن بـە ئاواتەکانمان. بەلان برایانی ڕەنجبـەری ولاتەکـەمان، ئاگاتـان لـە خۆتـان و دەوروبەری خۆتان هەبێ کـە لـە نێـو کۆمەلّـی خۆتـان‌دا کەسـانێک هـەن کـە بەپێچەوانەی خواست و ویستی ئێوە دەبزوونەوە و هەنگاو دەهـاوێژن و بـەرەو هەلّدێر دەتانڕەتێنن. بێخەبەر مەبن، نوێنەری ئێوە لە دەورانی شا و ئێـستاش دەیهەوێ، لە بیر و خەوی هەرگیز وەخەبەرنەهاتوودا بتانهێلّێتەوە.»

وادیار بوو نەیدەزانی نوێنەری ئاماژەپێکراو لە کۆڕەکەدایە و پێکهێنەری ئەم کۆبوونەوەیە لە گوندی «عەنبار» بۆ حیزبی دێموکرات بووە، نە بۆ خۆنواندنی چەند جووجکە توودەیی و کۆمۆنیست. چەند کوڕە کەشاوەرز نەیانهێشت ئاغـای سیراجی درێژە بە وتارەکەی بدا، وەجواب هاتن و کوتیـان: «ئاغـای سـیراجی، ئامۆژگارییەکەت جێی خۆی نەبوو. نوێنەری ئێمە لە دەورانی شادا یەکێک بـوو لە چین و تـوێژی خۆمـان، ئاشـنا بـە دەرد و ڕەنجـی ئێمـە و لـەو ڕێگایـەدا هەرچەندی لە توانای‌دا بوو، درێغی نەکردووە و لە ڕچەی بەهرە و سوودی ئێمە لای نەداوە.»

لێرەدا بەپێویستم زانی کە جوابی بدەمەوە، کوتم: «ئاغای سیراجی ڕێ بدە و

بوارم بدەیە کە بۆ ڕوونبوونەوەی خۆت، بڕێک سەبارەت بە کردەوەی خۆم بەسەرهاتی ئەو خەڵکە لەو هەرێمەدا بدوێم و کوتم: لەو کاتەوە کە ڕەفیق «مامەغەنی» بە تاوانی توودەیی لە زیندان کرا و خودی جەنابت لەگەڵ کاک «کەریمی حیسامی» بۆ ڕاگەیاندنی مەرامی کۆمۆنیستی لە ڕادیۆکانی دەوروبەردا «بژی ئەستالین»تان ببوو بە خەو و خواردن و لە بیرتان چووبۆوە ئەگەر ڕەفیق ئەستالین خودموختاری کوردستان و پێشەوای نەمری لەگەڵ شای ئێران بە نەوت و زێڕ سەودا نەکردبا و ئەو هەلومەرجەی بۆ نەتەوەی کورد وەدیهاتبوو بە دەستی دەوڵەتی شووڕەوی تەحویلی شای ئێران نەدرابا و پێشەوا و ڕێبەرەکان ئیعدام نەکرابان، ئەوڕۆکە دوای ٣٢ ساڵان ئەمن و تۆ نێوونیتکەمان لێکهەڵنەدەدا و بەباشی یەکترمان دەناسی؟ ئەمن پێم وایە هەر بێچووە کوردێکی بەشەرەف ئەو ئەتکەی لەو زەمانیدا بە سەر نەتەوەی کورد داسەپێندرا لە بیری ناچێتەوە. ڕەفیق سیراجی، ئەو کاتەی ئەتۆ و ڕەفیق کەریمی حیسامی لەودیوی سنوورەکانەوە ملتان دەکێشا بزانن لە نێو نیشتمانەکەتاندا خەبەر چیە، ئەمن و ئەو وەرزێرانە لەگەڵ فیئۆداڵ و ملووکوتتەوایفی و عێلبەگی ململەمان دەکرد. لە گۆڕانکاری شێوازی ئیسلاحاتی ئەرزی و هەڵکەوتی هەلی هەڵوەشانی ڕژێمی ئەرباب و ڕەعێتی کە لە درێژایی دەوراندا هۆی چارەڕەشی دێهاتییەکانی پێکهێنابوو، بە یەکگرتوویی و پاڵوێکدان لە بەرامبەر ملهوڕەکاندا هەوڵمان دا هەتا گەیاندمانە ئەوڕۆکە. ئەتۆی ئاوارەی هەندەران بۆیە بە ڕاشکاوی و لە خۆڕادیوی دەتوانی کۆڕ و کۆبوونەوە لە نێو ئەو چینوتوێژەدا پێک بێنیێ کە سیوچەند ساڵ لێرەوبەر شووڕەوی کێشا و داینەڕشت و ئێمە لە پەنای «ئینقلابی سپی» و یەکگرتوویی خۆمان وەدەستمان هێنا و دەبینی بە بێ دیمەنی ئەرباب و فیئۆداڵ لەم کۆڕەدا بەشداری دەکەی. ئاغای سیراجی ئەمن ئاشقی چاووبرۆی شا نەبووم. ئەمن لایەنگری ئینقلابی سپی بووم کە زنجیری کۆیلەتی لە ئەستۆی نەتەوەی کورد دارنی. ئەمن بەدخوازی مالیک و ئاغاوات نەبووم، ئەمن و میلیۆنان دێهاتی و وەرزێر، بێزار لە ڕچە و ڕێبازی ڕژێمی ئەرباب و ڕەعێتی بووین. ئەمن بە نێوی وەرزێرێکی خوێندەوار و خاوەنئەزموون ئەو مافەم بە خۆم نەدا لەم هەل و هەڵکەوتەدا کە بە سوودی خەڵک بوو لەو بەربەرەکانییەدا هەنگاوهاوێژ نەبم. هەر ئەو بزۆزییە بە سوودی خەڵک بوو کە

بە ناوی نوێنەر ناردیانمە مەجلیسی شوورای میللی.

بەکورتی کۆبوونەوەکەمان بوو بە شەڕەدندووکەی من و ئاغای سیراجی. کاتێک ئەندامی حیزبی توودە دیتیان خەنەکەیان ڕەنگی نەگرت هیچ، هێندێکیش کاڵ بوونەوە، هاتنە دەرێ و سواری ماشێنەکەیان بوون و ڕۆیشتن. دووبارە گوندنشینەکان لە دەورم کۆ بوونەوە و کوتیان ئەم کۆبوونەوەمان بە ڕاسپاردەی تۆ پێکهێنا و لامان وابوو کە ئەوانە ئەندامی حیزبی دێموکراتن، ئەگەر زانیبامان ئەوانە لە لادەرەکانی مەسڵەحەتی نیشتمانن، هەرگیز هاونشینیان نەدەبووین.

## هرووژمی پاسدار و جاشەکان و گرتنەوەی شاری بۆکان

لە هاوینی ساڵی ۱۳۵۹ هێزی حکوومەتی ئاخوندی دەیهەویست بۆکانیش داگیر بکا. هەتا ئەو دەمەی شاری بۆکان لە دەس لایەنە سیاسییەکاندا بوو، هەر لایەنەی ئارمان و ڕێبازێکی جیای بۆخۆی هەڵبژاردبوو. حیزبی دێموکرات و کۆمەڵە و خەبات، لایەنەکانی نێونەتەوەیی بوون و دیاربوو چیان دەویست و داواکاری چی بوون. بە «ڕێکخراوی موجاهیدین» و «ڕاهی کارگەر» و «حیزبی توودە» چیان لە کێ دەویست و بۆ لەو هەرێمەدا جێگیر ببوون؟ ئەمانە بێ ئەوەی بەرنامەیەکی هاوبەشیان پێکەوە هەبێ، هەرکام بە دەستەیەک چەکداری خۆیانەوە لە مەقەڕێکدا جێگیر و دامەزرابوون.

هێزی سپای پاسدار و جاشەکان لە لای «میاندواو»ڕا شاڵاوێکی بەربلاویان لە زەوی و حەواڕا دەس پێکرد. گرووهەکان دوای هێندێک بەربەرەکانی و قوونەشەڕ شاریان بەجێهێشت هەتا کوشت و کوشتار لە شاریدا ڕوونەدا و لە دێهات و گوندەکانی دەوروبەری بۆکان مەقەڕ و پایەگای خۆیان دامەزراندەوە. وەزعی شاری بۆ هێندێکان کە سەر بە دامودەزگای ڕژێمی ئاخوندی نەبوون، پێشمەرگەی موسوڵمان(جاش)، تەنگیان پێهەڵێنابوون. جاشەکانی خۆوڵاتی خەڵکیان دەناسی و ئەوی مۆر و پنجی «جاشوولکە»ی پێوە نەبووایە دەیانهێنا حەولەوەلایە.

ئەمن لە دێی «عەنبار» بووم کە شاڵاویان بۆ بۆکان برد. نێو دێ و قۆرغ و باغی عەنباریان وەبەر تۆپ و چەکی قورس دا. بەداخەوە کوڕەسەیدێکی

١٣ساڵەی گاوان، بە تیری وێڵەکی کووژرا و چەند سەریش گاوگۆلی خەڵک تێدا چوون.

## چارەی من چ بوو؟ چۆن بچمەوە بۆکانێ؟

لەو بگرەوبەردەدا لە بۆکان یان گوندی عەنبار، ڕێگەی مانەوە بۆ من نەمابوو، تەنیا جێیەکی کە دەبوو لەو حاڵەیدا لێیداسەکنێم، مەڵبەندی گەورکایەتی و گوندی گڵۆڵانی سەرێ بوو کە بنەماڵەی خزموخێش و ناسیاوم لەوێ زۆر بوون و جێگەیەکی بێدەنگ بوو.

ماشێنێکم بەکرێ گرت، لای نوێژی شێوان بە ڕێگای «شاریکەند» و «قەرەگوێز»دا بەرەو مەڵبەندی گەورکان وەڕێکەوتم. لە قەراغ گوندی «قەرەگوێز» سێچوار جەوانی چەکدار پێشیان بە ماشێنەکەم گرت. لەبەر شۆقی ماشێنەکە ناسیمنەوە، لاوەکانی بنەماڵەی ئاغایانی موهتەدی بوون. کە ئولفەت و عەلاقەی زۆر لەمێژینەمان پێکەوە بوو و لەگەڵ قاسمئاغای ناسراوی گەورەی ئەو بنەماڵە لە دەورانی کۆمەڵەی (ژ.ک)را هاوبیر و هاوڕاز بووین، کوتم کوڕەکان ئێوە بۆ گەیشتوونەتە ئێرە و چ دەکەن. کوتیان: قاسمئاغامان لەگەڵە و دەیهەوێ بچێتە دیوی بانە. کوتم قاسمئاغا لەکوێیە بمبەنە لای یان بۆم بانگ بکەن. یەکێک لە کوڕەکان چوو بانگی بکا. هێندەی پێنەچوو قاسمئاغا هات. دوای سەلام و چاکوخۆشی کوتم ئەتۆ بۆ لە بۆکان هاتوویە دەرێ؟ کوتی: «وەک دەزانی حکوومەت بۆکانی گرتۆتەوە و ئەمنیش حەوسەلەی جواب و پرسیاری پاسدار و جاشانم نیە و دەمهەوێ بچمە دێی «سیوچی» و لەگەڵ «عەولاخانی شەهیدی» بچینە دیوی ئێراقێ. ئەتۆ بۆ لەگەڵمان نایەی؟ دەزانم ئەتۆ چاک وەردەگرن و زۆریش لە ئاشنا و هاوکارەکانت لە ئێراقن؟ «تیمسار پالیزبان» و «سالاری جاف» بە باوەشی ئاواڵەوە دەتقۆزنەوە و زۆریش لە نمایەندە هەڵاتووەکان لە ئێراقن.» ئەمن عومەری برازام ناردۆتە مەهاباد بە دووی عەولاخانیدا کە حیزب گرتبووی و ئازادی کردووە. کە هاتەوە ئێرە دەچین بۆ «سیوچی» و لەوێرا دەڕۆین بۆ ئێراقێ. ئەی ئەتۆ ئێستا دەچییە کوێ؟»

گوتم: دەچمە «گڵۆڵانی سەرێ» بۆ نێو خزمان. قاسمئاغا کوتی: «گڵۆڵان حاشارگەیەکی وا نیە، ئەتۆ دەبێ لە جێیەکی بێدەنگ و خاترجەم دامەزرێی.

ئەوە نیە «عەلیئاغای ئەمیرعەشایری» و «لەتیفی شێخولئیسلامی»، لە ئێراقێ خاترجەم حەساونەوە؟» کوتم: قاسمئاغا، ئەمن هاوڕێی و هاوکاری تۆ و «عەولاخان»یم، زۆر پێخۆشە و دەزانم ئێوەش بە نێوی سەرعێلی و عەشیرەتی لە لای دەوڵەتی ئێراق زۆر بەڕێز دەبن. ئەمن لە «گلۆلانی سەرێ» دەمێنمەوە و چاوەڕێ دەبم بزانم ئێوە چدەکەن. ئەگەر ئامادەی ئێراقێ بوون خەبەرم بدەنێ هەتا ئەمنیش خۆم ئامادە دەکەم و دێمە لاتان پێکەوە بڕۆین.

بەو قەراروبڕیەوە ئەمن چوومە «گلۆلان» و بەلان چەند ڕۆژێک بەدووی یەکدا ڕۆیشت و خەبەرێک نەبوو. لە دوای ماوەیەک زانیم کە «قاسمئاغا» و «عەولاخان» چوونە ئێراق و گەڕاونەوە. «قاسم ئاغا» چۆتەوە بۆکان و «عەولاخان»یش بەرەو بانە ڕۆیشتووە. بەلان وەک بۆخۆیان دەیانگوت، دەردەسەری و چەرمەسەری زۆریان بەسەر هێنابوون و هەروەها گۆشەگیر و دمقووچاو مانەوە و بە ڕێز و حورمەتی نێوخۆییەوە درێژەیان بە ژیانی ئابڕوومەندانە دا هەتا مردن. لام وایە هەردووکیان نموونە و سەرمەشق بوون بۆ ئەولادان و بنەماڵەی خۆیان. ئەویش لە هەلومەرجێکدا کە حکوومەتی ئاخوندی زۆر پێویستی بە پیاوە نێوبەدەرەوەکانی مەڵبەندی کوردەواری هەبوو.

خواگیان باش دەزانی هەستوخوستم هەڵەی هەنگاوەکەم، ویستی دروستم بەپێی نووسراوی پێنووسی ئەزەل بوو ئەوەی زانیم، ئەوەی ڕوانیم و بیستم

## بەلان حاڵی من لە ماوەی دوو ساڵ لە «گلۆلانی سەرێ»

کاتێک زانیم جارێ دەبێ لە گلۆلان جێگیر بم، ناردم لە ماڵێڕا فەرش و نوێن و خواردەمەنی و دوو مانگای شیریم بۆ بنێرن. وەتاغێکی خاوێنی خزمەکانم فەرش کرد و تێیدا مامەوە. تفەنگێکی تاپڕی ڕاوێم پێبوو و ڕۆژانە زیاتری لە کێو و شاخان دەبووم و کەمتر لە ژوورێدا دەمامەوە و زۆرتر دەچوومە ڕاوی کەو و مراوی و پۆڕ و کوڕکوڕ کە لە سەر کانیاو و ئاوخۆڕاندا زۆرم وەگیر دەهێنان. جارجار براکان و ژن و منداڵم دەهاتنە دیدارم و بەو شێوەیە دووساڵان لە گلۆلانێ مامەوە. لەسەر ناڕەحەتی و ئاوارەیی خۆمدا، دەردی زامی لەمێژینەی مەعدە زۆری ئەزیەت دەکردم. دەستم بە دوکتوران ڕانەدەگەیشت. دوکتورێکی

ئەندامی حیزبی دێموکراتم وەدەس کەوت، ئەویش بێ دەرمـان و دەوا . حیـزبی دێموکرات و کۆمەڵە و خـەبات، مـەفرەزە و مەقـەڕیان لـە ناوچـەی گـەورکان دامەزراندبوو و زۆرجاران دەهاتن و لە گلۆلان میـوانم دەبـوون. لکێکـی حیـزبی دێموکرات مەفرەزەیان لەوێ بوو و لە گوندی «سلامەت» و «ساردەکۆستان»یـش حیزب و کۆمەڵە و خـەبات جـێگیر بـوون و لـە گونـدەکانی «موکریـان» و لای سەقزیش نیشتەجێ بوون و جاش و پاسدارەکانی ڕژێمی ئاخوندی لـە دێهـات و ناوچەکاندا جێپێ و ئاسەوارێکیان نەبوو.

## هەڵمەتی هەمەلایەنەی سپای پاسداران بۆ پاکسازی ناوچەی گەورک

لە هاوینی ساڵی ١٣٦٢، هێزی سـپای پاسـداران و جـاش و بەسـیجی، بـۆ پاککردنەوەی مەڵبەندی «گەورکان» لە لایەنە سیاسییەکان و هێزی پێشمەرگە، لە سێ لاوە هێرشیان هێنا. دەبێ بڵێم هەتا ئەو کاتە دێهاتی دەوروبەری بۆکـان بەپتوونی لە ژێر چاوەدێری پێشمەرگەدا بوو. حکوومەتی ئاخوندی لەو ناوچەدا شـوێنەوارێکی دیـار نـەبوو. هەڵـمەتی حکوومـەت لـە لای سـەقز و بۆکـان و مەهابادەوە، بەرەو ناوچەی موکری و گەورک دەستی پێکردبوو. ئەمنی بێخەبەر لە هەموو لایەک وەک هەمیشە چووبوومە ڕاوی کـەو و کوڕکـوڕان. لـە داوێـنی شاخی بەرزی قەرەقایە لە نیزیک کـانی و ئاوێـک، سـیپە و حەشـارگەم سـاز کردبوو کە لای ئێواران جێگای ئاوخۆرکەی باڵندان بوو. پاش جەمی ئێـواران لای عەسرێکی درەنگ بوو، خۆم لە سیپەدا حاشاردابوو. سەروحەدی هاتنی کەوەکان بوو. لەنەکاو گرمەیەک لە قەدی شاخی قەرەقایە بڵیند بوو. کە ڕوانـیم ئـاور و بڵێسە لە دوندی شاخی بەرزبۆوە و گاشەبەرد و تـاوێر خێزەریـان کـرد بـەرەو داوێن. دیاربوو بە تۆپی دوورهاوێژ بەندەنی پاڵ «قەرەقا»یان تۆپبـاران دەکـرد. دووربینێکی چاکم پێبوو، کە ڕوانیمە کێوەکانی «قەڵای قۆزلـوو» و تیرەشـانی ملەی «بۆبەکتان»ی دیار بوو لەو تیرە شانانەوە ئەم کێوانەیان دەکوتا. لە ملەی «بۆبەکتان»ی‌ڕا هێزی پاسدار و بەسیجی و جاش وەدەرکـەوتن و سـەریان هێنـا دەرێ. دەستەیەک پێشمەرگەی کۆمەڵە، لـە نێـو دارەگوێزەکـانی دێـی «کـانی درێژ»ێ کە پاشەکشەیان کردبوو، گەیشتبوونە خوار دارەگوێزەکان. بە دووربین دیتم یەکێک لەو پێشمەرگانە ئەنگوا و دووسێ سەرمەقولاتی لێدا و لە بن دارێکی

ماتەی هەڵگرت. پێشمەرگەیەک گەڕاوە سەری و بە خێشکەخێشک ڕایکێشا بۆ نادیاری. ئەوانی دیکەش بە قوونەشەڕ بە نادیاری‌دا بەرەو داوێنی کێوی داکشان و خۆیان نەدیو کرد. لە دوایە پێم‌زانی بریندارەکە کچێکی پێشمەرگەی ئەندامی کۆمەڵە بوو.

پێویستە لێرەدا بڵێم کە هۆنراوەی «بلێ سلێ هەلێ...» لە ژێر ناوی «چاووڕاو» کە لە ژمارە ٤ی گۆڤاری «مەهاباد»دا بلاو کرابۆوە، دەڕوانێتە ئەو دەورانی کە پاشان دەستم تێوەبردووە و ئێستا جیاوازی هەیە لەگەڵ دەقی باس‌کراو. ڕۆژ تینی دیتنی ئەو دیمەنە ناحەزەی نەمابوو، بە هەلاتن ئاوابوو. سیرە هەڵگیرا. دووربین هاتە ئەوەی پێش خۆشی نەبینێ. تفەنگم لە شانی کرد و بەرەو گلۆلان تێکشام. کە هاتمەوە نێو دێ. پۆلێک پێشمەرگەی حیزبی دێموکرات لە کۆلانی ئاوایی‌دا وتووێژیان بوو کە چ بکەن و چ نەکەن. فەرماندەی پێشمەرگەکان لاوێکی زیت و وریا بوو بە ناوی «عەبدوللا». کە ئەمنی دی کوتی: ئاغای نووری پێم وایە ئەتۆ ئەوشۆ لێرە نەبی باشە. بچۆ بۆ دێی «یاغیان» و لەوێش لە سەر هەست و وریای هێرشی پاسداران و جاشەکان بە کە دەیانهەوێ ناوچەی بەتەواوی لە هێزی پێشمەرگە بەتاڵوحەتاڵ بکەنەوە.

با ئەوەش بڵێم بۆ ماوەی دوو ساڵ کە لە «گلۆلان» نیشتەجێ بووم، لایەنەکانی کۆمەڵە و دێموکرات و خەبات زۆریان ڕێز دەگرتم و لە وەخت و بێ‌وەختی‌دا ئاگادارم بوون، لە حاڵێکی نە کۆمەڵە و نە دێموکرات و نە خەبات بووم، بەڵکوو ئاسەواری (ژ.ک)ی وڵات بووم، دەمزانی چیمان دەوێ؟! نەماندەزانی چ بکەین!!

## ڕۆژگارێکی ڕەش و شەوگارێکی چەتوون

بە ڕێنوێنی کاک «عەبدوللا»، پاش شام یەکێک لە خزمەکانم لەگەڵ خۆم خست و چوومە گوندی «یاغیان»ی نیزیک «گلۆلان». شەودرەنگێک گەیمە جێ و لە ماڵی ئاشنایەک وەژوورکەوتم. لە پاش بەخێرهێنان و باسی هێرشی پاسداران بۆ ناوچە، جێگایان بۆ ڕاخستم و چوومە جێگاوە. بەڵان لەبەر ئێشی دەردی مەعدە و فکر و خەیاڵ، جینگڵم دا هەتا بەرەبەیان.

لە بەینی خەو و بێداری‌دا بووم کە کچۆلێکی خاوەن‌ماڵ بە لێوەلرفە

وەڕوورکەوت و کوتی: ئەی بابانم خرابێ، لەخۆم قەلەندەرێ، خۆ پاسدار هاتوونە بەندەنی پشت ماڵان! لە جێگا دەرپەڕیم و کوتم: کێ وا دەڵێ؟ کوتی: ئەوەتا لە پەنجەرەڕا بە کێویەوە دیارن. کە هەستام لە پەنجەرەڕا تەماشام کرد، لە بەندەنی پشت ئاواییەوە ئاسۆگیان دابوو. جارجار بەرەو ئاوەدانی خۆیان نیشان دەدا و ونەدەبوونەوە. وڵات ڕوون ببوو. هەرام لە سەید تاهیری تازەلاوی هاوڕێم کرد و کوتم: هەستە هەتا نەهاتوون لە دێ وەدەرکەوین. هاتینەدەرێ و بەرەو باغ و دارستانێکی کە بە پاڵی کێوەکەوە بوو تەماشای بستووی پشت ئاوەدانیمان کرد. پۆلێک چەکداری لێ دیار بوو، مەعلووم نەدەبوو پاسدارن یان پێشمەرگە. کوتم: سەید تاهیر مانەوەمان لێرە بێسوودە . هەستە زۆر گورجانە لەم بستووە سەرکەوین و ئاوابینە «دۆڵی کۆخێ» و لەوێڕا لە ملەی «ساردەکۆستان»ێڕا شۆڕبینەوە و بچینە «ساردەکۆستان»، مەقەڕی «خەبات». لەو تیرەشانەی پشتی «یاغیان» کە چەکدارەکانی پێوەبوو، لەگەڵ ئاسۆگمان دا، دوژمنت ڕۆژی ڕەش نەبینێ، وەبەر ڕەگباری تیربار و موسەلسەلیان داین. لە هەڵاتن و خۆنەدیوکردن زیاتر چارەیەکمان نەبوو. نازانم چۆن نەهەنگواین. ئەو گوللەبارانە بە کوێدا ڕۆیی کە ئێمەی نەگرتەوە. بەڵان:

اگر تیغ عالم بجنبد زجای نبرد رگی گر نخواهد خدای

ئاوەژوو بووینەوە و کەوتینە نەدیوی «دۆڵی کۆخی» بەڵان بە سەر چ دیمەنێکدا کەوتین! هەزاران زیندەوەر، مەڕ و ماڵات و ژن و منداڵی گوندی «سلامەت»، پێشمەرگەی تەقاوی مەقەڕەکان، پیرەپیاو و پیرەژن و منداڵی نەخۆش و مەلۆتکە، وەرویرکە بە سەریەکدا کەوتبوون و تێکخزابوون. لە کێوەکانی پشت «سلامەت»ەوە، ملە و بانوەکانی «کۆخان» و «سارده کۆستان»ی بە تیربار و تۆپ و موسەلسەل دەکوتا و ئەو حەشیمەتە لەو دۆڵە خزابوون و نەیاندەوێرا سەر لە ئاسۆگێ بێننەدەر.

گوتم: سەید تاهیر بەو دۆڵەدا هەڵکشێین هەتا دەگاتە نیزیک لووتکەی کێوی. سەیدتاهیر کە بۆخۆی ئەندامی کۆمەڵە بوو، دیمەنی دڵتەزێنی ژن و منداڵ و پێشمەرگەی ڕەتاو پەرێشانی کردبوو. هێزی تێکشکاوی پێشمەرگە بە شاخانەوە حاڵەتی شەڕ و هەڵاتنی بەخۆیەوە گرتبوو. بە دۆڵێدا کە نادیار بوو وەسەرکەوتین، هەتا نیزیک بستووی کێوی «ساردەکۆستان»، کوتم: هەتا ئێرە

بە ساغی هاتووین، لەگەڵ لە بستوو و تیرڕەسی پاسداران نیزیک بووینەوە، ئەتۆ جەوان و توندوتۆڵی، هەرچەندی تین و تاوت هەیە، لە بستووڕا خۆ بگەیەنە نەدیوی، ئەمنیش بە پێی خۆم وەدووت دەکەوم، یان دەردەچم، یان دەمپێکن.

سەید تاهیر لەسەر بستووی هەڵات و خۆی نەدیو کرد و ئەمنیش زۆر بە هێمنی و بە حەوسەلەی هەنگاوی شلوشەوێقم ئەو مەودایەم پێوا و لە تیرەندازی پاسداران کەوتمە نەدیو و نادیار. پێشمەرگە پۆلپۆل و یەکیەک و دوودوو، بە بن ڕەوەز و تیرەشاخاندا دەڕۆین و دەخزانە حاشارگاکانەوە. لە کێوەکانی ئەوبەریشڕا پاسدار تیرەندازییان لێدەکردین. ئێمە سەرەوژێر بووینەوە بەرەو «ساردەکۆستان». بێخەبەر لەوەی کە سپای پاسداران گۆڕستانی «مەلازادە»یان گرتووە و لەوێڕا نێو دێ و کێوپارەکان گوللەباران دەکەن. هەتا نەگەیشتینە نێو گوندی «ساردەکۆستان»، ئەوەمان نەزانی کە مەلازادە گیراوە. تازە پاشەکشەمان پێنەدەکرا. خۆمان لە نێو دێ کوتا و بە پێش مەقەڕی ڕێکخراوی خەباتی «مەلاکەریم»دا تێپەڕین. دەرکی مەقەڕەکە لە سەرپشت کرابۆوە. سەماوەر و چادان بەجێمابوون. بۆخۆشیان لە نێو گوللەباراندا خزابوونە خڕاوکە و شیوەڵەی نێو دێ.

لەو شیوەڵە و خڕاوکەی نێو دێوە، پێشمەرگە و خاوخێزانیان بە زگەخشکە و کووڕەکووڕ خۆیان نەدیو دەکرد. لەگەڵ سەید تاهیری هاوڕێم خۆمان خستە نەدیوی تیرەندازی پاسداران. بەرەوژوور پێچەڕێیەک بوو دەچووە نێو دار و باغ و مێشەیەکەوە کە پۆلپۆل پێشمەرگەی حیزب و کۆمەڵە و خەباتی تێخزابوون. دیاربوو دوای شەکەتی و ماندوویی ڕەتاندنی شەو و ڕۆژێک، لەو بن دارانە تخێل ببوون و ماندوویی ئەو ماوەیان لە خۆیان دەڕەتاند. دیتم لە لایەک کاک «مەلاکەریم»ی سەرپۆلی حیزبی «خەبات»، لەگەڵ چەند کەس لە چەکدارەکانی خەریکی چالێنان و حەسانەوەن. مەلاکەریم کاتێک ئەمنی دی، بڕێک ڕاما و کوتی: ئاغای نووری ئەتۆ چی و ئێرە چی؟ ئەتۆ چی و تەقوڕەوی چی؟ جارێ وەرە دانیشە تاوێک وەحەسێ و چایەک بخۆوە، جا ئەوجار دەردی دڵان هەڵدەڕێژین. کوتم کاکەمەلا لە دوێنێشەوێوە هەڵوەدام و دانەسەکناوم. مەعدەشم وەژانکەوتووە و حەجمینی لێبڕیوم. چەند تۆشە و بیسکویتی

پێمانــە، هــەر پێمانــە و ماوەتــەوە و لەبــەر هــەڵاتهــەڵات فریانەکــەوتووین بیانخۆین. دەهاتم بۆ مەقەڕی تۆ، ئەویش ماڵی بێ دەرکوبان!

## مەلا کەریم کێ و چ بوو؟

کاتێک ئەم بیرەوەرییە دەنووسمەوە کە مامۆستا «مەلاکـەریمی ڕاوچـی» لـە ڕاوی ژیان کەوتووە و دوو ساڵە خـوای بـانیسـەر لـە کێشمەکێـشمی ڕۆژگـار ڕزگاری کردووە و بردوویەتەوە بارەگای ڕەحمەتی خۆی، «گیانی شادبێ».

مامۆستا مەلا کەریم عالمێکی ئەدیب و هۆنەر و زانا بوو. هەسـتی نەتـەوەیی هێندە زۆر بوو کە مەسـڵەحەتی بـەڕێوەچوونی دنیـایی لـە پێنـاوی ئارمـانی نەتەوەیی دەنا. لە پاش تێکچوونی ڕژێمی شایەتی کە ئارمانخوازەکـانی میللـی لەم ناوچەیەدا حیزب و لایەنی سیاسییان پێکدێنا، حیزبی دێموکرات و کۆمەڵە، بزووتنەوەی ئارمانییان دەسپێکرد. مامۆستا مـەلا کـەریم بـە هاوکـاری «مـەلا شێخجەلالی حوسێنی» حیزبی «خەبات»یان پێکهێنـا و ئەنـدامێکی زۆریـان لـە مرۆڤە خوێنـدەوار و دینـدارەکان کـۆکردەوە و هـەتا مـاوەی بزووتنـەوە لـەم ناوچەیەدا درێژەی هەبوو، بیر و باوەڕی نەتـەوەی لەگـەڵ خـۆی دەگێـڕا. لـە دواڕۆژەکانی ژیانیدا زۆربەی کاتەکانی خۆی بـە هـۆنراوە و پەخـشان دەبـردە سەرێ و گۆواری «سروە» و «مەهاباد» چلۆنیـەتی ژیـان و هێنـدێک هـۆنراوە و پەخشانیان لێ بلاو کردۆتەوە.

لەگەڵ خودالێخۆشبوو مەلا کەریم، ئاواڵـی دێرینـەساڵـی دەورانی منداڵـی بووین و بە خزمایەتی دەگەیشتینە یەکتری. دەمهەویست بە هۆی مەلا کەریم کـە بنکەی حیزبەکەیان لە ئێراق لە ژێر چاوەدێری «مەلا شێخ جـەلالی حوسـێنی»دا هەڵدەسووڕا، بڕۆم بۆ ئێراق و خۆم لەم هەمووە چەرمەسەرییە ئازاد بکەم. چەند جارێک مەلا کەریم ئامادەیی خۆی بۆ بردنی من بۆ ئێراق پـێڕاگەیانـدم، بـەڵان پێبەندبوون بە خاوخێزان گڕی ئەو ئاواتەی منی دەکووژاندەوە. غەمم دەخوارد و بێحەجمین لە جێیەکی بێدەنگ و هێمن دەخولامەوە و دەسووڕام.

... کاتێک بڕێک بووژامەوە و هاتمەوە نێوخۆم، کـوتم: مەلاکـەریم ئـەمجار لێبوردووم و بەڕاستیمە، دانیشتنم لەم وڵاتەدا تامی نەماوە، دەبێ بە یـەکدوو کەس لەو کوڕە چەکدارانەدا بەڕێم بکەی بۆ ئێراق و لە دوایەشدا ماڵ و منداڵم بۆ

بەڕێکەی. بە سەید تاهیری هاوڕێم گوت: ئیدی کارم بە تۆ نەماوە، ئەتۆ ئەوشۆ بچووە «مێرگە نەخشینە» و لە دوایە بچۆوە گڵۆڵان و ڕاسپێرە بێن لە بۆکانڕا ئەسباب و شرەوبڕەکانم بەرنەوە و بۆخۆشم لەگەڵ مەلاکەریم و پێشمەرگەکانی دەڕۆم بۆ هەواری «شێنان».

بەکورتی لەگەڵ مەلاکەریم و پێشمەرگەکانی بەرەو هەواری «شێنان» وەڕێکەوتین. پێشمەرگەکانی حیزبی دێموکرات و کۆمەڵە کە هێندێکیان ژن و منداڵیان پێبوو، بەرەودوای یەک، بەدووی ئێمەدا دەهاتن. بۆ کاتی ماڵخەوتنان چووینە ئەو هەوارە، ئەویش هەواری چی، چووینە کۆختەیەکی کە چەند گەز زەویان هەڵکۆڵیبوو و بە لاسکە گوێنی و لکەدار و پڕوپووش دایانپۆشیبوو. چەند لەتکە لباد و کۆنە بەڕەیەکیان لە دەوری نێو گۆڕکێ ڕاخستبوو. دوو منداڵی ڕووت و ژنومێردێکی نەدار لەو کۆختەدا کۆزیلکەیان بەستبوو و دەتگوت ئەرواحی جندۆکەی کێوپارەن. دیاربوو ئاشنای مەلاکەریم بوون. چرایەکی فانووسیان هەڵکرد، ئەمن و مەلاکەریم و سێ پێشمەرگە کە بەو نیوەشەوە، ئەرواحی کێوپارەمان تەکاندابوو، مەلاکەریم بە پێشمەرگەکانی گوت: ئێوە بچنە کۆختەیەکی دیکە هەتا ڕۆژ دەبێتەوە خۆتان دابین بکەن. ئەمن و نووریش لێرە کوروشمە دەکەین. قوڵکەیەکی دوو گەزی کە بە نێوی جێگای خەو بوودڕیان کردبوو، دایان بە من و کۆنە پەتوویەکیان دامێ بەخۆمی دادەم و تێیدا وەرکەوم. لە کاکی هەوارچیم پرسی: ئەدی کاکی خۆم جێگای ماڵات و بەرخ و کاریلەکانتان لە کوێیە؟ کوتی: قوربان کاریلە و بەرخی چی؟ ئێمە بە دوو سەر مانگایان هاتووینە هەوار. ئاوماڵەکانیشم هەروەک من وان، عیلاجمان نیە هەتا خاوەنمەزراکان لە دێدا تفاق نەدروون و گەڵی نەبڕن، نایەڵن ماڵاتی غەیرە وەنێو لێڕەواری کەون، ناچارین ئەوی مانگایەکیشی بێ، دەبێ بڕواتە هەوارێ کە هەوارگەی «شێنان»یان لە «سیاکێو» دایە.

لەو قسانەدا بووین، گاڵ و بوغر پەیدا بوو، ئەو پێشمەرگە و ژن و منداڵانە کە لە دووی ئێمە دەهاتن، گەینە هەواری شێنان. شەو زرینگابۆوە، بەرەو بەرەبەیان دەڕۆیی، هەوای کێوی ساردی کردبوو. زاق و زرووق و لێوەلرفەی ژن و منداڵان ئەو دۆڵەی پڕ کردبوو. ژنێک منداڵێکی بە باوەشەوە بوو، یەکیشی بەدووی خۆیدا ڕادەکێشا. بۆخۆی و منداڵەکانی سەرمایان بوو و وەلێوەلەرزە

کەوتبوون. ئەمن لەو کۆختەیەدا کە پەتووە کۆنێک گەرمی داهێنابووم، لە تاو ئەو ژنە و دوو منداڵەکەی حەجمینم نەما. هاتمە دەرێ و کوتم: دایکەگیان وەرە ئەو جێگایەی من و ئەو پەتوویەش لە منداڵەکانت وەرێنە، هێندەی شەو نەماوە، هەتا تاو دەکەوێ بیانحەجمێنە. ژنە دۆعای بەخێری کرد و خزا نێو جێگەوە. دەستەدەستە پێشمەرگەی حیزب و کۆمەڵە و خەبات، بەرەو دوا دەهاتن. زۆربەشیان ژن و منداڵیان پێبوو. مەقەڕەکانی ناوچەی گەورک و دەوروبەری بۆکانیان چۆل کردبوو. هەتا هاوینی ١٣٦٢ لە شارەکان بەدەر، زۆربەی ناوچە کوردنشینەکان لە ژێر دەسەڵاتی تاقم و حیزبەکاندا بوو و حکوومەت لە دێهاتان شوێنەوارێکی نەبوو، جابۆیە سپای پاسداران و بەسیجی و جاشەکان، فەرمانیان درایە و لە سێ لاوە شالاویان هێنا و ناوچەیان پاکسازی کرد، یانی پاکەکانیان هەلاوارد و ناپاکەکانیان جێگیر کرد!

نەتەوەی کوردی ئاریایینەژاد کە سێ هەزار ساڵ پاشەکەوتی ژیانی لەم ئاو و خاکەدا بووە، بە ناوی پاکسازی، ترکە ڕەپێیدەناو و دەیگوت: «نەکارەسەن؟» (تۆ چکارەی؟) یان «سەن هارالیسەن؟» (تۆ کوێندەری؟) بەڵێ کاری خودا وایە و هیچی لەگەڵ ناکرێ، دەنا ئەگەر ناشوکری نەبا دەمگوت:

**ئەوی ئەیکا خوا، بەخوا کە من بام        بە ڕۆژی ڕەش دەیانکرنم بەکێوا**

هەوای دۆڵ و دەرەی کێوپاران لە هاوینانیشدا، بەرەبەیانان بەتەزوو و ساردوسۆڵە. سەرمام بوو، دەردی مەعدەش زۆری بۆهێنابووم. کە ڕوانیمە دەوروبەری خۆم، کورتانەکۆنێک لەوێ فڕێدرابوو، هەڵمگرت و بە شان و ملمدادا. لە تاو سەرما پەنام بۆ کورتانی کەرێ برد. فەرق ناکا لە هەر کاتێکدا نیاز زۆری دێنێ، لە سایەی کوندی شوومیشدا دەبێ وەحەسێی. دیارە کوندی شووم ئەو خاوەندەسەڵاتانەن کە ئەم خاوخێزانەیان لە لانە و کولانەی دێرینەساڵی خۆیاندا، بە کێو و شاخ و دۆڵ و دەراندا ڕاودەنێن و دەیانڕەتێنن. گیان و ژیانیان دەکووژێننەوە و لایان وایە بەو کردەوە ئەهریمەنییە، دین و ئیمان دەبووژێننەوە. هەڵتروشکابووم، پالووی کورتان وەک جامەدانی بەسیجییان بە سەر شانمدا بەربۆوە.

ڕێچکەی پێشمەرگە و ژن و منداڵ نەدەپساوە و ناڵە و نرکەی ڕێپێوانی

نەخۆش و ماندوو شەکەت، ئەو دۆڵەی پڕ کردبوو. هەوارچی وەک هەنگی قانگدراو هارووژابوون. هەر کەسەی نەخۆشێک، کەسیرەیەک و شەکەتێکی دەگرتەوە و ڕایدەکێشا بۆ نێو کۆختەکەی خۆی. ناسیاو و نەناس بە پێشمدا دەهاتن و تێدەپەڕین. لە نێو ئەوانەدا تارماییەک بە پێشمدا هات، کۆڵەپشتێکی بەکۆڵەوە بوو، بۆنی ئاشنای لێدەهات. کاتێک لێیخوردبوومەوە ناسیم «مامۆستا ئاغای موهتەدی» بوو.

## مامۆستا ئاغای موهتەدی بۆ لێرەیە؟

لەگەڵبوونی ئەوم پێ لە تێکەڵبوونی خۆم سەیرتر بوو. خۆ مامۆستا نە چەکدار بوو نە بەدکار. ئەوە بۆ وەبەر پاکسازی پیسکاران کەوتووە؟ ئەویش کە ئەمنی ناسییەوە لام وایە هەر ئەو پرسیارەی بۆ هاتبووە پێش.

سەلام مامۆستائاغا. سەلام ئاغای نووری. تۆخۆش و منخۆش کوتم، مامئاغا ئەتۆو ئێرە؟ کوتی: دوێنێ هاتبوومە دێی «سەلامەت» مەقەڕی کۆمەڵە هەتا دیداری کوڕەکان بکەم. دەوڵەت شاڵاوی هێنا و ئەمنیش ئەوەندە فریاکەوتم ساکەکەم هەڵگرم و لەگەڵ کوڕەکان وەدەرکەوم، ئاوای لێهات کە ئاوا لێرەم دەبینی!

پێویستە بڵێم، وسێنئاغا مرۆڤێکی بەئارمان و ناسیۆنالیستێکی خوێنگەرم بوو. لە ڕێی ئامانجی نەتەوەییدا بۆ هەموو هاوکارییەک ئامادەگی هەبوو. لە دەوری ڕژێمی شادا مامۆستای قوتابخانە بوو لە دێهات و شار و کاتێک ڕژێم بەرەو سەرنخوونی بوو، دەوری سەرەکی دەگێڕا. کاتێ کە حکوومەتی ئاخوندی کەوتە پاکسازی قوتابخانەکان لە ناوچەدا، ئەو مامۆستایانەی بۆنی نەتەوەخوازییان لێهاتبا، یان ڕابردوویەکی تێکۆشەرانەیان هەبا، لایدەبردن. مامۆستا ئاغای موهتەدی، یەکێک بوو لەو مامۆستایانە کە بۆ بەرجەوەندی حکوومەتی ئاخوندی دەبوو لاچێ و لاشیانبرد. ئەویش وەک هێندێکیان تۆبە و پەشیمانی بۆ مانەوەی بەپێویست نەزانی و بە بیروڕای پاک هەتا ئێستا هەروا درێژەی بە ژیانی خۆی داوە. لەو هەلومەرجەدا ئەویش وەک من کەلێنوکولێنی لێگیرابوو. بەپێچەوانەی وتەی ئەو شاعیرە کە دەڵێ:

خدا گر به حکمت ببندد دری     به رحمت گشاید در دیگری

ئەمن لام وایە کە:

**خدا گر بە حکمت ببندد دری    کە پێت وابێ دەیکاتەوە، زۆر کە...**

گوتم مامۆستا بەڕاستی ئەمنیش نازانم بۆ لێرمم؟ یان سەرداماڵاوی کام گێرمم؟ مامۆستا بەجێی هێشتم و ڕۆیی هەتا لە هاوالان بەجێ نەمێنێ.

زەردەی هەتاو لە سەرانی دابوو، ڕوانیم، تەماشام کرد ئەو دۆڵودەرە دارماڵە لە ژن و منداڵ و پێشمەرگەی چەکدار و بێچەک. سەدان ئینسانی بێ تین و تاوان، سەدان ژن و منداڵی بێتۆشە و بێنان، بە چ تاوانێک لەو دۆڵودەرە خزان؟ مەلاکەریم هەر شەوێ پێشمەرگەیەکی خۆی ناردبوو هەواری «مەریجەڵان» بۆ لای خزمێکی بە ناوی «حاجی سمایل» کە ئەمن میوانێکم بۆ هێناوی بە ناوی محەممەدی نووری. یەکێک لە کوڕەکانت بە سواری یەستر بنێرە هەتا لەگەڵ خۆی بیباتە هەواری خۆتان، ئەوە لە هەواری «شێنان» چاوەڕێیە. تاووبان گەرم داهاتبوو. ڕوانیم ئێسترسوارێک لە تیرەشانی کێوی‌ڕا بەرەو خوار ئاسۆگی داوە. کە دیتمن مەلاکەریم کوتی: ئەوە «حەمەی» حاجی سمایلە. کاک نووری لە دووی تۆ هاتووە. پۆلێک پێشمەرگە، لە زارکی کۆخێک ڕاوەستابوون. چووینە لای ئەوان و ئێسترسواریش گەیشتە خوارێ. مەلاکەریم بانگی کرد: حەمە بادەوە، وەرە ئێرە. حەمە هاتە پێشێ دابەزی. حاجی سمایل تێرێکی تەواوی نان‌وپەنیر ناردبوو. مەلاکەریم قۆڵی لێهەڵماڵی و نان‌وپەنیری لە تێرێ دەرێنا. ئەو پێشمەرگانەی لە دەوروبەری بوون، هەر کەسەی نانێک و بڕێکی پەنیر دایە. ئەوەی پێڕاگەیشت بەشیان دان و لەدوایە مەلاکەریم کوتی: کاکە حەمە گیان ئەوە کاک «نووری»یە، لە خزم و دۆستانی منە و میوانی بابتە و هەتا بۆخۆم دێمە هەوارێ و حاڵی دەکەم، میوانی ئێوەیە. لەو دەمەدا پێشمەرگەیەک هاتە پێشێ و کوتی: مامۆستا ئێمە پێشمەرگەی کۆمەڵەین، کچەپێشمەرگەیەکمان بریندارە، هەتا نیوەشەوێ لەگەڵ خۆمان هێناومانە، لە نیوەشەوێ بەولاوە بێهۆش بووە و بڕێک بەرەو خوارتر لە بن ڕەوەزێک جێمان بۆ چاک کردووە و سێ پێشمەرگەمان لە لای بەجێهێشتووە. داوادەکەم کە ئەو ئێسترەمان بە خاوەنەکەیەوە ڕەگەڵ بخەی تا ئەو بریندارەی پێبکێشینە ئێرە. کوتم: مامۆستا ئەمن دوێنێ ئێوارێ بۆخۆم بریندار بوونی ئەو پێشمەرگەم، لە بەندەنی گوێزانی

«کانی درێژ»، بە دووربین دیوە. ئەگەر وام گوت، ئەو پێشمەرگە چاوی پڕبوو لە فرمێسک و کوتی: بەڵێ ئێمە ئەو پۆلە پێشمەرگە بووین کە لەگەڵ پاسداران تێکهەڵچووین، ئەو کچە پێشمەرگەمان ئەنگاوترا و لە تاریکاندا هەڵمانگرتەوە و تا ئێرەمان هێناوە. کوتم: مەلا کەریم ئەمن بەپێیان دەچمە هەواری «مەریجەلان» با کابرا بچێ و ئەو کچە بریندارە بێنێ. «حەمە»ی، خاوەن ئێستر کوتی: ئەگەر وایە ئەتۆ وردەوردە پێهەڵگرە بۆ سەر بستوو و لەوێ لەسەرم ڕاوەستە، ئەمنیش ئەو بریندارەی دەگەیەنمە ئێرە و دەتگەمەوە.

حەمە و ئێستر پێش ئێمە ڕۆیشتن. مەلا کەریم کوتی کاک نووری هەواری «حاجیسمایل» لە مەزرای خۆیەتی، چۆنی دەبینییەوە؟ کوتم: ڕێگا ونم ناکا، ئەو بابۆڵە نان و پەنیرەشم پێیە، لەوێ چاوەڕێی هاتنی تۆ دەبم و خواحافیز و پێهەڵکرام بۆ سەر ملەی کێوی. لام وایە ئەو هەورازە چەتوونەم بە چلوپێنج دەقیقە پێوا. کە گەیشتمە سەر لووتکە، تەماشای دۆڵی «هەواری شێنان»م کرد. ئەو دۆڵە دوورودرێژە پڕ بوو لە پێشمەرگە کە بە ڕیز و قەتار بە هەورازی لای «سووتوو»دا بەرەو «بەردەڕەش» جەلەیان بەستبوو. بە تیرەشانی «سیاکێو» و لێڕەواریدا دەستم وەبەر ئەژنۆم دا و تەماشای ئەو دیمەنە دڵتەزێنەم دەکرد. خودایە تا کەنگێ ئەم نەتەوەیە لە خانوو و خاکی خۆیدا غەوارەیە و غەیرە ڕەپێی دەنێ؟ مەگەر لەوە زیاتر کە دەڵێن ئینسانین و دەمانەوێ لە خاک و نیشتمانی خۆماندا ئینسانی بژین، چی دیکەیان داوا کردووە کە ئاوا دەبێ ئەو کەفارەت و غەرامەتە بدەن و ببژێرن؟! لە سەر دوندی کێویڕا هەموو جموجۆڵێکی نێو دەرەی دەهاتە بەر چاوان. حەمەم دەدی کە کچۆڵەی برینداری بە کۆڵی یەستری داداوە و بەرەو هەورازی لای «بەردەڕەش» هەڵادەچوون. ئیدی خاترجەم بووم کە حەمە و یەستری نابینمەوە و لە فریام نایەن، یاریم کەوتە سەر پێیەکانم. دەبێ بەپێیان بکوتم ڕێیان.

ڕێگا شانەوشانی کێوی درێژەی هەبوو. لە لابەندەنێک، پیاوێک کەتیرەی دەکرد، بە چلاوچلی گوێنیاندا دەگەڕا. کاکە ماندوو نەبی، خۆشبی کاکی ڕێبوار. کاکە ئەمن دەمهەوێ بچمە هەواری «مەریجەلان»، داخوا زۆرم ماوە بیگەمێ؟ ئەرێ کاکە، بەو هەنگاوەی ئەتۆ دەیهاوێی، بۆ نیزیک نیوەڕۆیە دەگەیەی، بەلان ڕێگا بەرتنادا هەتا دەگەیە هەوارەکان.

لەودەمەیدا هـاڕە و گرمـەی تـەیارمم بـەگوێدا هـاتِ، کـە ڕوانیمـە هـەوا هێلیکۆپتێرێک لە دۆڵی «نەمەشیر»ەوە بەرەو بستوو دەهات. لام وابـوو وەدووی پێشمەرگەکان کەوتووە، بـەڵان وانـەبوو، ئـەویش وەک مـن پـڕ بـەو دۆڵـە، پێشمەرگە و ژن و منداڵی دیبوو، بە گرمەگرم بە سەر مندا هات و تێکشا.

هەوای بەندەن و ئاوی کانی ئێشی مەعدەی ئارام کردبووم، هەنگاوم خۆشـتر دەهاویشت. ڕێگا سەرەوژوور و سەرەوژێری نەبوو، بە سەر دنـدووکی کێـویدا لابەلا و پێچاوپێچ تێدەکشا. نیزیـک نیوەڕۆیـە بـوو گەیمـە هـەوار و هۆبـەی «مەریجەڵان». کە نیزیک چادرەکان بوومەوە، یەکێک بانگی کرد ئاغـای نـووری وەرە بۆ ئێرە. کە ڕوانیم، بن چادرێک پڕ بوو لە پێشمەرگەی حیزبی دێموکرات. میرزاعەولا و پێشمەرگەکانی مەقەڕی گوندی «سلامەت» کە ڕەویبوون و گەیبوونە ئێرە. لامدا و سەلاموعەلەیک. دەیانناسـیم، هـەموویان هەسـتان: بـەخێربێی ئاغای نووری. نەهاریان دەخوارد. هێلکە و یارەڵماسی بوو تێکیانهەڵشێلابوو، لە پێشیان دانام و فەرموو. کوتم: میرزا عەولا، چـادری حـاجی سمـایلم دەوێ، ئەویش چادری لە مەزرای خۆیەتی. کوڕەجحێڵێک لەوێ بوو کوتی: وەحەسـێ و چای بخۆوە پێکەوە دەچینـە چـارداغی حـاجی سمایـل. مـەزرامان پێکەوەیـە. میرزاعەولا کوتی: عەلی، ئاغای نووری بە تۆ دەسپێرم، هـەتا دەیبەیـە بنـەی حاجی سمایلی. هەستام بڕۆم، کوتم: برایانی پێشمەرگە، ئێوە دەزانن چ دەکـەن و بۆ کوێ دەچن، بەڵان ئەمن نە دەزانم چ دەکەم، نە دەزانم لـە چـی دەگـەڕێم، خواحافیز! بۆ لای عەسر گەیمە مەزرا و چادری حاجی سمایلی بۆ من نەناسیاو. خۆم بە حاجی ناساند. خۆی و ژنەکەی زۆریان بەخێراتن کردم و حـاجی کـوتی: ئەمن بەرەبەیانی حەمەی کوڕم بە سواری بەدووودا ناردووی، دوێنـێ مەلاکـەریم ڕایئەسپاردبوو کە تۆ دێیە ئێرە. نەقڵی کاکە حەمە و یەسترم بۆ گێڕاوە. حـاجی سمایل پیاوێکی لەسەرەخۆ و ئارام و دڵاوا بوو. بۆ سێ ڕۆژان کە میوانی بـووم، بۆخۆی و ژنەکەی و کوڕەکانی زۆریان ڕێـز بـۆ دانـام، پێنـاوداری چاکـەیانم. شەودرەنگانێک کاکە حەمە هاتەوە و کوتی: ئەو کچـە برینـدارەیان هـەتا دێـی «بەردەڕەش»ی پێهەڵگرتم، ئەو چەکدارانە ژن و منداڵیان پێیە، دەچنـە دێهـاتی نێو لێڕەواری سنووری.

## دیسان هۆمەن و پەلاماری جاش و پاسداران لە لای بانەوە

لە ماڵی حاجی سمایل چاوەڕێی هاتنی مەلاکەریم بووم کە بەڕێم بکا بۆ ئێراق. بەڵان بەداخەوە لەبەر پەرێشانی ڕۆژ و ڕۆژگار و پەرتوبڵاوی پێشمەرگەکان، ماوەی نەبوو بێتە هەواری حاجی سمایل. گلۆڵەم کەوتبووە لێژی، ڕێکەوتی ژیانەکەم هەمووی چەوتوچەوێڵ و سەریان لە ئاسۆگی ڕۆژگارم دەهێنا دەرێ.

ئەو شەوەی کە مابوومەوە، لە لای ئێوارێ، چوار نەفەر پێشمەرگەی حیزبی دێموکرات هاتن و شەوێ میوانی حاجی سمایل بوون. کەپر و چارداغی حاجی لە دمم لێڕەواری‌دا لە «سیاکێو»، لە ڕووتەن‌دابوو. کە لە نێو چارداغەکەوە بازت دابا، دەکەوتیە لێڕەوار و جەنگەڵەوە.

شەوێ کاتی خەوتن کوتم: حاجی لێفە و سەرینێکم بۆ بنێرە نێو ئەو پۆلە دارە، ئەمن لە چارداغی‌دا ناخەوم. ڕادیۆیەکی چکۆڵەم پێبوو، هەتا شەودرەنگ پێیەوە خافلام. لە بەرەبەیانی‌دا کە هێشتا تاو لە سەرانی نەدابوو، بە تەقە و ڕەگبارى تفەنگ و تیربار وەخەبەر هاتم. کە تەماشای سەربان و بستووی کێوەکانی پشت «شێنان» و «کەشێنە» و «مەریجەڵان»م کرد، بەدرێژایی ئەو گەردەنە و بانوانە، سپای جاش و پاسدارانی بانە وەک شووڵی چیغی تەنیبووی. نێو لێڕەوار و جەنگەڵیان وەبەر دەسڕێژی تفەنگ و تیرباران دابوو. ئەو چوار پێشمەرگەی حیزبی لە چارداغەکە دەرپەڕین و خۆیان لە جەنگەڵ هاویشت. ئەو چارداغ و کەپرانەی کە لە دمم جەنگەڵ سازکرابوون، دیاربوو لە دەسڕێژ پارێزرابوون، دەنا حەشیمەتێکی زۆر دەکووژران. بزن و مەڕ و ماڵاتێکی کە لە نێو سەرگێڕان کرابوون، ڕاپێچەکان بۆ نێو جەنگەڵ و لێڕەوار. پاسداریش وەک کەمەربەندێکی دوورودرێژ، سەرانسەری لووتکە و تیرەشانی کێوەکانیان تەنیبوو. نێو حاشارگەی جەنگەڵیش پڕبوو لە پێشمەرگەی نادیار. دیاربوو ئەوە درێژەی کردەوەی پاکسازی ناوچەی گەورکان و دەوروبەری بۆکان بوو کە لە شاری بانەوە پەیگیری دەکرێ هەتا هێزی پێشمەرگە لەو ناوچەیە ڕاونێن. ئەو هێلیکۆپتێرەی دوێنێش هەر بۆ تاقیکردنەوە و پشکنینی وڵاتی بوو کە بزانن هێزی پێشمەرگە ڕوو لە کوێ دەکەن و لە کوێ سەتار دەبن و دۆڵی «هەواری شێنان»ی دیبوو کە پڕە لە پێشمەرگە.

سەیر ئەوە بوو نە پاسدار و جاش پێشڕەویان بەرەو خوار دەکرد، نە پێشمەرگە بە تەقە حاشارگەی خۆیان دیاری دەدا. لە تەقەی پاسداران زیاتر سەروسەودایەک لە لێڕ و جەنگەڵ نەدەهات. پاسداریش هەنگاوێک بەرەو جەنگەڵ نەدەهاتنە پێش. ئەمنی تەنیا لە نێو پۆلەدارێکی چڕگەندا کە «گۆیژەکۆڵە» و «دڕوەشیلان» دەورەیان دابوو، وەک کەروێشکی بازرە ماتەم هەڵگرتبوو و عاسمانبینی هەموو لوتکەی کێوەکانم دەدی، بەڵان دیتنەوەی من لە وزەی دووربینیشدا نەبوو. بیرم کردەوە ئەگەر پاسدار بێنە خوارێ و وڵات بگەڕێن، ئەمن چارم چیە. کەوا و پانتۆڵ و پشتێندەکەم داکەند و لە بن هەنگڵم گرت و هاتمەدەرێ. لە نێو هەژگەلی بە نێو داراندا چوومەوە چارداغی حاجی. دیتم حاجیژن ددانەتەقە و لێوەلرفەی بوو، دەگریا بۆ ئەو پێشمەرگانە کە خۆیان لە جەنگەڵدا حاشار داوە و بۆ من کە غەریب و لێقەوماوم. لیباسەکانم دا بە حاجیژن و کوتم: حاجیژن گریان و شیوەن چارەی هیچمان ناکا، ئەو لیباسانەی من هەڵگرە، بزانە شڕەکۆنێک، لیباسە شڕۆلێکی حاجیم بۆ بێنە لەبەریان بکەم. ئەگەر پاسدار هاتنە خوارێ، ئەمن شوانکارەی ماڵی حاجیم.

حاجیژن کە چلۆنیەتی ڕۆژگاری منی لێحاڵی ببوو، گورجێکی پەلاماری بردە سەر تێری شڕەی و ڕانکوچۆغەیەکی دیتەوە و هێنای و لەبەرم کرد. ژیانی ڕابردووم هاتەوە زەینی. دەڵێن زۆر شت هەن لە ژیانی مرۆڤدا دووپات دەبێتەوە، داخوا بەسەرهاتی من ئەوەیە کە دووپات بێتەوە؟ ئایا نەتەوەی کورد چارەنووسی هەر ئەوەیە کە سڵە لە کۆلکە بکا و بەسەر بەرازدا بکەوێ؟ بۆوەی لاقی ڕزگار بێ، باڵەپڕژە دەکا، ئەوجار بە باڵیش پێوەدەبێ! پرسیم حاجیژن مەڕەکەتان لە کوێ مۆڵ دەدەن؟ کوتی: ئێستا مەڕ لە سەر مۆڵێ نەماوە، لە نیزیک ئەستێر و کانییەکەن و عەولای کوڕم شوانی خۆمانە. وەدەرکەوتم بە نێو داراندا بۆ لای کانی و ئەستێرەکە. عەولا مەڕی لادەدا بۆ قووڵایی جەنگەڵ و لێڕەوار، کە ئاوای دیتم بڕێک ڕاما و کوتی: ئاغای نووری؟ کارەکە کە گەیوەتە ئێرە، بچۆ بۆ لای ئەو چڕگەن و پۆلە شیلانانە، پاسدار بێنە خواریش ئەتۆ نابیندرێی.

ئەوە دەنگی تەقە ناپسێتەوە و پاسدار کوێرهاویژ لێڕەواری دەکوتنەوە.

عاسمانبینی لە سەری دارانەوە، کێوپارە و بستووەکانمان دەدی، زنجیرەی پاسداران بەدرێژایی ملەی کێوەکان، بۆ ئەوەی هەنگاوێک بێنە پێشێ تەقەیان دەکرد و هیچی دی نا. کەوتبووە لای چێشتانی نیزیک نیوەڕۆیە، دیتم حاجیژن بە کەلێنی دارانێدا بەرەو ئێمە دێ. بانگی کرد: عەولا، عەولا. عەولا جوابی داوە: دایەگیان ئێمە لێرەین. حاجیژن هات. چارەکەیەکیان نان و پێخۆر و کەترییەکی چای دێمکراو هێنابوو. کوتی: عەولا، کوێربم ئاغای نووری شەوێش هیچی وای نەخواردووە و ئەوە نوێژی نیوەڕۆیە و نازانم چۆن ماوە. وادیارە پاسدار تەقە لە چارداغ و کەپرەکان ناکەن، دەنا خەڵک زۆر دەکووژران. ڕەنگە هەر تەقەی پێشمەرگەترسێن بێ. کوێربم عەولا خەبەری بابت نازانم. عەولا کوتی: بابم بۆ؟ حاجیژن کوتی: ئەوشۆ بە سواری یەسترێک چۆتە «ساردەکۆسان» خەبەری گوللەباران و پیاوکوژی وێ بزانێ، کوتیشی بۆ بەربەیانی دەگەڕێمەوە، ئەوە بوو بە نیوەڕۆ و نەهاتۆتەوە. لەودەمەدا هەرایەکمان بیست کە بانگی دەکرد، عەولا، عەولا ئەوە لە کوێی؟ عەولا کوتی: دایە ئەوە دەنگی بابمە. بەتوندی جوابی داوە: هۆی بابە ئەوە لە لای کانی و ئەستێرەکەین وەرە بۆ ئێرە.

ئەوە کات کەوتبووە پاشنیوەڕۆ. ڕۆژ کلا ببوو و دەنگی تەقە کەم ببۆوە. عاسمانبینی دیار بوو، پاسدار جموجۆڵیان وێکەوتبوو و تیرەشانی کێوی «مەریجەڵان»یان بەجێدەهێشت. بەرەو تیرەشانی کێوەکانی پشت دێی «سیوچ» و «ساوان» دەڕەوین. دیاربوو دەیانەویست لە داوێنی نەدیوانڕا بەرەو بانە پاشەکشە بکەن و نەیەڵن بکەونە لای ئێوارێ و شەویان بەسەردابێ. دەیانزانی لێڕەوار پڕە لە پێشمەرگەی ڕەویوی مەڵبەندی گەورکان و بۆکان و نەیانوێرا خۆ لە قەرەی لێڕەوار بدەن و ئەو تەقەوچەقەی لە ناوچەیان هالاند، دەیانهەویست پێشمەرگە لە ناوچەیە ڕادەن، «هەیبەتوڵڵا» نەبوون، هەر هاتبوون خەڵک و پێشمەرگە بترسێنن و نەیەڵن پێشمەرگە لەو ناوچەدا جێگیر بێ.

حاجی سمایل گەیشتە لای ئێمە. سەلام و بەخێر بێیەوە و ئەوە لەکوێڕا. حاجی کوتی: بۆ خەبەری «ساردەکۆسان»ێ چووبووم. دوێنێ کە لە «شێنان» مەلا کەریمم دی کوتی: دوێنێ پێشمەرگەم ناردە «ساردەکۆسان» و پاسدار پاشەکشەیان کردووە و گەڕاونەوە و ئەو دەمەی کە هاتوونە نێو دێ، «میرزاعەولای» سەر بە حیزبی «خەبات»یان کوشتووە و دوو کەسیان لە خەڵکی

ئاوایی لەگەڵ خۆیان بردووە و هەروەها کوتی: «لەبەر کووژرانی میرزا عەوڵا و گیراوەکان دەچمەوە «ساردەکۆسان» و سبەینێ یان دووسبەی دەگەڕێمەوە هەوارێ، ئاگاتان لە ئاغای نووری بێ هەتا دێم بزانین چمان دێتە پێشێ.»

کات بوو بە عەسرێکی درەنگ، دیار بوو هێزی پاسداران لە دوندی کێویڕا بەرەوخوار دەخزێن. جارجار تەقەیان لە ڕێگاکانی پێش خۆیان دەکرد. بۆمان ساغ بۆوە سێرە هەڵگیرا و مەعرەکە تەواو بوو و ئەو هەموو هەرایەش بۆ ئەوە بوو، پێشمەرگە دێهاتی «کەشێنە» و «شێنان» و «مەریجەلان» و «دۆڵی نەمەشیر» داگیر نەکەن.

گەڕاینەوە بۆ لای چارداغی حاجی و شوکرانەبژێر بووین کە لەو هەڵمەتەدا کەس نەکووژرا و بریندار نەبوو و سەدەمە و سووتمانێک ڕووی نەدا. پێشمەرگەکانیش کاتێک زانیان مانەوەیان لە هەرێمدا هەر دەبێتە هۆی شالاوی بێپسانەوەی پاسداران و ئەزیەت و ئازاری خەڵکی بێتاوان لە ناوچە، دوای مانەوەیەک لە پشتێندەی سنوور، ئاوای دیوی ئێراق بوون و لەوێ چاوەڕێی هەل و هەلکەوتی زەمان مانەوە.

## یەسترێکی بێدیپلۆم داهاتی دەبیرێکی هەیە

«مەحموود» برازای «حاجی سمایل»، ساڵی پێنجەمی دەبیرستان بوو و دەیهەویست کە بابی و مامی ئیزنی بدەن ئەوساڵیش لە شاری بانە درێژە بە خوێندنەکەی بدا هەتا دیپلۆمەکەی وەردەگرێ. داوای لێکردم ئەو ڕێگایەی لە لای بابی و مامی بۆ بکەمەوە و ئەو گرێپووچکەیەی لە ژیانیدا ڕەها بکەم. بۆخۆشم ئەو داوایەی مەحموودم زۆر بەجێ دەزانی و پێم داوایەکی زانایانە بوو.

شەوێ بابی مەحموود، لام وایە نێوی «حاجی مستەفا» بوو، بۆ بەخێرهێنانی ئەمنی میوان هاتە ماڵی حاجی سمایل. دوای بەخێرهێنان و باسوخواسێکی زۆر لەسەر پێشهاتی ئەو ڕۆژە کە پاسدارن پێکیانهێنابوو کوتم: خودا ڕوحمی کرد کە ئەو خەڵکە بێتاوانە، بێ دەرد و موسیبەت و زیانی ماڵی و گیانی، لەو گرفتارییە ڕزگارییان هات. هەموو لایەک خێرمان لەسەرە کە زەرەد وەکەس نەکەوت. تێکڕا کوتیان: ئەشەدووبیللا وایە، بەڵان بۆمان دیاری بکە چ بکەینە خێر و سەدەقەی ئەو پێشهاتە کە بەخێر گوزەرا. کوتم: پێم وایە

گەورەترین خێر و چاکە کە لە ڕێتان و لە پێتاندایە ئەوەیە کە مەحموودی ئیزن بدەن درێژە بە خوێندنەکەی بدا هەتا دیپلۆمەکەی وەردەگرێ. حاجی مستەفای بابی مەحموود گوتی: قوربان وەزعی شاری بانە ناخۆشە، شەو و ڕۆژ شەڕشووڕی تێدایە، پێشمەرگەکان جاری وا هەیە شالاوێک بۆ سەر پایەگاکانی نێو شار دێنن و لەدوایە پاسدار وەنێو شاری دەکەون و کوڕوکاڵی بێتاوان دەگرن و لە زیندانیان دەکەن. ئەوەیە کە دەترسم کوڕەکەم تووشی کێشەی پاسداران بێ و دەگیر بکەوێ و لەبەر ئەو پێشبینییەیە کە ناوێرم بینێرمەوە شاری، دەنا کێ سەربڵیندی ئەولادی خۆی ناوێ؟ حاجی سمایل گوتی: مەحموود ئاخر بابت ڕاست دەکا، ئەوڕۆ وڵاتی ئێمە بیلاتەشبی وەک قوونی قەحبەی لێهاتووە و هەردەمەی گۆنگەلێکی لێ هەڵداییسێ، ئاخر دیپلۆمت بۆ چیە و چی لێ پەیدا دەبێ؟

گوتم: حاجی ئەو کوڕە چاو لە داهاتووی خۆی دەکا، ئەگەر دیپلۆمی هەبێ لە دوایە ئەگەر پێویست بوو بۆخۆی لە ئیدارەیەک دادەمەزرێ و یان دەبێتە دەبیرێک و مانگێ چوارپێنج هەزار تمەنی دەدەنێ. کاکە حەمەی کوڕی حاجی سمایل هەڵیدایە و گوتی: بێبەلابی ئاغای نووری، ئەوەتا یەسترەکەی من دیپلۆمیشی نیە و شەوی دەهەزار تمەنی کرێبار پێدێنمەوە! ئاخر وانیـیە بابە! هەموو شەوێ لە سنووریڕا باری لێدەدەن و بۆ سبەینێش دێمەوە ماڵی خۆم؟!

گوتم: کاکە حەمە، ئینسان هەر لە حاڵدا ناژی، داهاتووش هەیە. بەڵکوو ڕۆژێک بێتە پێشێ کە نەتەوەی ئێمەی ڕۆژگارڕەش، کوڕانی کوردی لە هەموو خۆشییەک بێبەش، لە بازاڕی جیهانیدا بارتەقای یەسترێکی بەهای بۆ قایل بن. ئەوان لە ڕۆژ و حاڵ دەدوان و منیش لە داهاتووی بەشانوباڵ. لەدوایە پێکهاتین کە مەحموود بۆ ساڵی شەشەمی موتەوەسستە (ناوەندی) لە شار نێونووسی بکا و شەومان گەیاندە کاتی خەو. لە جێگای شەوی پێشوو جێخەویان بۆ ساز کردبووم، کۆڕەکەمان بلاو کرد، هەتا سبەینێ دوور لە غەوغا شەوبەخێر.

## ئاوارە بەدووی ئاوارەدا

سبەینێ کە لە خەو هەستام، بۆم مەعلووم بوو کە کاک «محەممەدی ئێلخانیزادە»ش لەو شالاوەی پاسداران بۆ ناوچەی گەورک هەڵاتووە و لە ماڵە

«ئەحمەدبەگی» مەریجەلان میوانە و لە چارداغی ئەحمەدبەگ کە هێندێک لە خوارووی چارداغی حاجی سمایلە خۆی مات کردووە. چون پێشینەی زۆرمان پێکەوە بوو بە پێویستم زانی بچم و چاوم پێیبکەوێ و بزانم چ دەکا و دەیهەوێ بچێتە کوێ؟ کاک «محەممەی ئێلخانیزادە» و کاک «سەلاحەددینی موهتەدی» دوو لاوی ئارمانگەرا و نەتەوەخوازی خوێنگەرم بوون و لە دەورانی رژێمی شایەتیدا ئەو دوو لاوە هەستی ئارمانی کوردخوازی و نەتەوەپەرستی دنەی دان هەردووک بۆ ماوەیەک بچن بۆ ئێراق بۆ لای خوالێخۆشبوو «مەلا مستەفای بارزانی». لەدوایە کە مەلامستەفا هاتە ئێران، کاک سەلاح و کاک محەممەد هاتنەوە ئێران و قاچاغ و نیوەقاچاغ وەخت و کاتیان لە ولاتدا دەگوزەراند. لە شۆڕشی ئێراندا ئەو دوو لاوە نەبەزە کۆلیان نەدا و دیسان لەگەڵ حیزبی دێموکرات و کۆمەڵە هاوکاری خۆیان درێژە پێدا. دوای ماوەیەک کە سپای پاسداران زەبروزەنگی خۆی لە موکریاندا هێنابووە پێشێ، کاک «سەلاحەددینی موهتەدی» و براکانی و مامۆستا «شێخ عیززەددین» ڕەوین بۆ ئورووپا و کاک «محەممەد» لەو نێوەدا هەر بەو ئارمانەوە ماوە و هەر ڕۆژەی لە جێیەک و هەر مانگەی لە دێیەک دەیگوزەراند و نەدەبەزی. لە دوایین شالاوی پاسداران بۆ ناوچەی گەورک کاک محەممەد لە گوندی «پیربادین» بوو و ئەمنیش لە «گلۆلانی سەرێ». جارجار سەری یەکترمان دەدا و چاوەڕێی ڕۆژی نەجات بووین کە نەیگەیشتینێ و هەر ناهومێدی بوو کە دەیگرتینەوە. ئەوە بوو کە کاک محەممەدیش وەک من پەڕەوازە ببوو و لە گوندی «مەریجەلان» گیرسابۆوە.

بە حاجی سمایلم گوت: بۆ دیداری کاک محەممەد لەگەلم بێ بچینە چارداغی «ئەحمەدبەگ». کە چووین کاک محەممەد لەگەڵ ئەحمەدبەگ دووبەدوو دانیشتبوون. کاک محەممەد کوتی: زانیبووم ئەتۆش هاتوویە چارداغی حاجی سمایل، بەلان ئەمن بەتەنێ نەبووم و سەیزادەی خێزانیشم لەگەڵ خۆم هێناوە و دەمهەوێ ئاوای ئەودیو (ئێراق) بم، جا نازانم بگەڕێمەوە بۆ بۆکان و خۆم تەسلیمی پاسداران بکەمەوە یان بڕۆم. دەلێن سپای پاسداران «تەسلیمی»یان وەردەگرنەوە. لە لایەکی دیکەوە بە ژن و مالەوە چوونم بۆ ئێراق پێناکرێ. ئەتۆ دەلێی چی و چ دەکەی؟ کوتم: کاکەگیان ئەمنیش بەو هیوایە پەڕەوازەی ئێرە

بووم، بەڵان ڕۆیشتنی من بە لەنگ‌ولۆری کاری «مەلاکەریم» ڕەنگە سەر نەگرێ، با بزانین چیمان لێدێ و بەسەرهاتەکەمان چ دەبێ.

ئەحمەدبەگ کوتی: لێرەوار و هەواری «مەریجەڵان» جێیەکی بێدەنگە و هەتا وڵات ئارام دەبێتەوە، ئێرە نشیمەنێکی بێ سەر و سەدایە. پاسداریش ئیدی بێرەدا نایەنەوە. لەو قسانەدا بووین «سەرداربەگی مەریجەڵانی» وەژوورکەوت. دوای بەخێرهێنان و منخۆش و تۆخۆشی میوان و خانەخوێ، سەرداربەگ کوتی ئەوە دەهاتمە چارداغی حاجی سمایل و لە تۆ دەگەڕام. دوێنێ کە ئەحمەدبەگ هاتنی تۆی بۆ چارداغی حاجی سمایلی بۆ خان گێڕاوە (عەوڵاخانی شەهیدی ڕەئیسی بەگ و خانانی بانە)، خان بە دوای «عیززەتبەگ»ی‌دا نارد. عیززەتبەگ ئەندامی سپای پاسدارانی بانەیە و پێی‌گوتبوو بەیانی بچێتە هەواری حاجی سمایل و میرزا محەممەدی نووری لەوێیە و لەگەڵ خۆی بیهێنێ بۆ شاری بۆ لای من، لێرە چاکتر دەحاوێتەوە تا بزانین لێرە چمان بۆوی پێدەکرێ و بۆدەکرێ. شەوەکی کە سپای پاسداران خەیاڵی شاڵاوی بۆ ئەو بەشە دەبێ، دەنێرێ لە دووی «عیززەتبەگ» و ئەو بەرنامەی بۆ شی‌دەکاتەوە و لەگەڵ پاسداران دەینێرێ بۆ ئەو شاڵاوە. عیززەتبەگ ماوەی نابێ کە ڕاسپاردەی «خان»ی بەجێ بێنێ و «سەرداربەگ»ی حاڵی دەکا کە بچێ و نووری لەگەڵ خۆی بەرێتە بانە بۆ لای خان. ئەوە بوو کە سەرداربەگ لە هۆبەی ئەحمەدبەگ وەژوورکەوت و تووشی یەکتر هاتین.

کاک محەممەدی ئێلخانی‌زادە لە سەر ئەو بەرنامە ساغ بۆوە کە بچێتەوە بۆکان و بە ناوی «تەسلیمی» خۆی بە سپای پاسداران بناسێنێ و هەر ئەوەشی کرد و هاتەوە بۆکان و لە ژێر چاوەدێری‌دا بوو هەتا ساڵی ١٣٦٤ یان ٦٥ بوو کە لە ماڵەکەی خۆی‌دا بە ناکامی تێرۆر کرا بێ ئەوەی کەس بزانێ کێ کوشتی و لەسەر چی کوژرا؟ بەڵان نەیدۆڕاند و گیانی پاکی لە ڕێی ئاواتی پیرۆزی نەتەوەخوازی‌دا بەخت کرد و ڕووحی پاکی بەرەو بارەگای شەهیدانی ئەم ڕێگایە هەڵفڕی. ژیانی دانا هەتا گیانی ئازاد بێ. سەربەرز بن ئەوانەی بۆ نەتەوە دەژین و دەمرن.

## بازێکی دیکە بۆ شاری بانە

دوای خوداحافیزی لە کاک محەممەد و ئەحمەدبەگ ، لەگەڵ سەرداربەگ هاتینەوە چارداغی حاجی سمایل. دوای برێک حەسانەوە، بەپێیان بەرەو شاری بانە وەڕێکەوتین. بۆ نیزیک ڕۆژئاوا گەیشتینە گوندی «سیوچ» و ماشێن نەمابوو پێی برۆین. شەوێ میوانی یەکێک لە خزمانی «خان» بووین و سبەینێ ماشێنی دێ دەچوو بۆ شار و لەگەڵ سەرداربەگ سوار بووین. بۆ چێشتانێ گەیشتینە شاری بانە و یەکسەر چووینە دەرکی «خان».

دەرکی حەوشە ئاواڵە و «عەولاخان» لە بن نیسێی دیواری هۆدەکەی لەسەر کورسی دانیشتبوو. کە چووینە حەسارێ، خان بە چاوی پڕ لە فرمێسک ئامێزی کردەوە و یەکترمان لە ئامێز گرت. دوو هاودەرد، دوو هاوڕاز، دوو هەڵدێراو لە پلە و پایەی ڕۆژگاری ژیان و ئاوات و ئارمان. یەکترمان ماچ کرد. دیمەنی شپرێوی من، هەلکەوتی ژیانی نالەباری ئەو، ڕابردوو و کاتی لە زەینماندا زیندوو کردەوە و مراندی.

دەبێ بڵێم لە ساڵی ١٣٥٤ بەولاوە، تێکەڵی و یەکدڵی و یەکڕەنگی زۆرمان لەگەڵ خان پێکهێنابوو. خان لەگەڵ «قاسمئاغای موهتەدی» دۆستایەتی و خزمایەتی و تێکەڵی بنەماڵەیی‌یان هەبوو. ئەمنیش لەگەڵ قاسمئاغا بالاتر لە ساڵەهای ساڵ، لە دەورانی ژێر و بالای ژیاندا، پەیوەند و هاودڵی و هاوڕازیمان سازکردبوو و لە نەخشی حەز و ناحەزی زەمانٖدا هاوبیر و هاوڕەنگی یەک بووین. لەو دەریچەوە پەیوەندی و تێکەڵی من لەگەڵ ئەو دووانە بوو بە هاوڕەنگییەکی بێپسانەوە و بەیەک حەسانەوە.

ئەمن کاتێک ئەو بیرەوەرییە تاڵ و سوێرانە لە ساڵەکانی ١٣٨٢ و ١٣٨٣ی هەتاوی‌دا دەنووسمەوە کە دەوروبەرم لە دیداری عەزیزان و لە دیمەنی خۆشەویستان خاڵییە. لە ڕیزی ئەدیبان و هۆنەراندا وەک: «هەژار»، «هێمن»، «ئاوات»، «حەقیقی»، «سوارە» و «هێدی» دوورەولات و لە تیپی سەرۆک عێلاندا، «قاسمئاغای موهتەدی»، «عەولاخانی شەهیدی»، «عەولائاغای ئێلخانی‌زادە»، «برایمئاغای عەلیار»، «حاجی برایمئاغای قارەمانی» و «حاجی حەمەدئاغای حیسامی»، کە ئەو ڕۆیوانە، ئەو لە دیمەن ئاوابووانە، هەریەک لە ژیانی کۆمەلایەتی مندا، هەرکام نەخشێکی سەربەخۆیان بووە؛ لەگەڵیان

ژیاوم و لەگەڵیان دواوم. ئەگەر دەستی لەرزۆک و دیدەی بێدید و بیری ناژیرم هاوکاری و هاوڕێیی‌یان کردبام و بۆ هەرکام گۆشەیەک لە بیرەوەری ئەو عەزیزە لە خاکخزیوانەیان نووسیباوە، «مثنوی صد من کاغذ می‌شد». با لە ڕابردوو گەڕێم و بێمەوە سەر کاتوسات.

«عەولاخان» کوتی: کاک نووری لە بەیانییەوە ئەو کورسییەم داناوە و دانیشتووم و چاوەڕێت بووم. ئاواتم بوو بتبینم، بەڵان ئاوا نا. ڕووی لە «سەرداربەگ» کرد و کوتی: سەردار کاک ئەحمەدی برای ئاغای نووری لە بۆکانڕا هاتووە و وەدووی سۆراغی کاکی کەوتووە. تازە لێرە وەدەرکەوت و کوتی دێمەوە. بەدوایدا برۆ و بیهێنەوە و بڵێ کاکت لێرەیە، ئەویش وەک من چاوەڕێ بوو. سەردار ڕۆیی بە دوای ئەحمەدی برامدا.

خان هەستا کوتی: با بچینە سەرێ، سیغارێکی بکێشە و چایەکی بخۆوە با برێک وەحەسێی و دەستی هاویشتە سەر ئەستۆم. چووینە وەتاغ و دانیشتین. کوتی: بەیانی گوتوومە کوورەی حەمامەکە هەڵکەن. کراس و دەرپێی خاوێنیان داناوە، تیغ و خۆتراشیش هەروەتر، جارێ هەستە بچۆ ماندووی و ئارەقە و شەکەتی ئەو چەند ڕۆژانە لە خۆت دوورکەوە و وەرە بە قالبی سووک و خاوێنەوە دادەنیشین و دەردەدڵان هەڵدەڕێژین.

حەمامێکی تەڕوتەمیزم کرد بەڵان ڕیشم نەتاشی. خان پرسیاری کرد ڕیشت بۆ نەتاشیوە؟ کوتم: مەبادا کارم پێی‌بێ. ئەحمەدی برام باس و خەبەری وڵات و بردنەوەی ماڵی «گڵۆڵان»ێمی بۆ بۆکانی، بۆ گێڕامەوە. پاش نەهار ئەوم بەڕێکردەوە و کوتم بۆخۆشم دوای یەکدوو ڕۆژی دیکە دێمەوە ماڵێ، با بزانم جەنابی خانیش چی دەڵێ و تەگبیری چیە. ئەمن و خان ماینەوە. باسوخواسی ئەو چەند ڕۆژەم بۆ گێڕاوە و لەدوایە کوتم: خان، هەرچی بەسەرمان هاتووە و هەر مەینەتێکی لە ڕێماندایە، هەموو تاوانی تۆ و قاسمئاغایە. هەڵکەوتێکی بۆ من و تۆ و قاسمئاغا هاتبووە پێشێ، ئەگەر کەلکمان لێوەرگرتبا، ئێستا ئەتۆ و قاسمئاغا بە نێوی ڕەئیس عەشیرەت، وەک «عەلی قەرەنیئاغا» و «عەولای بایزئاغا» لە «لەندەن» قەدەمتان لێدەدا و ئەمنیش بە نێوی نوێنەری مەجلیس وەک «لەتیفی شێخولئیسلامی» و هاوکارەکانی دیکەم، لە باوەشی دەرەوەدا

بووم و ئەورۆ چاو لە فەرمانی هەستە و دانیشە و وەرەو بڕۆی پاسداران نەدەبووین.

خان لێرەدا تاوانی هاویشتە سەر ئەستۆی «قاسمئاغا» و کوتی: ئێمە ڕۆیشتین بۆ ئێراق و بەچاکیش وەریانگرتین. لە دوای دووسێ ڕۆژان بۆخۆشی هاتەوە و ئەمنیشی ڕاکێش کرد و هێنامییەوە بۆ ئێرە و بۆ کێشە و گێرە. ئەوا من بە سووکی و ئەویش بە چرووکی ددانمان بە جەرگی خۆمان داگرتووە و دەستمان بە کلاوەکەمان ڕۆگرتووە با نەیبا. کوتم: جەنابی خان، ئەوانە کای کۆن بەبا کردنە، وەک عەرەبە کوتی: «فی‌السیف ضیعت‌اللبن»، یانی لە هاوین‌دا شیرەکەت خەسار کرد. ئێمەش لە کاتی خۆی‌دا کات و هاتمان دۆڕاند، لێرە بەولاوەش پیاو دەبێ خۆی لە باوەشی قەزاوقەدەر باوێ، وەک فارس دەڵێن «هرچە پیش آید خوش آید». ئەوە نیزیک بە پێنج ساڵە ئەمن لە حاڵی خۆشارەوەکێ و گۆشەگیری‌دام، لەوە زیاتریش کوناوکونم پێناکرێ، دەمهەوێ بچمەوە بۆکان. دیارە سپای پاسداران بە ناوی «تەسلیمی» وەرمدەگرێتەوە. جا نازانم لەم بارەوە نەزەری تۆ چیە؟ چونکە ئەتۆ و «قاسمئاغا» ئەو دەراوەتان بەتاقی کردۆتەوە. خان کوتی: لەمێژە نەمدیوی، بەڵان پێم بڵێ حاڵی دەردی مەعدەکەت چۆنە؟ ئەو بنێشتە تاڵەی بۆم ناردی پێت‌گەیشت؟ کوتم: خان، بەڕاستی ئەو دەرمانەی تۆ هەتا ئێستا ئەمنی ڕاگرتووە و پێیەوە ژیاوم، بەڵان ئەوە وەرامی پرسیارەکەی من نەبوو. ژیانی ئێستام لە بنێشتە تاڵەکەی تۆ تاڵوتوونترە. خان کوتی: ئاغای نووری، «عیززەت‌بەگی» کوڕی «حەمەدبەگ» لە خزمانی نیزیکە و بۆخۆی ئەندامی سپای پاسداران و ئیدارەی ئیتلاعاتی بانەیە. دەتوانێ نامەیەکی وا وەربگرێ کە ئەتۆ لەو ساڵانەدا لێرە یانی لە شاری بانە بووی. کوتم: خان ئەوە ناکرێ و جێی باوەڕ نابێ. چونکە ئیتلاعاتی بۆکان و سپای پاسداران بە هۆی جاشە خۆفرۆشەکانەوە دەزانن هەر لە گڵۆلان و لە باوەشی حیزبەکان‌دا بووم. هەتا ئێستا چەند جاریش «حاجی مەلا ئەبووبەکری شەفیعی» ئیمامجومعەی بۆکان نامەی بۆ نووسیوم کە بچمەوە بۆکان، بەڵان لە خۆم ڕانەدیوە و نەچوومەوە. ئەگەرچی عولەما و مامۆستایانی ئایینی بۆکان پشتیوان و لایەنگری منن و لەو بابەتەوە پشت‌ئەستوورم، بەڵان کردەوەی پاسداران لە

ناوچەدا جێی متمانە نیە و ئێستا چەلوهەل بۆ من گۆڕاوە، لێرە بەولاوە ناوچەی گەورکایەتیش پایەگای سپای پاسدارانی تێدا دادەمەزرێ. لەو حالەدا یان دەبێ بچمەوە بۆکان، یان دەبێ ئاوارەی ئەودیو بم. ئەویش: «ای گرفتار و پایبند عیال دیگر آسودگی مبند خیال». خان، ئەوەی دەیرێژم و ئەوەی دەیپێژم، هەمووی چێژی پابەندی عەیالە.

باسەکەمان بوو بە باسی کۆن و نوێ، بە خۆمان هەڵدەگوت و لە سەروگوێی دەوران و زەمانەمان دەدا. «سەرداربەگ» وەژوورکەوت و کوتی: تێرقسە بوون؟ خان کوتی: سەردار، بچۆ بە «عیززەتبەگ»ی بلێ بۆ شام بێتە ئێرە و «حەمەدبەگ»ی بابیشی لەگەڵ خۆی بێنێ. سەردار ئینسانێکی جەفەنگی و خۆشمیزاح بوو، کوتی: کاک نووری تۆلەی گۆشت کورکورەکانمان لێدەکاتەوە، ئەدی بە کام «بەگ»ی دیکە بلێم بۆ شام بێنە ماڵی خان، میوانی هەیە. خان کوتی: سەردار توخودا ئیدی لەسەری مەڕۆ و بچۆ پێیان ڕابگەیەنە بۆ شام بێنە ئێرە.

«عەولاخان» هەر کوڕێکی بە ژنومالی بوو کە لە سەفەر بوو و ئەویش بۆ شەوێ هاتەوە. ئەوشەوەی جەماوەرێک لە بەگزادە و خانزادەی بانە لە ماڵە خان کۆ بوونەوە. بەلان ڕۆژگارەکە وابوو کە هەر جێیەک کۆبوونەوەیەک پێکهاتبا و لە هەر چین و توێژێک با، باس دەهاتە سەر کردەوەی ناحەز و نالەباری ڕژێمی ئاخوندی و پاسدار و جیرەخۆرەکانی. ئەگەرچی «عیززەتبەگ» بەڕواڵەت ئەندامی پاسداران و لە چەکدارانی حکوومەت و سەر بە دەزگای «ئیتلاعات» بوو، لەبەر وەی کە کۆڕەکە هەموویان عێل و عەشیرەتێک بوون، گوێیان نەدەدا ئەوە کە عیززەتبەگ چەکداری حکوومەتە و بیر و باوەڕی خۆیان دەردەبڕی و زیاتر باسی ئەو شالاوەیان دەکرد کە پاسدارەکانی حکوومەت بۆ سەر بەندەنی «شێنان» و «مەریجەلان» و «دۆلی نەمەشیر»یان کردبوو. عیززەتبەگ کوتی: ئەوە هەڵمەتێکی پێشاوبڕانە بوو لەو پێشمەرگانە کە لە ناوچەی بۆکان و گەورکان پاکسازی کرابوون کە لەو مەڵبەندە نەگیرسێنەوە.

هەتا شەودرەنگانێک شۆخی و جەفەنگ درێژەی هەبوو. باسی هەڵاتهەڵاتی منیش برێک بوو بە جێگای شۆخی کە نە چەکدار و نە حیزبی و نە زیددی ئینقلابم و جێگەی سەرنجی کارە جوانەکانی حکوومەت بوو. لە پاشان

شەوبەخێر و خواحافیز، کۆڕەکە بڵاوەیان کرد. کە هەستان بڕۆن، خان کوتی: «عیززەتبەگ ئەتۆ مەڕۆ کارم پێتە.» هەر خان و عیززەت و ئەمن ماینەوە.

خان کوتی: «عیززەت، لە ساڵی ١٣٥٧ کە ئینقلاب کراوە هەتا ئەوڕۆکە کە دەبێتە هاوینی ١٣٦٢، ئاغای نووری وەک بۆخۆشت دەزانی خۆی بە حکوومەت نەناساندووە، یان لە دێی «عەنبار» و یان لە «گلۆلان»ی ناوچەی گەورکایەتی بووە. ئێستا هەلومەرج گۆڕاوە، ناچارە یان بڕواتە دەرەوە و یان خۆی باوێتە باوەشی پاسداران کە هەمەکارە بۆخۆیانن. دەشزانی کاک نووری نە پێشمەرگە بووە و نە چەکدار، ویستوویە هەتا ئارامبوونەوەی وڵات لە بگرەوبەردەی ئینقلاب خۆی بپارێزێ و لە دوایە بچێتەوە بۆکان و لە ماڵی خۆی بێدەنگ دانیشێ و بحەسێتەوە. ئێستاش ئەو هەلە هاتۆتە پێش، دەشبێ بزانی تێکەڵی و نیزیکی ئێمە لەگەڵ نووری تا کوێیە. ئەمن و «قاسمئاغا» و «نووری»، ساڵهایە سێکوچکەی ئاورگایەک بووین، قازانجی تۆ بە حکوومەت بۆ تیرە و تایفەی خۆت ئەوەیە بەکاری دەردی خۆت بێی، ئاخر ئەتۆ لە بنەماڵەدا چەکداری حکوومەتی.» پێکەنی و کوتی: «ناڵێم جاشی، بەڵان مەودای خەڵکناساندنت بە ئیدارەی ئیتلاعاتی سپای پاسداران هەیە. ئەتۆ لێرە بەرنامەی خۆت لە ئیدارەی ئیتلاعات و سپا جۆرێک ڕێکدەکەی کە بتوانی بێدەردەسەر نووری بەرییەوە بۆکان و لە دوایە لەوێ ئیتلاعات و سپا گرفتی بۆ سازنەکەن؟!» عیززەتبەگ کوتی: «خان، ئاغای نووری کەنگێ دەیهەوێ بگەڕێتەوە بۆکان.» خان کوتی: «چەند رۆژێک ئەمن نایەڵم بڕواتەوە.» ئەمن کوتم: «جەنابی خان، جارێ وەختی مانەوە و درێژەی دیدارم نیە. سبەینێ نا بەڵان دووسبەی دەبێ بەڕێمکەیەوە.» عیززەتبەگ کوتی: «موعاوینی ئیدارەی ئیتلاعات ئاواڵ و دۆستی نیزیکمە و لە خزمەت خانیشدا ئیرادەتی هەیە. ئەمن سبەینێ بۆ نیوەڕۆیە بانگهێشتی دەکەم و پێی دەڵێم خان دەیفەرموو لەمێژە نەمدیوە و پێمخۆشە ببینم، بۆ نەهار دەیهێنمە ئێرە و ئەو جۆرەی بە پێویستی دەزانی لەگەڵی بدوێ.» شەو درەنگ بوو و عیززەتبەگ هەستا ڕۆیی. خان کوتی: «عیززەتبەگ باشی بۆ چوو، ئەمنیش لەگەڵ ئەو کابرایە نێوانم خۆشە، هاتنی بۆ ئێرە باش تەواو دەبێ.» وەختی خەو بوو، خان چوو بنوێ. جێگای خەویان بۆ من چاک کردبوو، ئەمنیش هەستام بەرەو نوستن و خەوی خۆش دیتن.

خان بۆ نانیسبەینێ هاتەدەرێ و دوای نانخواردن چووینە حەساری دانیشین. کوتم: خان، کاتێک عیززەت و کابرای ئیتلاعاتی بۆ نەهار هاتن، ئەمن بڕێک درەنگ دێمەوە هەتا ئەوەی لە بارەی مندا دەیلێی ڕواڵەتی پاشملەی هەبێ. خان کوتی: «ئەمن دەمهەوێ پێی بڵێم، ئاغای نووری یەکێکە لە دۆستان و یارانی قەدیمی من. زۆریشی پێقەرزدارم. کاتێک ئەو نمایەندەی خەڵکی بۆکان بوو، لە مەجلیسی ڕابردوودا کار و گرفتاری گەورەی عێل و تایفەی بۆ جێبەجێ کردووم و هەتا ئێستا نەمتوانیوە جوابی چاکەیەکی بدەمەوە. دەمهەوێ ئەتۆ لە دنیای دۆستایەتیدا قەرزی من بدەیەوە. نووری نە حیزبی بووە و نە کۆمەڵە، هەر ئەوەش بوو بۆکانی بەجێهێشت و چوو بۆ نێو خزمەکانی لە گوندی «گلۆلان» و لەو ئاخرییانەدا کە ناوچەی گەورکان بوو بە مەکۆی حیزبەکان، ئەغڵەب دەهاتە بانە ماڵە من و خزمەکانی من، ئێستاش دەیهەوێ بچێتەوە بۆکان. دەبێ کاک عیززەتی لەگەڵ بنێری و بسپێری کە ئیتلاعات و سپای پاسدارانی بۆکان دەردەسەری بۆ پێکنەهێنن. ئەوانە ئەو قسانە دەبێ بە بێ حوزووری تۆ.» کوتم: خان، لەوە باشتر شتێک نەماوە وەبەر زەینی بدەی. ئەمن لەگەڵ سەردار وەدەردەکەوم.

نیزیک سەعات ١٢/٥ هاتینەوە. میوانەکان لەمێژبوو هاتبوون. دوای سەلامووعەلێک، خان: «ئاغای ڕەئیس، ئەوە دۆست و برای عەزیزم ئاغای نوورییە.» دوای ئەحواڵپرسی ئاغای «ئیتلاعاتی» کوتی: «ئاغای نووری، خان لە بارەی تۆدا ڕوونی کردمەوە و عیززەتبەگیش شەرحیحاڵی تۆی بۆ من شیکردۆتەوە. جمهووری ئیسلامی نایهەوێ ئینسانەکانی بەڕاستی و هێزەکانی شیاوی ناوچە لە دەس بدا، دەیهەوێ لەگەڵ دێوەزمەی حیسانووێن بەربەرەکانی بکا. ئەگەر وازت لە سەر چوونەوەیە بۆ بۆکان، ئەوە کاک عیززەت هاوڕێتە و لەوێش برادەرەکانی بۆکان دەبینێ و ئەوەی ئێمە بە پێویستی دەزانین ڕێز و حورمەتە بۆ ئاغای نووری کە تێکەڵاوییەکی نیزیکی هەیە لەگەڵ «خان» و «خان»یش لە کەسانی باوەڕپێکراوی ئێمەیە لەو مەرز و سنوورەدا.»

گوتم: ئاغای ڕەئیس، ئێمە ئینقلابمان بۆیە نەکرد یەکتر ڕەپێنێین، ئینقلابی ئێمە بۆ ڕەپێنانی یەک نەفەر بوو بە ناوی تاغووت و ئەویشمان ڕادا و پێویست ناکا نەتەوەیەکی سەدان قەڕن پێکەوە ژیاوین لە سەروسەکوتی یەکتر بەربین و

لە یەکترمان بکەنە نەتەوی و دوژمن. بەکورتی لە سەر سفرە قسە لەسەر ئەوە بڕایەوە کە سبەینێ کاک عیززەت بمباتەوە بۆکان و بە دڵخۆشی و ڕەزامەندی بگەڕێتەوە.

کەوتینە سبەینێ و کاک عیززەت هات بۆ ماڵی خان. خان زۆری حەول دا ڕۆژێکی دی لە لای بمێنمەوە، کوتم: خان، چوونەوەم چاکترە لە مانەوە. ئەتۆش لێم غافڵ مەبە. لەگەڵ عیززەت دوای خواحافیزی بەرەو بۆکان وەڕێکەوتین. بۆ نەهار هاتینەوە بۆکان و دوای نەهار کوتم: کاک عیززەت ئەتۆ بچۆ بۆ ئیتلاعات و ڕاسپاردەی خۆت ڕابگەیەنە و ئەمنیش دەچمە ماڵی ئیمامجومعە (حاجی مەلا ئەبووبەکری شەفیعی) کە لەو وەختانەدا دایمە موکاتەبەمان هەبووە و لێکبێخەبەر نەبووین، با ئەویش لەگەڵ عولەما و ماوۆستایانی ئایینی بۆکان لە جەریانی هاتنەوەمدا ببن مەبادا گیروگرفت بێتە پێشێ؛ (کە هاتە پێش). درێژەم بە قسەکانم دا و کوتم: «کاک عیززەت کە لە ئیتلاعات هاتییە دەرێ وەرە بۆ ماڵی ئیمامجومعە و خەبەری خۆتم بدەیە.» بۆخۆشم چوومە ماڵی ئیمامجومعە.

کە لە دەرکەم دا و چوومە ژوورێ، مامۆستا بەتەنێ لە وەتاغەکەی بوو، کە ئەمنی دیت بەپیرمەوە هات و دەستومستی یەکترمان ماچ کرد. دوای منخۆش و تۆخۆش، بەسەرهاتی ئەو ڕۆژە تاڵانەی خۆم بۆ گێڕاوە و کوتم نازانم بیروڕای تۆ چۆنە؟ کوتی: «نازانم دەڵێن چی بەڵان خراپ ببزوونەوە یان بتگرن، ئەمن لە ئیمامجومعەیی بۆکان دەس هەڵدەگرم و عولەما و ڕووحانی بۆکانیش تێکڕا ئیعتسابێ دەکەن.» هەروەها کوتی: «چەند جارێکی کە لەگەڵ ڕەئیسی ئیتلاعات دواوم، نەزەریان خراپ نەبووە، هەتا بزانین چۆن دەبێ.» لەو قسانەدا بووین عیززەتبەگ وەژوورکەوت و دوای سلاو و ئەحواڵپرسی کوتی: ڕەئیسی ئیتلاعاتی ئێرمم دیت و نەزەری ئیتلاعاتی بانەم پێڕاگەیاندن. کوتی بێتە ئیتلاعات و چەند پرسیارێکی لێدەکەین و ئیدی کارمان پێینامێنێ. حاجیمەلا کوتی: «دەچینە شووڕای ڕووحانییەت و نوێنەری ئیمام لە شووڕا حاڵی دەکەم و لەوێڕا ئەگەر پێویست بوو بچێتە ئیدارەی ئیتلاعات.» کاک عیززەت کوتی: ئەمن ڕاسپاردەی خۆم جێبەجێ کردووە و لەو بارەوە نیگەرانیشم نیە. کوتم: سپاست دەکەم. مانەوەی تۆ ئیدی پێویست نیە.

دوای نوێژی عەسر چووینە «شووڕای ڕووحانییەت» و ناردی «مەلا سەید ڕەحمانی کەریمی» کە ئەندامی شووڕا بوو ئەویش هات. نوێنەری ئیمام کە ئاخوندێکی جەوان بوو، ئەویش هات. حاجی مەلا ئەبووبەکر ئەمنی پێناساند و کوتی: «ئاغای نووری نوێنەری خەڵکی بۆکان و دەوروبەر بوو. کە ڕژێمی تاغووتی ڕووخا، هاتەوە ناوچە و لە دێ گۆشەگیر و دوور لە غەوغا دانیشت. ئێستا کە ئەمنییەت و ئارامی بەردەوامە، دەیهەوێ لە بۆکان دانیشێ و وەک خەڵکی دیکە لە بەرەکەتی ئینقلابی ئیسلامی بەشدار بێ و وەک هەموو هاووڵاتییەکانی خۆی لە ژیانی سەربەخۆ بەهرەمەند بێ.»

## ئاخوندی بەرزەفڕ و تاوانباری بێتاوان

هەر کە کوتی نوێنەری مەجلیسی پێشوو بووە، ئاخوند چاوی بزکردەوە و وەک جانەوەرێکی دڕندە لە قەفەزێکدا نیشان بدەی، بڕێکی تێڕوانیم و گرژ بوو و کوتی: «ئەی ئاغا تا ئێستا لە کوێ بووی؟» ئەمنیش بە فارسییەکی خۆماڵیانە عەرزم کرد: جەنابی حوججەتولئیسلامی وەلموسلیمین! هەر لێرە بووم. لە دێی «عەنبار» کەشاوەرزم. هەروەک دەزانی شار و مەڵبەند بڕێک نائەمن بوو، وام پێچاک بوو بە بێدەنگی لە گۆشەیەک دانیشم هەتا وڵات ئەمن دەبێتەوە. ئێستا وڵات ئارام بۆتەوە و لە بۆکان دانیشتن دەکرێ. ئەوەندەش بزانە کە پێشتر زیددی ئینقلاب لە بۆکان گرتیانم و تەحویلی دادگای ئینقلابی ئیسلامی مەهابادیان دام، پاش ئەوەی خەڵکی بۆکان و دەوروبەر بە خۆپێشاندانێکی بەرچاو بێتاوانی منیان وەدەرخست، ئازادیان کردم و هاتمەوە بۆکان. ئاخوند زۆر بە ڕووگرژی کوتی: «پێویستە لەگەڵ تاران پەیوەندی بگرم و بزانم لەوبارەوە دەستووری ئەوێ چ دەبێ؟» ئیمامجومعە و مەلا سەید ڕەحمان ئەندامی شووڕا کوتیان: «ئێمە ناردوومانە بێتەوە بۆکان، تاران و تەماسی بۆ چییە؟» ئاخوند ڕانەوەستا، هەڵات بۆ وەتاغێکی کە تەلەفوونەکەی لێبوو و کوتی: «ئەوە بە خۆم مەڕبووتە.» ئیمامجومعە کوتی: «قەسەم بە خودا خراپی لەگەڵ بزوونەوە، تەواوی بۆکان دەخرۆشێنم و بۆخۆشم ئیمامجومعە نابم.» مەلا سەید ڕەحمان کوتی: «ئێمەش شووڕای ڕووحانییەت نابین.» کوتم: مامۆستایان سپاستان دەکەم. بەڵان ئەگەر لە سەرەخۆ نەبن، کاری من خراپتر دەبێ. ڕەنگە

بیانهەوێ هێندێکم پرسیار لێبکەن کە حەتمەنیش دەیکەن. ئەو قسانەمان دەکرد ئاخوند هاتەوە. هێندەی پێنەچوو دەرکە کراوە و پاسدارێک هاتە ژوورێ ، دیاربوو دەیانناسی ، ڕەئیسی ئیتلاعاتی بۆکان بوو کە ئاخوند تەلەفوونی لێکردبوو. لەبەری هەستان و بەخێریان هێنا. کوتی: ئەوە ئاغای نوورییە؟ کوتم: بەڵێ هەوم. کوتی: تازە کاک عیززەت لە بارەی تۆوە حاڵی کردووم. ئاخوند بە تووڕەیییەوە کوتی: ئەوە نوێنەری تاغووت بووە و لەگەڵ تاران قسەم کردووە و کوتیان بیدەنە دەست ئیدارەی ئیتلاعات. ئاغای ڕەئیس بۆیە تەلەفوونم لێکردی دەبێ بیگری. کوتم: جەنابی حوججەتولئیسلام ، ئەمن لەگەڵ ئیمامجومعە هاتوومە شوورای ڕووحانییەت کە لەگەڵ مامۆستایانی ئەو شوورایە دیدارێک تازە بکەمەوە. لە دوایە لەگەڵ ئیمامجومعە دەچووینە ئیدارەی ئیتلاعاتیش ، ئەتۆ لەخۆڕا وەپەلە کەوتووی! جەنابی حوججەتولئیسلام ، ئەگەر ئەمن نەتەوە و وڵاتی خۆم خۆش نەویستبا و هۆگری نیشتمانی خۆم نەبام ، ئێستا لە خزمەت تۆدا نەدەبووم ، یان لە ئورووپا بووم و یان لە ئێراق وەک ئەوانەی ڕۆیشتوون و نایانبینی. مەگەر بێتاوانێکی چەند جار دەبەنە پای دار؟ ئەمن لە ساڵی ١٣٥٨ جارێک لە دادگای ئینقلابی مەهاباد پرسوجۆ کراوم و بێتاوانی من لە دادگا ڕوون بۆتەوە و بە ڕێز و حورمەتەوە بەڕێکراومەوە بۆکان.

ڕەئیسی ئیتلاعات زۆر ئارام و لەسەرەخۆ کوتی: جەنابی ئیمامجومعە ناڕەحەت مەبە ، بەرنامەی کاری ئێمە ئاوایە. ڕەنگە ئاغای نووری بۆ چەند ڕۆژێک میوانی ئێمە بێ. پاش چەند پرسیار و لێکۆڵینەوە کاروباریان لە مەجلیسدا ، ئازادی دەکەین. ئیمامجومعە کوتی: ئاغای ڕەئیس ، بە خوداوەندی خودا ئەگەر خەڵکی بۆکان و دێهاتی و کەشاوەرزانی ناوچەی بۆکان ئازاد بن ، ئێستاش ئاغای نووری دەکەنەوە نمایەندەی خۆیان. ئەتۆ نازانی خزمەتی ئەو پیاوە لە مەجلیسی ڕابردوودا بە «ڕووحانییەت» و «ئامووزش و پەروەریش» و کەشاوەرز و دێهاتییەکان چۆن و چەندە بووە. ئاغای ڕەئیس ، ویست و خواستی خەڵکی بۆکان و دەوروبەر لە بارەی ئاغای نووریدا وەبەرچاو بگرە. ئاخوند زۆر بە تووڕەیی کوتی: ئاغای ڕەئیس ئەمن لەگەڵ تاران بەوردی دواوم ، دەبێ ئەو جۆرە کەسانە زۆر بەتوندی لەگەڵیان بەرەوڕوو بن. ڕەئیسی ئیتلاعات لەو جۆرە

دواندنەی ئاخوندی زۆر تێکچوو کوتی: قوربان: لە پێش ئەوەیدا ئەتۆ تەلەفوونم لێبکەی کە پێت وایە تاوانبارێکت گرتووە، مەئمووری خۆمان لە بانەڕا لەگەڵی هاتووە و لە ئیدارەی ئیتلاعاتی بانەڕا تەماسیان لەگەڵ گرتووم. لێمگەڕێ ئێمە بە ئەرکی خۆمان ئاشناین. لە دوایە کوتی: جەنابی ئیمامجومعە ئیجازە بدە ئاغای نووری لەگەڵ خۆم بەرم بۆ ئیدارە با چەند ڕۆژێک میوانی ئێمە بێ و بۆخۆشت تەماست لەگەڵمان هەبێ. ئەمن هەستام و کوتم: ئاغای ڕەئیس ئەمن حازرم فەرموو. جەنابی ئیمامجومعە، جەنابی مەلا سەید عەبدورڕەحمان، ئێوەش لە دەرەوە خۆتان ناڕەحەت مەکەن. ئەگەر کار لە سنووری پرسیار تێپەڕی، ئەوە خەبەر دەزانن و بە ڕێی قانوونی خۆماندا دەڕۆین. خواحافیزمان بێ و هاتمەدەرێ و ڕەئیس بەدوامەوە بەرەو ئیدارەی ئیتلاعات.

## ڕۆژگارێکی ڕەش و شەوگارێکی تاڵ لە ئیدارەی ئیتلاعاتی بۆکان

کاتێک چووینە ئیدارەی ئیتلاعات، ڕەئیس بە پاسدارێکی ئەسپاردم و بۆخۆی ڕۆیشت.

پاسدار پەڕۆیەکی ڕەشی هێنا و هەردووک چاوی توند بەستم و باسکی گرتم و کێشامی. ئەمنیش وەک کوێران بە دووی کوێرکێشدا کشام، هەر بە پلیکان کە پێچاوپێچی دەکرد، لە دوای یەکدوو سووڕ لە حاستی دەرکێک ڕاوەستا، یەکێک بە کلیل دەرکەی بۆ کردەوە. کە دەرکە کراوە، پاسدار پاڵێکی توندی بە پشتێوە نام و خستمیە ژوورەکەوە و دەرکە پێوەدرا.

لە جێی خۆم ڕاوەستام. ماوەیەک هەستوخوست نەبوو. نەمدەزانی چبکەم. یەکێک لە دیوەکەدا کوتی: مامە بۆ چاوت ناکەیەوە. پەڕۆکەم لە سەر چاوم لابرد و دیتم کوڕەجحێڵێکی کورد لەوێ درێژ ببوو. هەر بەپێوە بووم و تەماشای دارودیوارم دەکرد. گۆچانێکی شوانانەم بە دەستەوە بوو، گۆچانەکەم بە دیوارەوە هەڵپەسارد. کوڕەجەوانەکە هەر تەماشای دەکردم، کوتی: مامە توخودا ئەتۆیان بۆچی گرتووە؟ تێفکریم ئەو جەوانە بەو شکڵ و ڕواڵەتە نەشەمزاو و تێکنەچووە، بۆ گیراو و ئەسیر نەدەبوو. ئەدی چیە؟ ڕەنگە جاش بێ لە پێشدا لێرەیان داناوە هەتا ئەمن بناسێ و قسەم لێڕاکێشێ. کشامەوە بن دیوار لای

سەرووی وەتاغەکە. دانیشتم. پشتم دێشا. پاڵم توند بە دیوارەکەوە دا. گوتم: ئۆخەی. کوڕەکە دووپاتی کردەوە: ئەرێ مامە توخودا ئەتۆی ڕدێنسپی، وادیارە نەخۆشیشی، بەوحاڵەوە بۆچی گرتوویانی؟ گوتم: ڕۆڵە لەبەر خەتاکاری و هەڵە و چەپرەوی ئێوەی جەوانە کە دەبێ ئێمەی پیر کەفارەتێ بدەینەوە. جەوانانی بێئەزموونی وڵاتەکەمان یەکێک کۆمەڵەیە، یەکێک نازانم خەباتە، یەکی دی چیە، کوفت و زەهری مارە، نازانم چ بڵێم بەخۆم، چ بڵێم بە ئێوەی لاوی سەرلێشێواو. کوتم باشە ئەتۆ بۆ گیراوی؟ کوتی: پێم دەڵێن ئەتۆ دێموکراتی. کوتم: ڕاست دەکەن. ئاخر ئەی کەجرەوانە، ئەی بێئەزموونانە، لاوەکانی ئێمە بەپتوونی یان کۆمەڵەن، یان دێموکراتن، یان خەبات. نازانم چتان دەوێ؟ لە سایەی جمهووری ئیسلامیدا، ئیمام خومەینی لە ژێر دەستی تاغووتی هێنانەدەرێ، ئاواتی دوورتان بۆ نیزیک بۆتەوە، ئیدی چی دیکەتان دەوێ؟ چی دیکە داواکارن لە خودا و ئیمام خومەینی؟! لە دوایە کوتم: باشە کورم، بۆت نارەحەتم، نێوت چیە؟ کوتی: مامەگیان «عومەری خزری»م نێوە، خەڵکی محاڵی بەگزادانم، نازانم چییان لێمدەوێ؟ دەڵێن ئەسلەحەت هەیە. کوتم: کورم، چاوەکەم، ئەگەر هەتە بیانەدەوە و ئەگەر تفەنگت دەوێ، بچۆ بۆخۆت ببە بە پاسدار!؟ دەنا برۆ فریای ژیانی دایک و باب و خوشک و برایانت بکەوە.

ئەو کوڕە هەر هەڵدەستا سەر پێیان و دادەنیشتەوە. وەک چاوەڕوانییەکی هەبێ، کات کەوتە نوێژی شێوان. یەک هات دەرکەی کردەوە و سەری هێنا ژوورێ و کشاوە. کوڕەکە لە جێی خۆی هەستا و چووە دەرێ و ئیدی نەمدی بێتەوە. لەو ئاخرییانەدا دیتم و ناسیمەوە، بەڵان خۆی لێ نەناس کردم و ئەمنیش هیچ کات ئەو کاتەم بە ڕوویدا نەداوە، چون نوێنەری سیاسی فەرمانداریيە!؟؟

پاسدارێک هات و دەرکەی کردەوە و تەماشایەکی ژوورەکەی کرد. پێم گوت: برادەر ئەمن ناسازی مەعدەم هەیە، دەرمانەکانم لە ماڵێیە کە دەبێ شەوانە و بەیانانە بیانخۆم. بۆ پێش شام دەرمانەکانیان بۆ هێنام. کارم بە وەی خراپ بوو، شەوانە دوو یان سێ جار دەبوو بچمە ئاودەست. پاسدارێکی ڕدێنسپی و

بەدئەخلاق کلیلی دەرکەی پێبوو، شەوێ کاتی نوستن دەرکەی دەکردەوە و ئیدی هەتا بەیانی دەرکە نەدەکراوە. شەوێ لە جامێکی مسی گەورەدا کە هێندێکی برینج و باقلە تێدا بوو شامیان بۆ هێنام. هێندێکم لێخوارد و ئەوی دیکەم لە جامە مسەکەدا هەڵگرت کە شەودرەنگ بیخۆم مەعدەم وەژان نەکەوێ. جامەکەمْ لە پاش شام نەداوە. شەوانە دوای خواردنی پاشماوەی شامەکە، میزم لەو جامە دەکرد. بەیانان پاسدارە پیرە دەرکەی لێدەکردمەوە، جامەکەم لەگەڵ خۆم دەبردە ئاودەست و خاوێن دەمشوتەوە، چون دەمزانی شامەکەم هەر لەم جامە مسینەدا دەبێ، دەمداوە بە پاسدارە پیرە.

وا دیاربوو ڕەئیسی ئیتلاعات لە دوای ئەوەی ئەمنی سپارد و ڕۆیی، هەموو بنکەی چەکداری پاسدارانی حاڵی کردبوو کە نوێنەری بۆکان لە مەجلیسی تاغووتیدا هاتۆتەوە و خۆی تەسلیم کردووە و ئێستا لە ئیتلاعاتە و زیندانییە. شەودرەنگانێک دەرکی دیوەکەم کراوە و خستیانە سەرپشت و پاسدار وەژوورکەوتن. نە یەک و نەدوو و سێ هەتا شەش نەڕڕەغوول کە ڕەئیسی ئیتلاعاتیشیان لەگەڵ بوو. بە حورمەتی ئینسانی خۆم، نە لەبەر ئەوان و یان لە ترسان، لە جێی خۆم هەستامە سەرپێ. هەموویان بە دیواری دیوەکەوە ڕاوەستابوون و زلزل تەماشایان دەکردم، وەک هاتبن گیانلەبەرێکی عەجیبولخیلقە تەماشاکەن!

حاڵی بووم هاتوون بزانن نوێنەری بۆکان لە مەجلیسی تاغووتیدا دەبێ چۆن بێ و چ فیلەتەنێک بێ. کوتم: ئاغایان دەکرێ بڵێم فەرموون دەستوور چیە؟ ئەگەر پرسیارێکتان هەیە لە خزمەتدام. کوتیان نا، هەر هاتبووین بازڕەسی زیندان و زیندانییەکان بکەین. کوتم: ئاغایان، ڕەنگە باب و باپیرانی ئێمە لە دەورانی چیها پادشا و حکوومەتی جۆراوجۆردا ژیابن، هەر حکوومەتێک گۆڕابێ و یەکی دی هاتبێ، باب و باپیرانی ئێمە هەرگیز بۆ یەکتر نەبوونە ئەغیار و بێگانە و هەر بەو ڕەنگ و شێوازەی پێیەوە ژیابوون، هەروا درێژەیان بە ژیان و مێژووی خۆیان داوە. باوەڕ ناکەم ئێمە نەتەوەی ئەو باب و باپیرانە زۆڵ بین و ڕەوشت و شێوازی ئەوان ڕەچاو نەکەین. ئێستا هیچ کامتان لە پێش چاوی من نە غەیرەن و نە بێگانە. ئایا ئێوە ئەمنتان چۆن دێتە بەرچاوان؟ بێدەنگ بووم بزانم دەڵێن چی؟ هیچیان وەدەنگ نەهاتن، بەڵان یەکیان لە قسەکانمدا جارجار سەری

دەلەقاند کە دەکرا بە مانای باوەڕ لێکی‌دەمەوە. دیسان بە مانای ڕۆیشتن تەماشایەکی یەکتریان کرد، یەکیان لای دەرکی نیشان دا و بۆخۆی لە پێشەوە ڕۆیی و ئەوانی دیکەش بەدووی‌دا جالّە بوون. ئەوەی لە قسەکان‌دا سەری دەلەقاند وەدوا کەوت، لە نێو دەرکە ئاوڕێکی داوە و لەبەرخۆیەوە کوتی: «عموجان غم نخور خدا بزرگە!» پاسدارە پیرە دەرکەی داخستەوە.

سبەینێ پاسدارێک هات و چاوی بەستم و دەستی کێشام بە دووی خۆی‌دا. بە هەستم پلیکانەکانی پێی‌دا وەسەرکەوتبووم، سەرەوژێر دەیکێشامەوە خوارێ. هاوسەتحی ساختومانەکە لە سەر کورسییەک دانیام. دیار بوو «بازپورس» بوو هات.

نێوت چیە؟ محەممەد. بابت؟ ئەبووبەکر. ڕەخنەم لە پرسیارەکانی گرت و کوتم: برادەر ئەگەر بازجوویيم لێدەکەی، حازر نیم ئاوا جوابت بدەمەوە. پرسیارەکانت بنووسە هەتا وڵامەکانت بدەمەوە. دەبێ سوال و جواب بە نووسین بێ. هەرچی پرسی ئەمن بێدەنگ بووم. دوو جاران لە سەر کورسییەکەم ڕایوەشاندم. وڵامی ئەوەشم نەبوو. دیسان پرسیار، دیسان بێوڵام. قامچی بوو یان شووڵ نازانم لە شانی ڕاکێشام، بێدەنگ مامەوە و بۆ جاری دووهەم لە شانی کوتامەوە. کوتم: ئینسان! چۆن ئەو حەقەی بە خۆت دەدەی ڕدێن‌سپی و پیرێکی بێتاوان وەبەر کوتەکان بدەی؟ ئەگەر ئەوەت پێ کردەوەی دێوودرنجان نیە، ڕامەوەستە هەتا ئاخر هەناسەی سوارم پیادە دەکەی و ژینی لێدادەڕنی درێژەی پێبدە. تەقەی کەوشەکانی هات، ڕۆیی و نەهاتەوە. پاسدارێک هات سەرلەنوێ ڕایکێشام هەتا دیوەکەی خۆم و پاسدارە پیرە دەرکەی کردەوە و پەڕۆی ڕەشیان لە سەر چاوم لابرد و لە ژوورێیان خستمەوە و دەرکەیان داخست.

شام و نەهاریشم لە جامە مسینەدا هێندێک برینج و باقلە و برینی مەعدەش دیاربوو بە هیچ کام لە دەرمانەکان ژانی نەدەشکا. خەبەرم لە دەرەوەش نەبوو کە ئیمامجومعە و مامۆستایانی ئایینی و هێندێک لە بازارییەکان لە حەول و تەقەلادابوون و چییان بۆ نەکرابوو.

سێهەمین ڕۆژ بوو، پاسدارێک هات کەڵەگەت و جەوان. چەند لاپەڕی پرسیار هێنا کە لە خوارەوە دەیخوێنینەوە:

پ: ئەتۆ بۆ بوویە نوێنەری مەجلیسی شا کە دەتزانی شا تاغووتییە؟

و: ئەمن نوێنەری شا نەبووم، نوێنەری کەشاوەرزانی دێهاتەکان و شاری بۆکان بووم و لە خواست و ویستی ئەو میللەتە دواوم کە ئەمنیان کردبووە نوێنەری خۆیان. کاری من لە مەجلیس ڕاگەیاندنی نیاز و پێداویستی ئەو ناوچەیە بوو کە هەڵیانبژاردبووم.

پ: لەو ماوەی کە لە مەجلیسدا بووی، چ کارێکت بۆ خەڵکی شار و دێ پیادە کردووە؟

و: ئەو کارانەی ئەمن کردوومن، شتێک نین نادیار و لە بەرچاوان نەبن. کار و بەرنامەکانی من لە دێهاتدا ماون و خەڵک ئێستا کەلکیان لێوەردەگرن.

پ: ئەو کارانەی بە کاری خەڵک دێن و ئێستاش هەر ماون، چن؟

و: ١ــ لوولەکێشی کانیاوی دووره دێ لە ئاواییەکانی: «بەردەزەرد»، «تورکمانکەندی»، «جانمەرد»، «باغچە»ی لای «تیکانتەپە»، «کانی سیران»، «ترکاشە»، «ئەشکەوتان»، «شاریکەند»، «کولتەپە»، «قەرەکەند»، «دونگوز»، «گردی قەبرانی عەنبار»، «داشبەند». خاوێن کردنەوە کەرێزەکانی دێی «کەرێزە» و «تبت». سازکردنی مزگەوتی گوندی «حوسێنمامە». تەعمیری مزگەوتی ئاوایی «لەگز». سازکردنی پردی گوندی «چاوەرچین».

٢ـ بەندکێشی ئاوی دێی «ساروقامیش». لە بارەی گەیاندنی بەرق بۆ دێهات و دەوروبەری بۆکان بۆ ئەو دێیانە بەرق چوون: «ئەمیرئاباد»ی بۆکان، «حەمامیان»، «میراوا»ی عەنبار، «عەنبار»، «گردی قەبرانی عەنبار»، «داشبەند»، «عەلیئاباد»، «وشتەپە»، «ناچیت»، «تیکانتەپە» و هەروەها دە مەدرەسە بۆ گوندەکان.

پ: ئەوانە کارێکن ڕەنگە لە دەورانی نوێنەرەکانی ڕابردوو پیادە کرابن؟

و: هیچیان لەو کارانە لە ڕابردوودا پێکنەهاتوون، تەنیا کار و کردەوەی منە. ئێوە دەتوانن لەو بارەوە لە دانیشتووانی دێهاتەکان پرسیار بکەن.

پ: ئێوە ئەوکاتی لە مەجلیسدا بوون و لە لایەن ئەو خەڵکەوە هەڵبژێردرابوون، بۆچی نەتاندەگوت میللەت حکوومەتی تاغووتی ناوێ؟ بەو جۆرە دەتانتوانی ڕژێمی شای تاغووتی ساقیت بکەن و لەبەینی بەرن.

و: ئەمن دەڵێم ئەوە لە شان و ئەرکی ئاخوندەکان و سیقەتولئیسلام و

حوججەتولئیسلام و ئایەتوڵلا و ئایەتولعوزماکاندا بوو کە لە ئێراندا مزگەوت و میحرابیان بەدەستەوە بوو کە بەپێچەوانەی ئەسپاردەی خۆیان ڕۆژی جومعەکان لە سەر مینبەر و میحرابەکاندا دۆعایان بۆ فەتح و سەرکەوتنی پادشایانی ئێران دەکرد و بە تارانیان دەگوت دارولخەلافە و بە پادشایانیان دەگوت سێبەری خودا لە زەوی و بە هۆی فەرمانی «ئیتاعەتی ئولولئەمر» نەتەوەیان ئەسیری پادشا و فیئۆداڵ و سیستمی خانخانی دەکرد. ئەتۆ کە ئەو پرسیارانە بۆ من دەنووسی، وەک من لەو هەلومەرجەدا ژیاوی کە من تێیدا ژیاوم، ئەتۆ شاگردی مەدرەسە بووی و لە دۆعای بەیانیاندا دەتگوت، خودا و شا و مەیهەن. ئەورۆ کێ دەبێ وڵامدەری ئەو هەڵە و لاڕێییانە بێ؟ ئەمن؟ ئەتۆ؟ یان ڕێبەرەکانی ئایینی و دینی و خاوەنمینبەرەکان.

پ: کاتێک ئینقلابی ئیسلامی بە ڕێبەری ئیمام خومەینی دەستی پێکرد، خەڵک لە ژن و لە پیاو و کوڕ و کچ و عالم و عامی دەڕژانە شەقامەکان و خۆپێشاندانیان دەکرد، ئەتۆ بۆچی تێکەڵ ئەو حەشیمەتە نەبووی و بۆچی تەریکیت لە نوێنەرایەتی نەدەکرد؟

و: ئەمن نە بازاڕی بووم و نە ئەسناف، نە کارگەر بووم و نە کارفەرما، نە ئاخوند بووم و نە تەلەبە. ئەمن نوێنەری چینێک بووم بە ناوێ دێهقان و کەشاوەرز کە لە دڵی دێهاتی دوورکەوتووی ڕۆژئاوای ئێران بە هەزاران نەداری و پێداویستی ژیان، دەژیان. ئەو ڕۆژەی چوومە مەجلیس سوێندم بە قورئان خوارد کە ئەرکی نوێنەری خۆم لە بەرابەر خەڵکی ناوچەدا بەرمە سەرێ و ئەو حەقەم بە خۆم نەدەدا لە جیاتی ڕەفعی نیازمەندی ناوچە و مەڵبەندی خۆم، بچم لە شەقامەکان چەپڵە لێدەم... .

جەنابی پرسیار! ئەوە بۆ حەوت ڕۆژە دەچێ لەم زیندانەدا بە نارەحەتی توندی مەعدەوە لە بەرزەخی نێوان مەرگ و ژیاندا دەستوپێیان دەکوتم. ئەتۆش ڕۆژانە بە دووی یەکدا سینی دەڕازێنییەوە و لە ژێر پرسیاری فاسقانە و مونافیقانەت گرتووم هەتا بزانی لەکوێ هەڵخلیسکێم، سووژەی تاوانباریم هەڵکرێنی. بۆ ماوەی حەوتەیەکە کە پرس و وڵام لەم زیندانەدا درێژەی هەیە. ڕجام وایە ئەوە دوایین پرس بێ کە دەرخواردی مەعدەی منی دەدەی. لام وابوو هاوار و ناڵەکانم کاریگەر بوو، باقی زیندانەکەم پرس و وڵامی تێدا نەبوو.

## بەرهەڵستی مامۆستایانی ئایینی و خەڵکی بۆکان

پیاو لە حەق لانەدا، وەک لە دوایە بۆم دەرکەوت، مامۆستاکان، «حاجی مەلا ئەبووبەکری شەفیعی» و «مەلا سەید ڕەحمان» و باقی مەلاکان و خەڵکی بۆکان بێکار دانەنیشتبوون. ئیمامجومعە لە نوێژی جومعەدا گوتبووی: «ئەگەر نووری لە زیندان ئازاد نەکەن، ئەمن دەست لە ئیمامجومعەیی هەڵدەگرم. ئەگەر پاسداران پێیان وایە نووری نوێنەری داسەپاوی تاغووتە، ئێستاش خەڵکی بۆکان و دێهات دیسان دەیکەنەوە بە نوێنەری خۆیان؟ مەگەر هەر ئەو محەممەدی نوورییە نەبوو کە لە ساڵی ١٣٥٨ دادگای ئینقلابی مەهاباد گرتی و هەزاران کەسی بۆکان و ناوچە ڕژانە دادگا و ئازادیان کرد؟ ئێستا بە چ گوناهێک گرتوویانە و زیندانییان کردووە؟»

ئەو بەرهەڵست و بەربەرەکانییەی مامۆستایانی ئایینی و خەڵکی بۆکان کاری لەسەر کردەوەی ئیتلاعات کرد و نەیانتوانی ویستی خۆیان بەرنە سەرێ. لە شاری بانەشەوە «عەولاخانی شەهیدی» دوو جاری «عیززەتبەگ» ناردبوو بۆ سەر ئیتلاعات، بەڵان جوابی عیززەتیان نەدەداوە. ئەگەرچی عیززەتبەگ چەکداری پاسداران و سەر بە ئیدارەی ئیتلاعاتی بانە بوو، بەڵان سپای پاسداران ئەوانەیان وەک کەوی ڕاو بۆ کەوگرتن ڕاگرتبوو. خەفەتبارییە، غەمهێنە، ئەو جاشە کوردانەیان وەک «شینلوو»ی پۆلیس بۆ بۆن کردن و دیتنەوە دیاری کردبوون! ئەرکی گرتنیان لە پێدابوو، بەڕەڵاکردن نا؟! بەداخەوە ئەو نەتەوەیە لە درێژایی ژیانی مێژووی خۆیدا هەر بۆ خۆخۆری هاندراون و بۆیان نەکراوە لە خزمەتی بێگانەدا خۆخۆر نەبن؟ دەنا خزمەتی عیززەتبەگ بە سپای پاسداران لە سەرسنوورەکان، لە هەلومەرجێکدا کە ئێراق ئاوری شەڕی هەڵاییساندبوو، زۆر بەقیمەت و جێی ڕێز بوو.

لام وایە دوایین پرسیان بۆ بەرجەوەندی بیروڕای من زۆر بەپێویست زانی:

پ: ئەتۆ لە بارەی ڕێبەری ئیمامەوە کە نایبی ئیمامی زەمانە و واجیبولئیتاعەیە دەڵێی چی؟

و: بۆ ئێمە ئەهلی سوننەت و جەماعەت بە فەرمانی خودا کە دەڵێ «اطیعواالله و اطیعوالرسول و اولیالأمر منکم» سێ جۆر ئیتاعەت فەرز کراوە و سیمای ئەو ئیتاعەتانە هەرکام لە خۆیاندا جیاوازییان هەیە. نەوعی ئیتاعەی خوا جیاوازی

لەگەڵ مانای ئیتاعەی ڕەسووڵی خوا هەیە و ئیتاعەی «اولی‌الامر» بەتەواوی جیاوازی لەگەڵ نەوعی ئیتاعەی خوا و ڕەسووڵە، چون «اولی‌الامر»، «منکم»ی هەیە، یانی وەلی ئەمر لە خۆتان. بیروڕای ئێمە ئەوەیە «وەلی ئەمر» پێویست نیە هەر ئیمام بێ، باب و دایکیش «وەلی ئەمر»ن و دەتوانێ گەورەی خانەوادە یان شارەکەت بێ، هەتا دەگاتە سەرپەرستی وڵاتەکەت، چون خودا فەرموویەتی «اولی‌الامر منکم» و «منکم» یانی لەخۆتان.

## جەدەلی من و ئاخوندێک لە بارەی «اولی‌الامر»

لە بەرامبەر جوابەکانی مندا کەسێک و یەکی دیکە کە پێم وابوو ئاخوند یان ئاخوندەک بوو، لەگەڵیان کردمە جەدەل و کوتیان:

چۆن دەڵێی «ئولیلئەمر» پێویست نەکراوە هەر ئیمام یان نایبی ئیمامی زەمان بێ؟ کوتم: ئاغایان ئەگەر وابێ باب و باپیران و ئەجدادی ئێمە هەموویان بە کافری مردوون. چونکە ئەوان لە ژیان و زەمانی خۆیاندا فەرمانبەرانی کەسانێک بوون وەک شاهانی: «پەهلەوی»، «قاجار»، «زەند»، «ئەفشار» و «سەفەوی» و زۆر دوورتر لەوانە «ئەمیر تەیموور»، «مەغوول»، «خارەزمشاهی» و «سەلجووقی» و ئیتاعەتی ئەوانیان کردووە و شوێنەواری ئایین و دینی ئیسلامی خۆیان پێک‌هێناوە و تەنانەت حوججەتولئیسلام و ئایەتوڵلاکان و ئاخوندەکانی ئێوە لەو بارەوە مرتەقیان نەکردووە و بەڵکوو زۆریان جیرەخۆری دەزگای سەلاتینی وەخت بوون. جگە لە ئیمام خومەینی کە لە دنیای شیعە و لە ئاسمانی ئێراندا درەوشاوە و مەشعەلی «ئیمامەت»ی هەڵاییساند، کام ئایەتوڵلای ئێوە ئاڵای بەربەرەکانی هەڵکردووە؟ ئەمن بە ناوی زیندانییەکی لەگەڵتان نادوێم و مەبەست لەسەر دین و ئایین و خەسلەتی ئینسانییە، ئێستا کە ئێوە خۆتان بە «اولی‌الامر» نازانن ئیتاعەت کردنی خۆتان بە سەر مندا نەسەپاندووە؟ چۆن ماوەی هەشت ڕۆژە لەو زەرفەدا کە شام و نەهاری تێدا دەخۆم، شەوانە میزی تێدا دەکەم هەتا سبەینێ دەرکەم لێدەکەنەوە! ئایا من دەسەڵاتی ئیتاعەت نەکردن و جواب نەدانەوەی ئێوەم هەیە؟

برادەران باسمان لەسەر لێکۆڵینەوەی وشەی «اولی‌الامر»ە. کەسانێکی بە جۆرێک ئەمریان لەسەر نافیز بێ، ئەو کەسە باب و دایک بێ یان حاکمی وڵات،

ناتوانێ لە لایەن دینی، کۆمەڵایەتی و یان سیاسییەوە لە ئەمر و فەرمانیان‌دابێ، چونکە ئایەتەکە دەڵێ «اولی‌الامر منکم»، کە وابوو لە خۆتان دەبێتە غەیری خودا و ڕەسووڵ و نەوعی ئیتاعەتەکەش غەیری ئیتاعەتی خودا و ڕەسووڵە.

ئەوانە وەرامی نێوەنێوە پرسیارەکانی ئەو دوو پاسدارە بوو. دەمزانی بەتایبەت هاتوون هەتا بیر و باوەڕی من یان نەتەوەی کورد لە بارەی «ویلایەتی فەقیهـ» یان ئیتاعەتی «اولی‌الامر» هەڵسەنگێنن.

پاش نیوەڕۆی ڕۆژی هەشتەمی زیندانیم بوو دیتم دوو پاسداری دیکە کە تا ئێستا دیمەنی ئەوانم نەدیتبوو لێم وەژوورکەوتن: سەلام، حاڵت چۆنە ئاغای نووری. کوتم: سپاستان دەکەم. لەبەر ناڕەحەتی مەعدە حاڵم چاک نیە و نیازم بە دوکتور و دەوا هەیە کە بۆ چارەسەری زامی مەعدە ناچار بە چوونی تەورێز دەبم. لە دوایە کوتیان: ئێمە پرسیارمان لەسەر تۆ تەواو بووە، تەنیا کارێکی بە تۆمان ماوە ئەوەیە کە تۆ حازر بی وتووێژێکی تەلەویزیۆنی ئەنجام بدەی، یانی ئیزهاری نەدامەت و پەشیمانی لە کردەوەی خۆت بکەی و ئیمان و باوەڕ بە ڕێبەرایەتی ئیمام و جمهووری ئیسلامی دەربڕی و هیچی دی.

گوتم: برایانی پاسدار، هەشت ڕۆژە بێ‌تاوان ئەمنتان بە حاڵی نەخۆشی و ناساغی زیندانی کردووە. لام وایە سەد لاپەڕتان سوال و جواب لە من وەرگرتووە و ئەوەی پێویست بووە لێتان پرسیوم و وڵامم داونەتەوە. دەربڕینی نەدامەت و پەشیمانی بۆ تاوانبارە کە من گوناه و خەتایەکم نەکردووە هەتا پەشیوانی خۆم بە خەڵک ڕاگەیەنم. ئەگەر پێتان وایە تاوانبارم مەمبەخشن، سزام هەرچی هەیە، ئیعدام، حەبسی ئەبەد و زیندانی چەندساڵە، ئامادەم ئەدای بکەم، دەنا خاترجەم بن حازر نیم بۆ وتووێژی تەلەویزیۆنی، وەسسەلام و لاکەلام.

بڕێکیان تەماشای یەکتر کرد و هێندێکیان سەر لەقاند و هەستان ڕۆیشتن و دەرکەیان لەسەر داخستمەوە. لام وابوو بەڵگەیان بۆ ڕاگرتنم نەمابوو.

## ئازادی لە زیندان و چاوەدێری لە دەرێ

نوێژی شێوانێکی درەنگ بوو، پاسدارێکی هەمەکارەیان بە ناوی «محەممەدی»، یەکێکی چەقەڵە و مردەلۆخە و کۆسەکار کە سەروسەکوتی بۆ

جندۆکەی منداڵترسێن دەبوو، لێم وەڕووکەوت و کوتی: ئاغای نووری هەر شتێکی پێتە هەڵیانگرە بچینەخوارێ. شتەکانم هەڵگرت و هاتمە ئاستی دەرکە کوتی: ڕاوەستە. پەڕۆڕەشەکەی دەرێنا و دیسان چاوەکانی بەستم و کێشامی هەتا خوارێ. لە ساڵۆنەکەی پێشەوە چاوەکانی کردمەوە و گۆچانەکەی دامەوە و بە شۆخی کوتی: ماشێنەکەمان لێرە نیە بتباتەوە بۆ ماڵی خۆتان. کاتێک هاتبووم بۆ ئیتلاعات، بڕێک کاغەز و بەڵگە و تۆمارێکی خەڵکی دێهات کە دابووم بەو شەیتانڕەوشتە، حاشای لێکردم و نەیدامەوە. ئەمنیش لاواز و ناتەواو و بێهێز بەو چەند ڕۆژ زیندانییە، ئەوەندەی دیکە تواناییم لە دەس دابوو.

هاتمە دەرێ، وڵات تاریک بوو، نێوەنێوە چرای خەیابانان داییسا. بە کوتەکوتی گۆچان و هەنگاوی شلوشەوێق، دەستم بە پێوانی خەیابان کرد. دیتم ئاغای پاسدار محەممەدی بە هەنگاوی شل و دەست و گۆچانم پێدەکەنێ. حەقی بوو، ئەوە ئاغای نووری نوێنەری دەورانی شایە، وەک گەدای سامیرە، گۆچانکوت تاریکەخەیابانی بۆکان دەپێوێ؟!

خەیابان خەڵوەت بوو و شاری خامۆشانی دەخستە سەر زەینی ڕێبوارەوە. درێژایی شەقام جێجێ ڕووناک بوو و باقی تاریکەشەو. لە سەر قەڵا کە دەیڕوانییە خەیابان پاسگای پاسدارانی لێبوو. نیزیک بوومەوە، لە حاستی پاسگا یەکجێ چرای خەیابان هەمووی کووژاوە و بوو بە تاریکەشەوێکی ئەنگوستەچاو. فکرم لێکردەوە لە پێشم پاسگایەکی پاسدارانی لێبوو و تاریکەشەو کە هاتوچۆ لە خەیابان نامێنێ، پاسداران لە نسێی خۆیان دەرەوێنەوە، گەیبوومە ئاستی دەواخانەی سینا، لەو کووچەدا ماڵی خزمێکی لێبوو، چووم دە کووچەوە. گەیشتمە دەرکی ماڵی خزمێ، لە زەنگی دەرکێم دا. کێیە؟ ئەمنم بیکەنەوە. چوومە حەسارێ. هاوین بوو لە حەسارێ دانیشتبوون. زۆریان پێ سەیر بوو، پێیان وابوو لە زیندان هەڵاتووم. ئەگەرچی زۆر بێحاڵ بووم، ملم لە پێکەنین نا، ئەوجار تەماشای یەکتریان کرد، ڕەنگە پێیانوابووبێ کە شێتیش بووم. نەقڵی خۆم گێڕاوە کە چونکە بەرقی خەیابان کووژاوەتەوە، نەموێرا بە تاریکی بچمەوە ماڵێ و لامداوە بۆ ئێرە. کوتم بە

تەلەفوون بە ماڵێ بڵێن کە لە زیندان نەماوم. شەو لەوێ خەوتم و بەیانی چوومەوە ماڵی خۆم. حەوتەیەک دۆست و ئاشنا و خزم و تایفە هاتوچۆیان دەکرد. بە فەرمانی پاسدار محەممەدی هەموو سبەینان دەبوو بچم خۆم بە ئیتلاعات بناسێنم و قامک بە دەفتەرەوە بنێم. ئیمزا قەبووڵ نەبوو و هەر دەبوو قامک بێ.

کاک «محەممەدی ئێلخانیزادە» و «حاجی سەید تاهیری ئیمامی» و «حاجی سەید ئەنوەری هاشمی» و چەند کەسی دیکەش بە ناوی «تەسلیمی» هەموو ڕۆژێ خۆیان بە ئیتلاعات دەناساند. بەڵان حاجی سەید ئەنوەر و حاجی سەید تاهیر بە حاڵزانی و دەراوناسی، خۆیان لە ڕیزی تەسلیمی هێنادەرێ و جاری وابوو لە لای پاسداران تکایان بۆ دەکردین. لە دوای حەوتەیەک بوو بە دوو ڕۆژ و دوای حەوتەیەکی دی بۆیان کردمە جارێک کە بچم و خۆم بناسێنم.

ڕۆژێک پاسداری سەر دەفتەرەکە پێی کوتم: سبەینێ ئەوانەی «تەسلیمی»ن بێنە مزگەوتی حوسەینییە. ئەمن نەچووم و کاتێک چوومەوە بۆ ئیمزا کوتی: ئەتۆ بۆ نەهاتبووی بۆ مزگەوت تا لەگەڵ کاروان بڕۆی. کوتم کاروانی چی؟ کوتی: ئەوانەی تەسلیمی بوون دەیانننێرن بۆ شارەکانی کوردستان و کرماشان. کوتم بۆچی دەچن؟ کوتی بۆ ئەوەی خەڵک بیانبینن کە ئەوانە تەسلیمی جمهووری ئیسلامین. ئەتۆش دەبوو بچی و ئەوە غایب نووسراوی. کوتم: برادەری پاسدار بۆ ئەمن ورچی سیرکم، یان شێری قەفەسم تا خەڵک بێن و تەماشام بکەن. ئەمن نە یاغی بووم نە چەکدار و نە ئەسیری شەڕ و هەوەڵێ پێمگوتوون ئەگەر تاوانبارم بمهاوێنە زیندان و دەنا ئەوە ئازادی نیە. پاسدار کوتی: ئەگەر وایە دەبێ هەموو ڕۆژێک بێ و خۆت بناسێنی و دەفتەر ئیمزا بکەی. کوتم: ئەگەر تۆ پێت شوورەیی نیە پیرەپیاوێکی وەکوو من هەموو ڕۆژێ بە گۆچانەوە بێتە ئێرە و بڕواتەوە، ئەمنیش پێم باشە و وادەکەم. کوتی: حەقی دەرکەوتن لە شاریشت نیە. کوتم: زۆر چاکە. کوتی: دووبارە پێتدەڵێم حەقی دەرکەوتن لە شارت نیە. کوتم: ئەمن نەخۆشم و ناچارم بچمە تەورێز بۆ لای دوکتور. کوتی: ئەگەر ڕەئیسی بێهداری بۆت بنووسێ دەتوانی.

هەتا دە ڕۆژان هەموو ڕۆژێ دەبوو سبەینان بچمە ئیتلاعات و قامک بە دەفتەرەوە نێم و بێمەوە. زۆر جاران دەکەوتمە بۆڵە و بناشت لەگەڵ خوای گەورە

و گران و دەمگوت، خوایە بۆخۆت دەڵێی «هل جزاءالاحسان الا الاحسان» خوایە نیزیکەی چوار ساڵ بە ناوی نوێنەری خەڵک لە مەجلیس بووم، ئاگات لێیە لە ئەمانەت و دروستکاری و ئەنجامی نیازی نیازمەندان زیاتر کارێکم نەکرد؟ خوایە بۆخۆت دەزانی، پلە و پایەی دنیا نەیتوانی شوێنەوارێکی نائینسانی و بێخودایی لە سەر کردار و ڕەفتار و بیروڕای من دانێ؟ خوایە گیان بۆخۆت ئاگات لێیە لە دنیای تەنیایی خۆمدا پەیمانم لەگەڵ بەستی ڕوتبە و پایەی دنیایی هەڵمنەدێرێ و لەو کارە باشانە کە لە لای تۆ باشن دوورم نەخاتەوە؟ ئەی خودایە گیان ئەو هەموو تەوهین و ناڕەوایە چۆن لە لای تۆ ڕەوایە؟ چۆنە ئەو هەمووە ناسزایە لە بەش و ئیشی مندا سەری هەڵداوە و لە کانی ژیانی مندا دەجۆشێ و هەڵدەقوڵێ؟ خوایە گیان ئەو قەرەنۆکەرانەی کە لان و لایەنی تۆیان بەرداوە و تەنیا بە ڕیش و عەبا و عەمامەی کەسانێک هەڵدەڵێن کە تەنیا پارێزگاری پلە و پایەی دنیای خۆیانن و بە نێوی تۆ چ ڕچە و ڕێبازێکی ڕەچاو دەکەن کە تەنیا شەیتان ڕازی و باوەڵوو دەکا، دەبێ حاڵیان لای تۆ چ بێ؟ ئەوە ڕاز و نیازێک بوو لە بارەگای یەزدانی پاک.

## دۆزینەوەی ڕێگای چارە بۆ عیلاجی زامی مەعدەمم

دەرد و ئێشی زامی مەعدە زۆری بۆ هێنابووم و حەقی وەدەرکەوتنم بۆ هیچ شار و دێیەک نەبوو. جاری وابوو دەبوو ناو و نیشانی میوانەکانم بە ئیدارەی ئیتلاعات ڕابگەیەنم. لە پاییزی ساڵی ١٣٦٢ خوێنڕێژی مەعدەمم دەستی پێکرد و دوو ڕۆژان بە هیچ جۆرێک حەجمینم نەبوو. دوکتورانی لای خۆمان کوتیان دەبێ بچی بۆ تەورێز یان تاران. چوومە ئیدارەی ئیتلاعات و ئەوانیش کوتیان ڕەئیسی بێهداری دەبێ بۆ ئێمە و بۆ تەورێز بنووسێ تا ئیجازەت بۆ سادر بکەین.

ئاغای دوکتۆر کەریمی ڕەئیسی بێهداری بۆکان لە دۆستان و ئاشنایان بوو، بۆ ئیدارەی ئیتلاعات و سپای پاسدارانی نووسی کە محەممەدی نووری پێویستی فەوری بە عەمەلی جەڕڕاحی مەعدە هەیە. ئەوکات ئیجازەیان دامێ بچمە تەورێز و کوتیان دەبێ لە هاتنەوەدا گەواهی دوکتوری چارەگەر و ئەو موسافیرخانەی کە لێی دەبی بۆمان بێنییەوە.

## چوون بۆ تەورێز بۆ چارەسەری و گەڕانەوەی بێ عیلاج

کوڕ و برازا لـە ماشـێنیان خـستم و بردیـانم بـۆ تـەورێز بـۆ لای دوکتـور «هیرسچیان» کە جەڕڕاحێکی زۆر لێهاتوو بوو. دوای چاوپێکـەوتنی پزیـشکی و وێنەهەلگرتن لە مەعدە و «ئەسناعەشەر» کوتی: نیازت بە عەمەل هەیە کە دەڵێی بۆت بنووسم لە نەخۆشـخانەی «خوسووسـی» ئازەربایجـاندا بتخـەن. کـوتم: دوکتور، ئەگەر هەتا دە ڕۆژی دیکە عەمەلەکەم وەدوا بخەی بڵێی بەرگـە بگـرم و بمێنم؟ کوتی: ئەگەر کاری بەتاڵـووکەت هەیـە دەکـرێ زوو جێبـەجێی بکـەی و بگەڕێیەوە جا عەمەلەکەت ئەنجام بدرێ، بەڵان نابێ لە دە ڕۆژت زیاتر پێبچێ.

## لە بەینی مەرگ و زیندەگیدا ئەو مۆڵەتەم بۆ چی بوو؟

کچی «حەمەدئاغای ئیبراهیمی»، ئاغای «گلۆلانی سـەرێ»م بـۆ «جـەماڵ»ی کوڕە گەورمم خواستبوو. دەبوو لە پاییزدا بۆی بگوێزمەوە و دەترسـام لـە ژێـر ئەو عەمەلە گیان دەرنەکەم، لەدوایە کاری ئەو کوڕە دە قوڵێ دەکەوت، ئـاواتم بوو بە زوویی ئەو کارە ڕاپەڕێنم و بۆی بگوێزمەوە، ئەوە دوایین ئاواتی گەورمم بوو. دەمگوت نەوەکوو مەرگ مۆڵەتم نەدا. هاتینەوە هۆتێل و کوتم: سـازبن بـا بڕۆینەوە. کوتیان: ئەدی کەوتنەکەت لە نەخۆشخانە؟ کوتم: دەچینـەوە ماڵـێ و دێینەوە. هەرچی کوتیان جارێ عەمەلەت پێویستە فایدەی نەبوو. وەڕێکـەوتین و بۆ شەو هاتینەوە بۆکان و دەمهەویست سبەینێ دەسبەکار بم. بەڵان ئـیرادەی خودا غەیری ئەوە بوو. نیوەشەو لە تاو ئێـشی مەعـدەم وەخەبـەر هـاتبووم و ئەوەی خواردبووم بە خوێناوی هێنامەوە و خەوم لێنەکەوتەوە و هەتا سـبەینێ تلامەوە. هـیچم نـەخوارد، دیـسان ڕشـامەوە. مـەودای مانـەوە و خـۆڕاگرتنم نەمابوو. کوڕ و برازاکانم بانگ کردن و کوتم بڕۆینەوە بۆ شاری تەورێز و ئەگەر بتوانن بمگەیەننەوە لای دوکتور. ماشێنێکیان هێنا و لە نێو گریـان و شـیوەن و شەپۆڕی خێزاندا بەڕێیان کردم.

کە چووینە تەورێز لەڕێوە بردیانمە لای دوکتور و ئەویش بۆ نەخۆشـخانەی نووسی کە سبەینێ بمخەن. شەوێ لە هۆتێل ماینەوە. خواردنم بـۆ نـەدەخورا و هەرچی خواردبام بە خوێناوی دەمهێناوە. گیانسەختی شتێکی سـەیرە، هـەموو هەلەکانی ژیانم گیاندەرچوونێکم بوو، کەچی نە لـە نێـو مەیـدانی مەینـەتان،

دەردەچوو ، نە گیان لە قەفەسی تەنگەبەری ژیان دەهاتە دەرێ! ژیان و گیان بەو هەموو ناتەبایی‌یەوە کە پێکەوە بوویان ، شان‌بەشانی یەک هاوکات هەر پێکەوە دەهاتن و دەلەقان. نە کات دەپسایەوە و نە گیان لە ژیان دەکشایەوە!

سبەینێ بردیانمە بیمارستانی «ئازەربایجان» کە نەخۆشخانەیەکی «کلینیکی» بوو ، زۆر پاک و خاوێن. دوکتور هات و دەستووری دا بۆ عەسر ئامادەی عەمەلم بکەن. پەرستارێکی پیاو هات و زگی ڕووت کردم و سینگ و بەرۆکی خاوێن تاشیم و دوو دەنکی دەرمان دامێ و ڕۆیی. لای عەسر دوکتور هاتەوە و بردیانمە وەتاغی عەمەل. وەتاغی چی؟ ساردخانەیەک بوو! لەرز گرتمی ، ددانم ددانمی نەدەگرت. دەرزی بێهۆشییان لێدام. فکرم دەکردەوە دەبێ دوکتور نابیغە بێ ، دەنا هیچ دوکتورێک ناوێرێ بێهۆشم بکا؟ هەر ئەوەندە هۆشم هەبوو کە لێیان خوڕیم بۆ سەر تەختی عەمەل. چاوم بەرەو حەوا دەیڕوانی ، تەقەی کارد و مەقەست و چەقۆیانم گوێ لێبوو ، کوتم: دوکتور ئەمن هۆشم هەیە. دوکتور ڕوانییە دوکتوری بێهۆشی. کوتی: نا هاتەران‌پاتەرانێ دەکا. هۆشم لە سەرەخۆم بوو و نەمدەڕاواند. کوتم دوکتور: بڕوانە سەقفی وەتاغەکە ، تالێکی جالجالۆکە بە هەوای باوەشێنەکە هاتوچۆیەتی. کە ڕوانییان وابوو. دوکتور کوتی: هاتەران‌پاتەرانی چی؟ لە من و لە تۆ لەسەر حالترە؟ تەقەی کەوشی دوکتوری بێهۆشیم گوێ لێبوو ڕۆیی و هاتەوە و بە قامکی شتێکی بە دەوری کونە لووتی لای چەپمدا هێنا. بەر لە بێهۆشیم پێمگوت: کونەلووتی ڕاستەم گیراوە و گۆشتپارەی هەیە و هەمیشە کپە ، بۆیە شتەکەی بە کونەلووتی لای چەپەمدا کرد. هەستی قامکی و شتەکەم کرد و بێهۆش بووم و ئیدی ئاگام لە خۆم برا.

کاتێک نیوەحەواسم زیندوو بۆوە ، لە دەریایەک دەرد و ئێشی دەروونی‌دا بلقم دەخوارد. چاوم وەک لە نێو گۆمێکدا هەلێنم زەردایەکی لێلم دەدی و قورسایی‌یەکی بەئێشم لە سەر ئەژنۆکانم هەست دەکرد. تۆزێکم ئەژنۆ بزاوت دیتم قورستر بوو. «عومەر»ی برازام پێیان‌ئەسپاردبوو نەیەلێ ئەژنۆکانم تەکان بدەم. عومەر هێندەی سەنگ دابووە سەر ئەژنۆکانم کە بارتەقای ئێشی زامەکانی دەروونم دەهاتەوە. کوتم: «ئەمیر» (لەبیرم بوو کە شیعە عومەریان خۆش‌ناوێ!) ئەتۆ بڕێک دەستت لە سەر ئەژنۆم شل کە ، دەزانم دەبێ خۆم نەبزێوم. لەبەر

ئێش و ژانی مەعدەی عەمەلکراوم هاوارم لێ بلّیند بوو. پەرەستارێک هات و کوتی: لەبەر ئەوەی زوو وە هۆش بێیەوە، دەرزی ئارامبەخشمان لێنەداوی، ئێستا ئێشت خەلاس دەکەم. دەرزییەکی لێدام و بڕێک ئارام بوومەوە. چاوم هەلّێنا ڕووناک ببۆوە. هەموو گیانم شیلانگی پێوەبوو. وازی سیغارم کرد، کوتم: سیغارێکم بۆ داگیرسێنن. «حوسێن»ی برام لە بن سەرم بوو، کوتی: کاکە بە کوێت دەیکێشی؟ لووت و زارت شیلانگی تێدایە. کوتم: بە لایەکی لێومەوەی بنێ نەفەسی لێدەدەم.

بۆ ماوەی دە ڕۆژان لەو نەخۆشخانەیە مامەوە و دوایە دوکتور هەلّیستاندم و کوتی وەرەوە بۆ مەتەبی خۆم، تەقەلّەکانی دەردێنم و دەتوانی بڕۆیەوە بۆکان بۆ مالّی خۆت. خوالێخۆشبوو «حاجی ئەحمەدی ڕۆستەمی» کە مالّی لە تەورێز بوو، ڕۆژانە دەهاتە لام. کاتێک دوکتور ئەوەی گوت، حاجی ئەحمەد ماشێنەکەی هێنا و بردمییە مەتەبی دوکتور. دوکتور کوتی: تەقەلّەکان دەردێنم و دەتوانی بڕۆی. کوتم: دوکتور، مەبادا لە ڕێگا ناڕەحەتییەک بێتە پێشێ، دەکرێ تەقەلّەکان لە بۆکان دەرێنمەوە؟ دوکتور ئەوەی پێباشتر بوو کە پاش دوو ڕۆژی دی ئەو کارە بکەم. هەستام بڕۆین و زۆرم سپاس کرد. حاجی ئەحمەد کوتی: دوکتور، نەخۆشەکەت، ئاغای محەممەدی نووری نمایەندەی خەلّکی بۆکان لە دەورانی «شا»یە و لە لای خەلّکی بۆکان زۆر بەڕێزە. دوکتور کوتی: ئەمنیش لە بەرەکەتی دەورانی شا بوومە ئەو دوکتورەی خزمەتکاری میللەت، بەلاّن حاجی بۆ لە پێشدا ئەوەت پێنەدەگوتم؟ دوکتور ١٢هەزار تمەنەکەی داوە بە حاجی ئەحمەد کە ئەمن قبوولّم نەکرد. کوتم: ئاغای دوکتور نەخۆش ناساندنی ناوێ، لە دەستی دوکتوراندا شا و گەدا فەرقی نیە و ئەتۆ ئەوەی پێویست بوو لە سەر من ئەنجامت داوە، بەلاّن ئەوە بۆ من جێگەی کەسەرە کە ناتوانم جوابی چاکەی تۆ بدەمەوە. هەستاین بڕۆین، دوکتور لەگەلّمان هاتەدەرێ و کوتی: دوای مانگێک وەرەوە تەماشای جێگای عەمەلەکەت بکەمەوە. هەتا سێ سالاّن کە ڕۆیی بۆ فەرانسە هەر لە ژێر چاوەدێری ئەو دوکتورەدا بووم. هاتینەدەرێ و کوڕ و برازاکانم بەڕێکردەوە بۆکان و بۆخۆشم شەوێ لە مزلّی حاجی مامەوە و سبەینێ بە ماشێنی خۆی هێنامییەوە بۆکان. کوڕەکان کە هاتبوونەوە، چەند سەر گیسک و بەرخیان کڕیبوو بۆ گوێزتنەوەی مارەکراوی «جەمالّ» و

بەجێهێنانی ئاواتی هەرەگەورەی من.

تەقەڵـەکانم دەرنـەهێناوە و نـاردم لـە دووی «حەمـەدئاغا»ی خـەزووری «جەماڵ». ئەویش ڕاپەڕاندنی ئـەو کـارەی پـێباش بـوو. لـە دوو ڕۆژاندا بـە کۆبوونەوەی خزم و تایفە و بنەماڵە، بووکمان بۆ «جەماڵ» هێنا ماڵێ و ئۆخژنم کەوتێ و ئەوجار ناردم دوکتور «شـێخی» هـات و تەقەڵـەکانی دەرهێنـاوە. لـە پاشان گەواهی دوکتوری نەخۆشخانەی «ئازەربایجان» و گەواهی دووسـێ شـەو هۆتێلم پێچاوە و نـاردم بـۆ ئیـدارەی ئیتلاعـاتی سـپای پاسـداران. ئـەوانیش ڕوحمیان تلیساوە و خۆناساندنی ڕۆژانە و حەوتانەیان بۆ کردمە مانگانە.

ساڵانی ١٣٦٢ و١٣٦٣ی هەتاوی بە دووی یەکدا هـاتن و ڕۆیـشتن و لـە نێـو ساغی و نەخۆشی و گیروگرفتی زەماندا، دەستوپێـی سـەرەمەرگم دەکوتـا بـە نێوی مان و ژیان.

## گوڵمەزێکی دی لە تاران سەری هەڵدا

لە ڕێبەندانی ١٣٦٤ لە تـارانڕا بـەرگێکی «ئیحزارییـە»م، لـە لایـەن سـپای پاسـدارانی بۆکانـەوە بـۆ هـات کـە ڕۆژی چوارشـەممۆ، کـاتژمێر ٨/٥ ڕۆژی ١٣٦٤/١١/٣٠ خۆم بـە وەتـاغی ژمـارە ٢٧٠ی بازپورسـی شـوعبەی ٤٨ی دادگـای ئینقلابی تاران بناسێنم. بەرگـەکانی پێویـست: دو عەکـسی ٤ ×٣ و ڕوونووسـی دایک و باب و خوشک و برا و هاوسەر و ئەولادان.

دادگای ئینقلابی ئیسلامی هەتا ئـەو ڕۆژە چەنـد ئیحزارییـە و ئیختارییـەی بۆناردم بەلاّن خۆم دەبوارد و نەدەچووم. بەلاّن ئەمجار کە هاتوومەوە بۆکان و بە ڕاشکاوی نیشتەجێ بـووم، چـۆن دەکـرێ نـەچم و خـۆم ببـوێرم. بەڵـگەکانی پێویستم ئامادە کرد، بەلاّن پێویست بوو هاوڕێیەکی ژیر و وریام لەگەڵ بـێ تـا ئەگەر گیران یان زیندانیبوونێک هاتـە گـۆڕێ، خێـزان و بنەماڵـە پـێبـزانن. خوداڵیخۆشبوو «مەلامحەممـەدی بیـادار» لـە دۆسـتانی نیزیـک و هـاوڕازانی لەمێژینەم بوو. کاتێک ئەو پێشهاتەم پێگوت، کوتی: ئەمن حازرم لەگەڵت بێم بۆ تاران. بێڕاوەستان دوو بلیتی ئوتووبووسـی تـارانم وەرگـرت و وەڕێکـەوتین. شەوێ لە ڕێیـەدا بـووین و ڕۆژی ٢٩ی ڕێبەنـدان، لـە تـاران چووینـە هۆتێـل «شەرافەت» و بۆ سبەینێ کـاتژمێر ٧ی بـەیانی دەرکـەوتین. هاتینـە مەیـدانی

تۆپخانە کە سواری تاکسی بین بۆ شوعبەی ٤٨ی دادگـای ئینقـیلابی ئیـسلامی. چاوەڕێی تاکسی بووین دیتم کاک «عەبدوسـسەلامی شێخولئیـسلامی» بـەوێدا هات و ئەمنی دی کە لـەمێژ بـوو دۆسـتایەتی بنەماڵـەییمان پێکـەوە هـەبوو و براچکۆلەی «مەلا ڕەحیمی شێخولئیسلامی» بـوو کـە ئـەویش لـە دەورەی ٢٤ی مەجلیسدا نوێنەری سەقز و بانە بوو. عەبدوسسەلام هاتە پێشێ و دوای سەلام و ئەحواڵپرسی کوتی: ئەدی بۆ لێرەی و بۆ کوێ دەچی؟ ئیحزارییەکـەم نیـشاندا. کوتی: بەو جێگایە شارەزام و دەزانم لە کوێیە، ئەگەر ئیجـازەم بـدەی لەتـەکتا دێم.

عەبدوسسەلام کارمەندی پێشووی «دادگوستەری» بوو لە دوایـە «وەکالـەتی» دەکرد. کوتم: ئەگەر کاری فەوری و بەپەلـەت نیـە، حەزدەکـەم لەتـەکما بێـی. سواری تاکسی بووین و کاتژمێر ٨ گەیشتینە پێش دەرکی دادگا و چووینە حەسار و «ئیحزارییـە»کـەمان نیـشان بەرپرسـی پـێش دەرگـا دا و چووینـە ساڵـۆنی ساختومانەکەوە. لەوێش مونشی دەفتەر «ئیحزارییە»کەی وەرگـرت و تەماشـای کرد و کوتی: تەبەقەی ٣، وەتاغی ٢٧٠. بەڵان لە دووکەس زیاتر ناچنـە سـەرێ. مەلامحەممەدی هاوڕێم کوتی: ئاغای نووری، باشتر ئەوەیە کاک عەبدوسـسەلام کە لەو ڕێیەدا کار دەکا لە گەڵت بێ، ئەمن لە خـوارێ چاوەڕێتـان دەبم. کـوتم: بەڵێ، ئەگەر پێکەوە هاتینە دەرێ ئەوە باشە، دەنا ئەگەر ئەمن گیروگـرفتم بـۆ ساز بوو، ئەتۆ هەواڵەکەی بەرە و بچۆوە بۆکان.

ئەمن و کاک عەبدوسسەلام چووینە سەرێ. لە کاتژمێر ٨/٥ شتێک تێپەڕ ببوو چووینە ژوورێ. «قازی»یەکی ڕیشووی گەڕاوەساڵ لە پشت میزەکەی دانیـشتبوو و چەند پەروەندەی لە پێش بوو. ئەمنی پیر و گۆچانبەدەست لە پێشی ڕاوەستام و «ئیحزارییە»کەم دایە و کوتی: فەرموو دانیشە. لە دوایە کوتی: ئەو ئاغایە کـە لەگەڵتە بچێتە دەرێ. عەبدوسسەلام بێ هیچ قـسەیەک چـووەدەرێ. ئـەوەم زۆر پێناخۆش بوو. کوتم: جەنابی قازی ئەو ئاغایە یەکێکە لە وابەستەگان و غەیرە نیە. چون وەزعی بەدەنی من چـاک نیـە، لـە ڕۆیـشتن و هەسـتان و دانیشتن چاوەدێریم دەکا. قازی برێک لە سەروسیمام فکری و لەو دەمـەشدا گۆچانەکـەم کە هەڵپەساردبوو، بەربۆوە عەرزی و تەقـەی هـات. قـازی بۆخـۆی هەسـتا و گۆچانەکەی داوە دەستم و کوتی: ببەخشە، ئەغلەب ئەوانـەی دادگـای ئینقلاب

ئیحزاریان دەکا، هێندێک دەلاڵ و «کارچاقکن» لە دەرەوە بەو نێوە کە ئێمە کارەکەت بۆ ڕێکدەخەین، بەرتیلیان لێوەردەگرن. پێم وابوو ئەو هاوڕێیەی ئەتۆی پیرەپیاو، لەو تیپ و قوماشەیە. کوتم: جەنابی قازی، بەپێچەوانەی ئیشەکە ئەو ئاغایە لە بنەماڵەی «شێخولئیسلامی» بانەیە و لە بنەماڵەیەکی ئایینی و خۆشناوی ناوچەی کوردەوارین و لێرەش تووشی هاتم و کوتی نەوەک زامنێک یان ناسیاوێکیان لێت بوێ با ئەمن بێم، دەنا بۆخۆم هاوولاتییەکی ئایینیم لەگەڵ خۆم هێناوە کە لە سالۆنی خوارێ ئەویان گێڕاوە.

قازی کە زانی هاوڕێکانی من لەو تیپ و قوماشە نین، کوتی: ئەگەر وایە با شێخولئیسلامی بانگ بکەمەوە ژوورێ. دەرکی وەتاغەکەی کردەوە و بانگی کرد: ئاغای شێخولئیسلامی فەرموو وەرە ژوورێ. ڕەئیس داوای لێبووردنی کرد و کوتی: فەرموو دانیشە. ئەویش لە لای منەوە دانیشت. بەڵگەیەکی کە دادگا ویستبووی دامێ و کوتم: جەنابی قازی، بێگوناهـ و بێتاوان زۆریان ئەزیەت کردووم. کوتی: ئاغای نووری، دادگا چەند جار ئەتۆی ویستووە و نەهاتووی؟ کوتم: ئاغای ڕەئیس، لە ڕۆژەکانی سەرەتای ئینقلاب، تاوانبار و بێگوناهانیان بە تێلایەکی لێدەخوڕی، نەمدەوێرا خۆم ئاشکرا بکەم هەتا بێتاوانی خۆم ڕوون بکەمەوە. ئێستا ئەوە هاتووم و بەڵگەی پێناس و بێتاوانی خۆم هێناوەتە خزمەتت. ئەتۆ یان باوەڕت پێیانە، یان نا. کە باوەڕیان پێبکەی دەزانم بێدەردەسەر ئازادم و دەڕۆم، کە باوەڕیان پێنەکەی، پرسیاری ناوچەیی لە بیستوچوار سەعاتدا جوابی پێویست دەداتەوە. چون لەو چەند ساڵەدا کە لە ئینقلاب تێپەڕ بووە، هەموو کەس لە مەڵبەندی خۆیدا ناسراوە، ئیدی پێویستی بە چلۆنیەتی ڕابردوو نەماوە. لە کاتێکدا ئەمن ئەو قسانەم دەکرد، قازی تەماشای ئەو پەروەندەی دەکرد کە لە پێشی بوو و بەرگەکانی بە دووی یەکدا هەڵدەداوە. ئەمن لەگەڵ بەرگەکانی داواکراو، شەرحی حاڵی خۆم نووسیبوو و پێویستی بە پرسیاری دووبارە نەدەکرد. لە پاش ڕوانینی هەموو بەرگە نووسراوەکان، سەری هەڵێنا و تەماشایەکی کردین و کوتی: ئاغای شێخولئیسلامی، لام وایە هەموو ئینقلابێک وابووبێ کە حەق و ناحەق هاتبێتە پێشێ. بە گەواهی مەئموورەکانی ناوچەیی، ئینسانێکە دوورە لە قوسوور و تاوان، ئەمن نەزەری بەرائەتی خۆم لەسەر پەروەندەی ئەو برایە دەنووسم و

دەزانم دارایی ئەو ئینسانە سەدهەزار تمەنە و لە بانکدا لێیان ڕاگرتووە، بە ڕای من دەبێ ئەو پووڵە ئازاد کرێ و وەریگرێتەوە. ئەوەش پەیوەندی بە شوعبەی ۱۱ی زیندانی «ئەوین»ی «دادسەرای ئومووری ئیقتیسادی»یە. ئاغای نووری، ئەتۆ لە نەزەر منەوە هیچ جۆرە تاوانێکت نیە و ئازادی بچییەوە نێو ماڵ و منداڵی خۆت و چاوەڕوانی «ئیحزارییە»ی شوعبەی ۱۱ی ئەوین بە. ئاغایان دەتوانن تەشریف بەرن. ئەوەی گوت و هەستا سەرپێ و زۆر بەڕێزەوە بەڕێی کردین. هاتبوومە دەرێ باوەڕم نەدەکرد. هاتینە خوارێ. ئاغای «بیادار» دانیشتبوو کە ئێمەی دی لە خۆشیان گەشکە بوو. لە دەروازە نامەی عوبوورمان نیشاندا و هاتینەدەرێ. کوتم: خودایە دەکرێ بەهەشت و جەهەننەم لە دنیا نیشان بدەی، دەکرێ فریشتە و ئەهریمەن بەڕواڵەت وەدیبێنی! خودایە گیان چ دەبوو ئەهریمەنێکی وەک «خەڵخاڵی» لە سیمای فریشتەیەکی وەک ئەم «قازی»یەدا وەدیبێنی هەتا تاوانبار و بێگوناهان لە پێی حیسابی ئەهریمەنی «خەڵخاڵی»دا وەک یەک بەراوەرد نەکرابان؟

لەو بیرانەدا بووم و ئاگام لە خۆم نەمابوو کە تاکسی لە پێش هۆتێلەکەمان ڕاگرت. «شێخولئیسلامی» ویستی بڕوا، کوتم کاک عەبدوسسەلام تازە کاری ئەم پێشنیوەڕۆیەت لێتێکچووە، دەچینە ڕێستوورانی هۆتێل و کاوێژ لەو نیعمەتە دەکەم کە ئەوڕۆ لە داوێنی ئەم دوو مەلایەدا وەدەستم کەوتووە. چووین دانیشتین و هەتا پاش نەهار لە ڕەوشتی حیسابانەی ئەو «قازی»یە دواین و باسمان لەسەر کرد. لە دوایە زۆرم سپاسی ئاغای شێخولئیسلامی کرد و بە بارێک منەتەوە بەڕێم کرد و ڕۆیی. بەداخەوە کاک عەبدوسسەلام بەهرەی لە ژیانی هەڕەتی پیاوەتی خۆی وەرنەگرت و بە نەخۆشی سەرەتانی «کەبەد» گیانی ئەسپارد و داغی ئەبەدی لە دڵ و دەروونی بنەماڵەی شێخولئیسلامی وەکوو بیرەوەرییەکی تاڵ هێشتەوە؛ گیانی شادبێ.

دوای چەند ڕۆژێک دیداری دۆستان و ئاشنایان لە تاران، لەگەڵ ڕەوانشاد «مەلامحەممەدی بیادار» گەڕاینەوە بۆکان کە بەداخەوە ئاغای «بیادار»یش دۆستی دێرینە و وەفاداری ڕۆژگاری خۆشی و ناخۆشیم، لە تەمەنی ٥٠ساڵیدا بە مەرگی خۆی بنەماڵە و ئاڵقەی دەرسی قوتابییەکانی ئایینی داغدار و بەربڵاو کرد. گیانی پاکی بە بەهەشتی بەرین شادبێ.

## چاوەڕوانی «ئیحزارییە»ی شوعبەی ١١ی

### دادگای ئیقتیسادی زیندانی ئەوین

چاوەڕێ مابوومەوە داخوا گەنگێ دادگای زیندانی ئەوین بە کاری من ڕادەگا و ئەو برەپووڵەم کە لە بانکی سادراتی تاران ڕاگیرکراوە، بۆم ئازاد دەکەن و فریای ژیان و بەڕێوەچوونی ڕۆژگاری بێداهاتی من دەکەوێ!

خێزانی زۆر و داهاتی کەم، هەڵاتهەلات و کوناوکون ڕایەڵوپۆی ژیانی تێکدابووم. ڕیکەوتی ١٣٦٨/٨/٢٨ بەرگی «ئیحزارییە»ی دادگای زیندانی «ئەوین»م پێگەیشت کە خۆم بە شوعبەی ناوبراو بناسێنم. پاش چوار ساڵ لە بیرم چووبۆوە کە ئەوە پاشماوەی شوعبەی ٤٨ی دادگای ئینقلابە، کە تازە گەیشتۆتە پێراگەیشتن. ترس دایگرتم، زیندانی ئەوین چ کارێکی بە منە؟ ئەمن دەبێ کام چەرمەسەریم لە پێدا مابێ و دیسان چ گوڵمەزێک ماوە بە منی بگێڕن؟ ناچاربووم کاتی دیاریکراو بچم بۆ تاران و خۆم بە شوعبەی ١١ی زیندان بناسێنم.

دیسان ئایەتەلکورسی و دیسان «فالله خیراً حافظا و هو ارحم‌الراحمین» و سەدان حیرز و دۆعای دەفعی شەڕ و فووکردن بە دەوری شانوملمدا.

چوومە وەتاغی قازی دادگا. بەرگی ئیحزارییەکەم لە پێشی دانا و کوتم: ئەمن محەممەدی نووریم. قازی باوەشێک پەروەندەی هێنادەرێ، وا دیار بوو ڕابردووی من لە دادگای مەهاباد و محاکمەی پاسدارانی بۆکان و نەتیجەی داوەری شوعبەی ٤٨ی دادگای ئینقلابی تاران و نامەکانی مامۆستایانی ئایینی و خەڵکی بۆکان و ناوچە کە بۆ ئاغای «مونتەزیری»یان نووسیبوو و نامەی ئاغای مونتەزیری بۆ ئاغای «هادی هیدایەتی» ڕەئیسی دادگای ئینقلابی ئیسلامی ئێران کۆڵەبارێک بەرهەمی هەمووانی تێدابوو.

لە دیتنی ئەو پەروەندە سەنگینە هاتمە سەر ئەو باوەڕە کە حکوومەتی ترسەنۆک لە سێبەری خۆی دەسڵەمێتەوە و بۆ بەقا و مانەوەی خۆی کاروبارەکەی هێندە توند دەگرێ کە سەر لە بارەگای دیکتاتۆری و زەبروزەنگ دێنێتە دەرێ. کاربەدەستانی ئەو جۆرە حکوومەتانە بریتین لە کەسانێکی شەڕەنگێز و شەڕلاتان و بێکار کە چەک و چەقۆیان کردۆتە هۆی خۆپارێزی و

حکوومەتڕاگرتن. لە ترسی پاشەڕۆژی خۆیان دەگەنە ڕادەیەک کە بێتاوانەکان زیندانی و ئەشکەنجە دەکەن و بە بگرەوبەردە تووشی هەلاتهەلات و خۆشارەوەکێنیان دەکەن و وایان بەسەر دێنن لە ترسی زۆرداران سەر بە هەموو کونوکاژێرێکدا بکەن.

ئەو ڕێبەرە زۆردار و سەففاکانە کە خولی ڕۆژگار چارەنووس و موقەددەری گەل و کۆمەڵیان داوێتە ئەستۆ، بە بێ سەرنجدان بە ئاسوودەیی کۆمەڵ، بۆ مانەوە و ڕاوەستانی خۆیان، کەلک لە کەسانێک وەردەگرن کە هەستی ئینسانی و بەزە و لێبووردنیان لە سروشتیدا نەبێ. دەڵێن «میرەکوێرە»ی «ڕەواندز» پیاوێکی زۆر خۆویست بووە و بۆ پێشکاری فەرمانەکانی خۆی هەمیشە کۆلکەمەلایەکی دەکردە سەرکار و کارڕاپەڕێنی خۆی. لێیانپرسی ئەتۆ بۆچی هەر مەلا دەکەیە کاربەدەست و خاوەنفەرمان؟ میر کوتی: ئەو تیپ و توێژە ئەگەر کاریان پێبسپێری، لە هەموو کەس بێئینسافترن و دەسەر کەسەوە ناچن.

«ناسرەددینشا» لاسای «میرەکوێرە»ی کردەوە. لەگەڵ «ئایەتوڵلا نووری» کلکیان تێکهالاند. خەڵک داوای «مەشرووتە»یان دەکرد، ئایەتوڵلا دەیگوت: نانا «مەشرووتە» نا، بڵێن «مەشرووعە»مان دەوێ، هەتا ئێران هەر لەسەر بارودۆخی خۆی بگەڕێ و بسووڕێ. «ئایەتوڵلا سەبزەواری» دەڵێ: زانایان لەسەر مەسەلەی «جەبر» و «ئیختیار» لەخۆڕا کێشە دەکەن، نە جەبری تەواو و نە ئیختیاری تەواو، بەڵکوو «الامر بین‌الامرین». زانایانی ئەم دەورە، مەسەلەکەیان کردە «بین‌الامرین» و لەسەری سازاون، یانی نە «مەشرووتە» و نە «مەشرووعە»، بەڵکوو «بین‌الامرین» بێ ئەویش «مەرجووعە» بێ. لەو کاتەوە شێوازی حکوومەتی ئێرانزەوی بۆتە «مەرجووعە» و «ئەوامیر و نەواهی مەرجووعە». بە ئەوامیری «مەراجیعی عیزام و ئایاتی کیرام» حەلوفەسڵ دەکرێ.

با بگەڕێمەوە سەر باسەکەی خۆم:

لێم ببوورن، دەڵێن وتە، وتە دێنێ، بڕێک لە درێژەی باسەکەم کلا بووم.

بەرپرسی شوعبەی ١١ی ئومووری ئیقتیسادی زیندانی ئەوین، شوعبەی پێڕاگەیشتن بە جەریمە و دارایی ئەو نوێنەرانە بوو کە مەشموولی دانەوەی حقووقی نوێنەری بوون کە لە مەجلیس وەریانگرتبوو یان مەشموولی

دەس‌پێ‌داگرتنی ماڵ و دارایی کرابوون و یان ئەوانـەی هـەڵاتبوون بـۆ دەرەوەی وڵات یان ئیعدام کرابوون و یان لە زیندان‌دا بوون.

ئەمن لـەو نوێنەرانـە بـووم، مووچەیـەکی وەرمگرتبـوو زیـاتری خـەرج و هەزینەیەک بوو کە لە حیسابداری مانگانەی مەجلیس‌دا لێیان‌گێڕابوومـەوە. لام وابوو پەروەندەی من دوایین پەروەندەیەک بووبێ کە لە نێو نوێنەرانی مەجلیس پێی‌رادەگەیشتن.

شتێک نەمابوو کە بەرپرس پرسیاری لێ بکا و جوابەکەی لەسەر پەروەندەکە نەبێ. ڕیزی دارایی و داهاتی ساڵانە ژمارەی خاوخێزان و پێشینەی کارم هەمووی لە پەروەندەدا ڕواڵەت درابوو، لە پێشینەکەم‌دا نووسرابوو.

ئاغای بەرپرس کوتی: ئاغای محەممەدی نـووری، پەروەنـدەی تـۆ دەورەی پێداچوونەوەی تەواو بووە، ئەتۆ دەتوانی بچییە بانک و ئـەو پوولـەی لێیـان ڕاگیرکـردووی وەریگرییـەوە، دەسـتووری بـەرگیری لـە پـووڵ و سـەرمایەت هەڵوەشاوەتەوە و کارێکت لێرە نەماوە.

بە شوکرانەی زۆرەوە هاتمە دەرێ. بە سەرسووڕماوی و ئەرێ بـڵێی وابـێ و وانەبێ؟ سبەینێ چووم بۆ بانکی سادرات، شوعبەی مەیدانی ژاڵە. ڕەئیسی بانک کوتی: ئەو حیسابەی تۆ بەهرەی نیـە و سـوودی بـانکی بـۆ ئـەو سـەرمایەیە لەبـەرچاو نـەگیراوە. پێنـاس و سـەنەدی «سـپوردە»کـەت بێنـە دەتـوانی وەریگرییەوە. ئەمنیش ئەوانەم دایە و دەستووری حەواڵەی بۆ بـانکی سـادراتی بۆکان نووسی بەڵان بێ بەهرە و سوودی بانکی. دوای مانەوەی دوو ڕۆژ لە تاران و دیداری هێندێک لە دۆستان و ئاشنایانی قەدیمی هاتمەوە بۆکان.

لێرەدا نامهەوێ باسی ئەسیربوونی کوڕێکم «کەماڵی نـووری» بکـەم کـە بـە دەستی موجاهیدین لە شاڵاوی وان بۆ پادگانی «حاجی ئۆمـەران» و بەسـەرهاتی دوو ساڵ زیندانی‌بوونی لە ئێراق بێنمـە گـۆڕێ کـە دوای چەنـد سـاڵان لەگـەڵ دووهەزار ئەسیری دیکە ئازادکران و لە سنووری «خوسرەوی» درانەوە بە ئێـران. بەڵان کاتێک حکوومەت ئەو ئەسیرانەی وەرگرتەوە بێ‌سەروشوێنی کردن و دوای ١٩مانگ لە زیندانی ئەوین سەریان دەرێنا و ئازاد کران. ئەگەر ئەو بەسەرهاتەی بگێڕمەوە و وەردی دەمەوە بۆ خۆم و خوێنەران هۆی دەردەسەرە و دەڵێم:

«بە پایان آمد این دفتر    حکایت همچنان باقی»
لە کام چێژێکی شیرینە    زنەی ژەهراوەکەی ساقی

## لێکدانەوەی بەرهەمی ژیانە ژاناوییەکەی خۆم

**هەموو دەوری ژیانی من شەوێک بوو   شەوێکی پڕ لە مۆتە و دیمەنی دێو!**
**ئەوەی دیتم بە هاڵۆزی خەوێک بوو   تراوکێکبوو خزی و نەتکایە سەرلێو!**

ئەورۆ کە بیستوپێنج ساڵ لە ئینقلابی جمهووری ئیسلامی تێدەپەڕێ و تەمەنم بۆتە ۷۷ساڵ. بێبەشکراو لە هەموو مافێکی کۆمەڵایەتی. لارەمل بە بێدەنگی و دەمقووچاوی لە شاری بۆکان دانیشتووم. گۆشەگیر و کڕومات پاشماوەی ژیانی پڕ لە تاڵی و سوێری خۆم ڕادەبوێرم. ئاواڵ و هاونشینم تەنیا کتێبە و کتێب. یانی ئەوانەی بۆ هاودەمی و هاونشینی هەڵمبژاردوون، بەهەڵەمنابەن، لاڕێم ناکەن و دۆستی گیانین، ئەوانە چاوەڕوانی نەغدینە و نان و دەسخۆشانە نین و ڕێنوێنی شارەزای مەڵبەندی مان و هەرێمی نەمانن. لەگەڵ ئەدەبیات و عیرفان و مێژوو، نێوانمان خۆشە، پێیانەوە دەژیم. عیرفان ڕێیەکە کە خۆناسی و سەرکەوتنی گیان هان دەدا، بەر بە سەرەڕۆیی ژیان دەگرێ و لە باز و ڕێبازان ڕێنوێنە.

مێژوو ئەگەر بیژوو نەبێ، نیشانت دەدا ڕابردوو چۆن هاتوون و چۆن ڕۆیشتوون و چۆن فەوتاون و چۆن پێگەیشتوون. هەتڵە و هەڵەشەی تێشکاوەکان دەکاتە تەرازووی بەرجەوەندی نەتەوەی کات و تۆرەمەی داهاتوو.

شێعر و هۆنراوە سروودێکی یەزدانی و دەنگێکی نیانی ئاسمانییە ئەگەر ڕەوان بەرەو ڕێگای ڕوون تەکان بدا و گیان ببزوێنێ؛ دەنا ئەفسوونێکی ئەهریمەنییە ئەگەر زەین هەتڵە بکا و مافی گەل و کۆمەڵ بدۆڕێنێ.

جارجاریش لەگەڵ شێعر و هۆنراوە تێکەڵیم هەیە، لەتەک پاییزەخێڵی شێعر و بەهارەهەواری هۆنراوە، گەرمێن و کوێستانم پێخۆشە. دیوان یان سیپارەیەکی چاپکراوم نیە. وەک پێشتر ئاماژەم پێکردووە، لە دەورانی ڕژێمی شایەتیدا کە کوردینووسین و بە کوردیدوان باسیسەر بوو، ڕۆژێک لە

ماڵپشکنینی ژاندەرمەکان، دەفتەری شێعر و هۆنراوەکانم لەگەڵ وێنەی پێشەوای نەمر و باقی شەهیدەکانی لە سێدارەدراو و هاوڕێ و هاوڕازەکانی دیکەم بەداخەوە لە تەندوور خران و سووتان، هێندێکم هۆنراوە کە مابێ، بە دەستی ئەدەبدۆستانەوە دەیانبینمەوە. ناڵێم شاعیرم، بەڵان شێعر و هۆنراوەم خۆشدەوێ، زۆر کۆنەپەرەست نیم، بەڵان هێندەش باو و هەنگاوم بەرەو شێعری ئازاد یان شێعری سپی خۆش نیە و نامهەوێ لێرەدا لە بارەی شێواز و ڕێبازی ئەم دوو شوێنەوارە (کۆن و نوێ)یەوە بدوێم و جێگای ئەم باسەش لێرەدا نیە. چون هەوا و نەوایەکی پاراوی دەوێ و ڕۆژی بەتین و ڕووناک؛ بەڵام ڕۆژگاری ئێستا و حاڵوباڵی من، گەلێک بێهێزترە لە زەردەی ڕۆژپەڕی مانگی خەزەڵوەر. بەڵان دەڵێم شێعر لە قالبی دارڕژاوی خۆیدا هونەرێکی ورد و تایبەتە وەک زانستەکانی دیکە. زانستەکان هەرکامیان لە قالبی ناسراو و دارڕژاوی خۆیاندا دێنە گۆڕێ. شێعر و هۆنراوەش هەر وایە، ئەگەر لەسەر بارودۆخی ناسراوی خۆیدا چیمکی دارڕژاوی خۆی نوێ بکەیەوە و ڕەنگ و ڕووکاری تازەی لە قالب و مانادا بدەیەوە، ئەوە جوان و لەبەردڵانە و کۆنیش دەزانێ، نوێ دەڵێ چی. بەڵان ئەگەر لە سەر ڕەسمە و گرێژەنە لاچوو و وەک چەپەری نامیزان لە سەر پاژنەی خۆی ترازا و بوو بە دەونەئاشی هەرکی و زازا، ئەوە پێی دەڵێن شێعری ئازاد یان سپی، وەک بە قولەڕەش دەڵێن خواجە کافوور!

****

وەک پێشتر باسم کرد لە دوای سەرکەوتنی ئینقلابی جمهووری ئیسلامی بە سەر ڕژێمی شایەتی، لە مانگی ڕەشەمەی ساڵی ١٣٥٧ کە هاتمەوە بۆکان، ئەوەی مەسلەحەتی پاشەڕۆکی ژیانم بوو، خوا بۆی پێک هێنام، یانی ئیدی بێدەنگی، گۆشەگیری، خەڵوەت. لە ڕووی خەڵکی ناباب و نادیار، دەرکەم لە خۆم پێوەدا و کوتم:

دان و داوە ئاوەدانی و چۆڵپەرەستیم خۆشترە
خێڵی جندۆکە لە فێڵی دۆستی قەستیم خۆشترە
تا وتەی زارم لەگەڵ ڕازی دەروون هاوڕێ نەبێ
هەر کپی و ماتی و کڕیم، بێ هەستوخوستیم خۆشترە

پـێڕکـەی ئـاوات نـەپێوی، دەس بـە هیـوا ڕانـەگا!
پـەل بـڕاو و دەس شـکاو بـێ پـێ و دەسـتیم خۆشـترە
ئەمپەرەستی و ئەونەویـستی، هـەر دەمێکـی ڕووگەیـەک
خۆم لەبەرچی پێ دزێـو بـێ، خۆپەرەسـتیم خۆشـترە؟!
چـون گونـاهی تێگەیـشتن بۆتـە داوی زینـدەگیم
کـردەوەی گێـژ و خـولان و شـێت و مەسـتیم خۆشـترە

دیتم زمان و زەمان، نە لێکدێن و نە پێکدێن، ئـەوەی هەسـتی دەروونـە و پێویستی زمانە، پێخوستی زەمان و پێشێلی دەورانە.

کاتێک دەبینم و دەڕوانم:

زەمانــە هــەردەمێ ڕەنگــێ دەڕێـژێ   ئەوەندەی مەینەتە بە منی دەچێـژێ
هومێـدێکی لــە ژینـا پێـکنـەهێنام   هەزار هیـوام بـە ڕۆژێکـی دەنێـژێ

گوتم وا باشە پەنا بەرمە بەر بارەگای کتێب و بیانکەمـە هـاوڕێ و هـاوڕازی خۆم. دۆستانێکن لە خۆم بێدەنگتر، بەڵان دەروون پڕ لـە هەرا و هاوار. بە دیمەن بێدەنگ و خامۆش، بەڵان نێوئاخنیان تۆفانە و جـۆش و خـرۆش. بـە هـەموو سووچ و سوقاقی کۆن و نوێی زەمانەدا دەمگێڕن، دیار و نادیار و یـار و نـەیارم دەخەنە بەرچاو و داوێنە زەینمەوە. بێدرۆ و دووڕوویی یـاری غـار و دۆسـتانی بێعەیب و عار.

ســـیپارەی شـــڕی بەشـــەر   لـــە دەورانی کـــۆن و نـــوێ
بـــیر و زانـــست و هونـــەر   بـــە شـــیرازەی ئـــەو ئـــەدوێ

هــــەنگی گوڵاڵــــە و چــلووک   هەڵاڵــــەی ژیــــان دەچێـــژێ
بــــەهرەزۆری ئــــەرکســــووک   شــیرەی لـــە گیـــان دەڕێـــژێ

ئەوە لە تەمەنی ٧٧ساڵیدا، کاتێـک دەڕوانمـە سـاڵانی ڕابـردوو، سـەرنج دەدەمە کردەوەی پڕ لـە هەوراز و نشێوی خۆم؛ هەستی پەشیوانی و نەدامـەت لـە عومری تێپەڕیوی خۆم ناکەم؛ ئەوەی لە ژیانمدا بـە گـرینگم دەزانی و لـە سـەر

لووتکەی ئاواتەکانم دامەزرابوو. نیشتمان و نەتەوە و گەل بوو، لەو ڕێگایەشدا بە هیچ باو و بۆرانێکی نەتەزیم و نەبەزیم و نەگۆڕام. لە هیچ تۆپ و تەشەری دەوران و هەڕەشەوگوڕەشەی زەمان نەلەرزیم و نەبەزیم و نەدۆڕام؛ شەشبەندی سوێنداوی و قەسەماوی کۆمەڵەی (ژ.ک)، ئەرکی سەر شانم بوو کە لە هەموو هەڵکەوتە جۆراوجۆرەکانی زەماندا، لە ئەستۆی خۆمم دانەڕنی؛ لەپێی ئارمانی پیرۆزی نەتەوە و گەلدا دەمگوت:

**هەچەندی ڕێی هومێدم بەستەڵەک بێ    غەمی دنیا لە سەر شانم کەڵەک بێ**
**دەبێ هەنگاوی هیوام توندوتیژ کەم    ڕەقیب با هەر لە دووم بکشێ، یەدەک بێ**

دوایین ئاواتم ئەوەیە: وەک هاوڕاز و هاوسەنگەرە نەمرەکانم، «هەژار»، «هێمن»، «ئاوات»، «سوارە» و هاوڕێیانێکی کە لە مەودای ژیان و ئاڵوگۆڕی دەوراندا، نەلەرزین و نەبەزین و هەروەها لەو ڕێبازەدا دوایین هەنگاوی خۆیان بەرەو دنیای بێدەنگی و حەسانەوە هاویشت و تێکشان و ئەمنی بەجێماوی لە یاران هەڵبڕاو:

**لە سەر بستووی ژیان وەک داری چاکی    بەتەنیا ماموە بێبەرگ و بێبەر**
**گەلێ بێتینترە تاوی هومێدم    لە زەردەی ڕۆژپەڕی مانگی خەزەڵوەر**

ئەوان بەڕواڵەت مردن! بەڵان بە شوێنەوار لە دڵی گەل و نەتەوەدا ژیانەوە، دیارە: «نامرن ئەوانە وا لە دڵی میللەتا دەژین»! ئاواتمە ئەمنیش بە ڕووسووری سەر بنێمەوە، بە شوێنەواری پڕ لە ئاسەواری واندا، بگەڕێمەوە.

ئاواتێکی کە دڵم خۆشکا و ژیانم وەجۆش خا، نەمدی و نەیگەیشتمێ؛ هەتا بە دوای هیوا و هومێداندا، هێزێکم بوو و لە تین و تەمەندا پێزێکم بوو، نەمدی، ئێستا کە نە هێز ماوە و نە پێز، نە ڕێزی کاتی جحێڵی و جەوانی، دەڵێم:

**کاتی جەوانی وەک بڵقی سەرئاو    سەرێکی سووراو قووتی دا گێژاو**
**بەو دڵی سڵی نەحەجمیو ساتێ    بەحاڵ دەتەپێ، دەبزوێ تاوتاو**
**ڕیزی بەرێزی مرواری ددان    چەپوچیر کەوتوون، تەکوتوو بڵاو**

دەنگ تەکایەوە لە گوێچکە بەهەست — لە دیمەن تۆڕا دیدەی دوورەچاو
خاو و خلیسکە شەقاوی بێهێز — شلوشەوێقی ڕێی گۆڕە هەنگاو
هۆش و بیروڕام تووڕە و تۆراون — هەر چەنە و چۆکم لێک دەکەن سلاو
تالانوبڕۆی هەستوخوستانە — لە کاولی لەشا هەر گیانە جێماو
هەر گیانم ماوە پاشماوەی تالان — هەربینا هاتن بۆویش بە سەرڕاو

لەمەولاوە، بەو حالوبالەوە چی ماوە؟ چی بلێم؟ بەو تەمەن و ڕۆژگارە درێژەی ژیانەوە کێ ماوە بە دوای کێدا هەلێم؟ ئەوە تەرازنامەی سوود و زیانی گەڕان و سووڕانی ڕابردووم بەرجەوەند دەکەم، هەست بە قەرزوقۆلەی بێجێ و خۆفرۆشی لە ژیاندا ناکەم! باری سووک و ڕێگای نیزیک:

لە دەوری بالوپەڕم غوباری تەمەننام تەکاندووە
ئەرکم نەماوە، لە سەر بەرگی گولیش جێم دەبێتەوە
ویستم کە تاقی دیدە بڕازێنمەوە بە مانگی ڕووت
چبکەم شەدارە دەروون، بە زۆنگی دلم هەر دەزێتەوە
نێچیری برینداری تیری مەینەت و بێنالە هەر ژیام
ناسۆری زامی زەمانە، بەئێش و ژانە کە دەکولێتەوە
بێوەی نیە کە هەلوەدای هەردە، تەرەی زەرد و بەردە دل
ڕاوگەی نەیارە هەردی هەرێم، کوانێ دێتەوە؟!

دیسان ئاواتەخوازم دوایین هەناسەی ژیانم، وەک هاوڕازە بەرێزە لە خاکخزیوەکان، بە سەرفەرازی و لەخۆبردوویی لە حاستی گەل و نیشتمان، لە کەلەوای بەدەنی بێوەرارم، بێتە دەرێ و بچێتە سەرێ.

کاکەگیان

مەبەستم زۆرە، حەزم لە دووانە — سەد گرێوکۆلم لە سەر زووانە
هەزاران وتە و مەبەست و پرسیار — دەتکێتە دەروون وەک ڕێژنەی بەهار

شــەپۆلان دەدەن، بــێ ســەررێژ مــاون پــاکی چــاوەڕێی چۆرچــۆڕەی چــاون
نــە زمانــێ دەگــرن، نــە دەخزێنــە زار لەگــەڵ فرمێـسکان هەڵـدەڕژێنە خــوار
هــەدەر بــوو هیــوای هــەرێمی ژیــانم هەر بــەو تاوانــەی بێچــووی کــوردانم

بە پێویستی دەزانم ئەو خاڵەش لە ژیانی خۆمدا ڕوون کەمەوە کە ئەمن چوار کوڕ و سێ کچم هەیە. لە حاستی ئەولادەکانم خۆم بە بابێکی بەرهەمدار نـازانم؛ چون لە ژیانی کۆمەڵایەتی خۆمدا بە قـازانجی ژیـانی تەسـەلی و بـەڕێچوونی خاوخێزانەکەم، بەهرەگیریم نەکردووە؛ سوود و قازانجی گـەلم بەسـەر خێـری خۆم و داهاتووی خێزانەکەمدا بە پێویستتر زانیوە. لـە کـار و پیـشەی گرینگـی کۆمەڵایەتی خۆمدا، وەک: مامۆستای کوڕە ئاغاوات و جووجەڵەی دێهاتییەکان، ڕەئیسی «خانەی ئینساف»، «مودیرعامل»ی «شیرکەتی تەعاونی ڕووسـتایی»، ئەندامی «ئەنجومـەنی ویلایـەتی» و نوێنـەری «مەجلیـسی شـووڕای میللـی»، ویژدانم ڕێی نەدام لـەم هەڵـکەوتانە هـەنگاوێکی بـە سـوود و قـازانجی خـۆم هەڵێنمەوە، یان زیانی کۆمەڵ بکەمە پاشکەوتی ئەو سوودە. لە ڕێی کشتوکاڵ و زەراعەتەوە بژیوی خۆم و خێزانم پێکدێنا. دوور لـە قـازانجی نەتەوەیـەکی لـە نێویاندا دەژیام، سەرم لە پێش بارگای نەتـەوی دانەنەوانـد، دەسـتی داوا و تەمەننام بۆ لای دامودەزگای حکوومەتی درێژ نەکرد و وەک هێندێکان تەشیڕێسی بارگای زۆرداران و زۆرکاران نەبووم؛ بە خۆم هەڵدەگوت و دەمگوت:

نــەیار بمکاتــە ســالاری ســوپای خــۆی هەڵـمبوێرێ لــە یــاران هــەر ئەسـیرم
گــەدایی دەرکــوبــانی خێــلی خــۆم بم لە لام ئــەو کاتەیــە، پـێم وایــە مـیرم
دڵــم هــــەر ئــۆگــری شــاخ و وڵاتــە هــەوای هێلانــەیە، لـەم هەردە گیرم

زۆر کەسانم دەدی ساتوسەودا بــە ئــاوات و ئامــانجی میللــی و نەوتــەوەی خۆیان دەکەن، کەوایان هەڵدەگێڕنەوە، ڕواڵــەتیان ئــاوەژوو دەکەنــەوە و لــە بنڕێسمەی نەیاران، نانی بەنرخی ئابڕوویان دەستێنن. قەڵەمگێـڕی نەتــەوی و قەدەمخێری زۆرکارانن! ئەوە دەبێ، بەڵان کوانێ وا دەبێ؟!

دەبێ یاران تەرەی دیداری خــۆتکــەی قەدەمڕەنجەی نەیاران زێڕوەشان بێ

بەڵان کوانێ دەشێ هەر ڕۆژە ڕەنگێک، بگۆڕی و هەر ئەوەت پێناسی مان بێ؟
بەڵان کوانێ دەشێ زگ‌گورگی سەرمەڕ بەزی هۆزت، مەزەی چێژی ددان بێ؟!
دەڵێم شەرتە هەتا نووری هەبێ ڕۆژ دەبێ کۆڵکێشی کۆڕم ئەرکی شان بێ

بەداخەوە پێداویستی ژیان و چلۆنیەتی هەڵکەوتی زەمان و مەکان، بیر و باوەڕی نەتەوەپەرستی وەها خنکاندووە، پیاوی دەوێ تاسە و ئامانجی میللی، هۆنەرە لەخۆبردووەکان و بەئاواتەوەمردووەکانی وەک: «هەژار»، «هێمن»، «ئاوات»، «خاڵەمین» و «سەیفولقوزات»ی کوێرنەکاتەوە و وەک دزی ناشی سەر لە کادێنێ وەدەرنەنێ!

دوایین ئاواتمە و لە خوای بەرز و بێهاوتا داوا دەکەم کە ئەمنی تەنیا ڕێبواری لە کاروانی یاران بەجێماو، هەتا دوایین هەناسەی ژیان، نەگۆڕێم و نەدۆڕێم.باشترە لەوە زیاتر سەرتان قاڵ نەکەم و حاڵتان تاڵ نەکەم. بە واتەی مەولانای ڕۆمی، عارف و زانای ڕووناک‌دڵ، دوایی بە باسەکەم بێنم کە دەڵێ:

فرصتی خوش باید و عمری دراز تا بگویم حال خود یک شمه باز
چون به پایان می‌نیاید این سخن می‌نهم مهر خموشی بر دهن

یان دەڵێ:

هرکه او از همزبانی شد جدا بی‌نوا شد گرچه دارد صد نوا
هرکسی کو دور ماند از اصل خویش بازجوید روزگار وصل خویش
چونکه گل رفت و گلستان درگذشت نشنوی زان پس ز بلبل سرگذشت

دوایین وتارم ئەوەیە و دەڵێم:

بژین ئەو کەسانەی ئینسانی دەژین و لە ڕێی گەل و کۆمەڵدا دەمرن. ئاوەدان و گەشاوەبێ نیشتمان. سەرکەوتووبێ نەتەوەی کوردی ئاریاییی‌نەژاد.

ڕۆژی چوارشەممە ١٣٨٣/٩/١٨ی هەتاوی

بۆکان: محەممەدی نووری

# پێرست

# پێشەکی

## بە ناوی خودای ژیانبەخش و گیانئەستێن

بەشێک لە هۆنراوە و هۆنەنامەکانم لە دەورانی کۆمەڵەی (ژ.ک)ەوە تا ساڵی ١٣٨٤ی هەتاوی.

دەمهەوێ لەپێشدا ئەم باسە شی بکەمەوە کە: ئەمنی ساڵـەها دەمقووچـاوی لێودرواو، لەمێژ بوو متەقم لە خۆم بڕیبوو، بەڵام کاک «حوسێنی موهتەدی» کـە بوو بە پردی پێوەندی من و دنیای دۆست و ئاشنا تازەکـانم، وای کـرد کـە بـۆ یەکەمجار کاک «سەلاحەددین ئاشتی» نووسەری توانـا، بـە نـاوی خـوازراوەی «شەماڵ» ، پێشەکی و شێعری «لەسەر بستووی ژیـان»ی کـردە دیـاری دەسـتی خۆی و لە «ئاویەر»ی ژمارە ٢٨، ڕێکەوتی ١٣٧٧/١/٢٩ی هـەتاویدا چـاپی کـرد. پاشان بە هۆی دنە و هاندانی کاک «ئەحمەدی قـازی» (سەرنووسـەری بـەڕێزی گۆواری سروە) بوو کە دەسـتم پێکـرد و هێنـدێک لـە پاشمـاوە پـرشوبـڵاو و نەفەوتاوەکانی هۆنراوەکانم کۆکردەوە و وەک شوانی گورگ لە مەڕیدراو، بـێ سەرکردنەوە، وەسەریەکم خستنەوە.

وەک لە سیپارەی بیرەوەرییـەکانمدا ئامـاژەم پێکـردووە، لـە دوای دەورانی پێشەوای نەمر «قازی محەممەد» و هاتنەوەی دەوڵەت بۆ مەهاباد و هەڵاتهەڵاتی شاعیر و هۆنەرەکان بـە کـەلێن و کـاژێراندا، بەداخـەوە دەفتـەر و دەسـتەکی هۆنراوە و یادکراوەکانی دەورەی کۆمەڵەی (ژ.ک)م لە تەندوور خران و سووتان.

بە کردەوەکۆشی ئەم ساڵانەی دوایی کە هێندێکیان بە دەست ئـەدەبدۆسـتانەوە مابوونـەوە و هێنـدێکیان لـە دەرەوە و لـە ڕووی ڕۆژنامـەی «کوردسـتان»ی ساڵەکانی ١٣٢٤ و ١٣٢٥ی هەتاویڕا هەڵگیرابوونەوە، وەدەسـتم کەوتنـەوە کـە لێرەدا بێ دیاریکردنی دروشمی کاتوساتیان دەیاننووسمەوە.

هەر وەکی کوتم، ساڵانی ساڵ لە گۆشەی بێدەنگی خۆم خزابووم و بەڕێز کاک «ئەحمەدی قازی»، بە نووسینی کورتەوتارێک، ڕواڵەتی هاتنەدەری لە گۆشەی تەنیایی و دنیای بێدەنگی پتر بۆ بەرین کردمەوە. ئەوانە و گەلێک لـە دۆسـتانی دڵسۆز پێنووسیان دامەوە دەستی هەتا ڕچە و ڕێبازی ئاواڵەکانی لەخاکخزیو و پـەڕەوازەکانی دوورەوڵات ون نەکـەم و هـەر ئـەو ڕێبـواری هەناسەسوار و ئاواتەخوازی هەمیشەیی خۆم بم.

جا ئـەوە ئێـوە و نووسـراوەکەی گـۆواری «سـروە»ی ژمـارە ١٥٨، مـانگی خەرمانانی ساڵی ١٣٧٨ی هەتاوی:

«لەسەربستووی ژیان وەک داری چاکی    بەتەنیا مامەوە بێبـەرگ و بـێبـەر
گـەلێ بـێتینتـرە تـاوی هومێـدم    لە زەردەی ڕۆژپەڕی مانگی خەزەڵوەر

دەگەڵ چەند نموونەیەکی دیکە کە هەر لەم بارستا و تەرازەدا بڵاو بوونـەوە، هەموو زانیمان شـاعیرێکی بەهەسـت و ناسـکخـەیاڵ لـەم مەڵـبەندەدا خـۆی لێشاردووینەوە و خەیاڵی هاتنەدەری لە گۆشەی مەیخانەی هەسـت و شـێعر و جوانی نیە و نایەوێ بێتە نێو بازاڕی کووتاڵ و شمەکی قەڵب و درۆ و دەلەسـەی ڕۆژگـار و گۆشـەی تـەنیایی خـۆی بـە کۆشـکی دەغەڵـبازان و دنیاپەرسـتان ناگۆڕێتەوە.

زۆر لەمێژ بوو «دیۆژێن»ی حەکیم بە ڕۆژی ڕووناک لە ئینـسان گـەڕابوو و نەیدیبۆوە، دەستی دە هەر کەلێنێک نابوو، مار پێـوەیدابـوو. ئـەویش ، وەک گەستەماران لە هەموو شت دەڕەوێتەوە و لە کاتێکدا بە جوستە لە نێو خەڵک و کۆمەڵدا بوو، بە ڕۆح و ئیحساس بە هەزاران فرسەنگ دوور کەوتبۆوە و بـەرەو دنیای دەروون و کتێب و کتێبخانە، کـۆچ و کۆچبـاری تێکنـابوو. لـە هـەواری تەنیایی خۆیدا، مێگەلی شێعر و هەڵبەستی دابەستە و قەڵەو دەکرد و خۆی لـە

دنیای چاووڕاو و سینگ ڕەپێشخستن و خۆجاڕدان و خۆهەڵکێشان و خۆویستی دزیبۆوە؛ تەنانەت جۆباری فرمێسکی بۆ دەربڕینی هەستی دەروون لە جێی کەلام و وشە دانا و فەرمووی:

| | |
|---|---|
| تامی دەچێ واتە کە دەیجووی بە زار | جوانە لە ڕێی دیدەوە بتکێتە خوار |
| بۆ وتە و هەستی دەروون چاوەڕێم | بەستەڵەکە گیانە هەرێمی وتار |
| تا نەتەوی پێ بە هەواڵان نەبا | هەر بە بزەی لێو و بە چاوانە کار |

بەڵام لەسەر هەموو دوورەپەرێزی و دەربازبوون لە جەنجاڵی دنیای ناتەبا و بێبەقادا، هەرگیز لە فکری ئینسان و گەل و نیشتمان غافڵ نەبووە و قسە و پەیامی هەمووی هاوارە لە دژی ناپاکی و جەور و جەفای زەمانە و زوڵم و چەوسانەوە. هەر ئەو پردی پەیوەندییەش بوو بە هۆی ئەوە کە ئێمە زەفەری پێبەرین و ڕێگەیەک بەرەو ئەو خەڵوەتە شاعیرانەیە بە چەنگ و نینۆک بکەینەوە و لە پاش چەندین ساڵ بێدەنگی، وەدەنگی بێنینەوە و بە قەولی «سەیفولقوزات»: «بیهێنینەوە نێو گەل و خزم و خۆیی».

«نووری» هاوچاخ و هاوتەمەنی «هێمن» و «هەژار» و «هێدی» و «ئاوات» و یەکێکە لە دوایین ڕێبوارانی شێوە و ڕێبازی شێعری موکریان، لەم ٦٠ساڵەی دواییدا. وەها کەسێک بە کۆڵەبارێک ئەزموون و بەسەرهاتی مێژوویی‌یەوە دەتوانێ دنیایەک قسەی پێبێ. ئەو کە بەرداشی زەمان نەیتوانیوە بیهاڕێ، خۆی لە زۆربەی ڕووداوە گرینگەکانی ئەم سەدەیە حزووری هەبووە و خۆی هەڵسووڕێنەر و خاوەنقەڵەم و قەریحە بووە و بێگومان دەتوانێ بە لێکدانەوە و گێڕانەوەی بەسەرهاتەکان ڕووناکی بخاتە زۆر کەلێن و قوژبنی تاریکی مێژووی ئەم سەردەمە. زمانی پاراوی و دەکارهێنانی گوڵواژەی ڕەسەن و زاڵبوون بە سەر زمانی مەڵبەندی «گەورکایەتی» و بۆکان و «محاڵ»دا، کاری نووری بۆ دەربڕینی هەستی دەروون و خەیاڵی ناسک و ڕاز و فەلسەفەی ژیان هاسان دەکاتەوە. ئەگەر کوردی موکریانی بە شێوە ڕاوێژێکی جوانی کوردی دابنێین، بێگومان ئەو بەشە دەکەوێتە نێوان «سەردەشت» و «بۆکان» و «میاندواو» و جوانترین شێوەی

ڕاوێژی بنزاراوەی «موکریان»ە و ئەم دیاردەیە لە ئاسەواری شاعیرانێکی وەک «سەیفولقوزات» و «میسباح» و «حەریق» و «هەژار» و «حەقیقی» و «نووری» و «هێدی» و «ئاوات» و ...دا، ڕەنگی داوەتەوە... .»

«سروە»

کاک «ئەحمەدی قازی» کە بۆخۆی لە شەپۆل و گێژاوی مەینەتی ئەم مەڵبەندەدا بلقی زۆر خواردبوو و تاڵی و سوێری و کەند و کۆسپی دڵتەزێنی بنەماڵەی خۆی زۆر چێشتبوو، هەستی نەتەوەویستی کە پاشماوە و میراتی گەلەکەی بوو هانی دەدا کە: هاوڕاز و هاوبازەکانی دەورەی کۆن بناسێنێتەوە و وەک بۆخۆی دەڵێ: «سەیف»گوتەنی «بیانهێنێتەوە نێو گەل و خزم و خۆیی.»

بەپێی ئەو بیر و بۆچوونە بوو کە بە شوێن هەنگاوی خۆشەویستاندا هات و ئەمنی ژیاندۆڕاوی خەلەوخەرمان سووتاوی هان دا، لە حاڵێکدا کە کەلوپەلێکم لە چەقوتەفی سەیر و سووڕی دەوران لە جانتادا نەمابوو؛ بەڵام دنەی خۆشەویستێکی ئاوایە کە پێنووسی داوەتە دەس ژیاندۆڕاوی دنیالێگۆڕاوی «نووری»، هەتا وەک خەونی هاڵۆز گورگەئاوڕێکی لە بەسەرهاتی خۆی و هێندێک لە هاوڕازەکانی بداتەوە کە: کێ هات و کێ ڕۆیی؟ کام بێگانە، کام خۆیی؟!

مەبەستی من لە نووسینەوەی هۆنراوە و هۆنەنامەکانم ناساندنی خۆم نیە؛ چونکە نەتەوەیەکی لە دەورانی ژیانی دووردرێژی خۆیدا هیچی بۆخۆی نەبووبێ، چۆن لە خۆی بدوێ؟ وە ئەگەر هەست و خوستێکی بووبێ بە وستێک پێخوست کراوە، کوا دەتوانێ شوێنەوارێکی بەبایەخ لە ژیانی خۆیدا وەدیبێنێ؟ ئەوانەش کە لە پیاوە بەنرخەکان و هۆنەرە دڵسۆزەکان بەجێماوە، هەمووی داخ و دەرد و کەسەرن! ئاواتی پێکنەهاتوو و هومێدی خەساربوو و بەفیرۆچووە!

ئەمن لە سەیر و سووڕ و ئاڵوگۆڕی ساڵەکانی دوای ۱۳۲۲ی هەتاویڕا لە ژیانی خۆم لەم ناوچە کوردنشینەی ئازەربایجانی ڕۆژئاوادا گەلێک ڕووداو و بەسەرهات و گۆڕانکاریم دیوە، ئەگەر لێرەدا ڕێگا و جێگای بایە بیاننووسمەوە، هەمووی جێگای سەرنج بوو بۆ نەتەوەی ئێستا و داهاتوو کە کێ هات و کێ ڕۆیی، چەند بێگانە و چەند خۆیی! ئەوەندەی مەودای ژیانم ماوە، ئەوانە لە

بیرەوەرییەکانمدا دەخەمە ڕوو. لێرەدا هەر دەمهەوێ بەشێک لە هۆنراوەکانم کـە وەک پاشماوەی تالآن بەجێماوە، یـان وەک خـەونی هالـۆز تێکـەڵوپێکەڵـن، وەسەریەکیان خەمەوە و بۆ بیرەوەری دووپاتیان بکەمەوە.

تکام ئەوەیە کەسانێکی دەروانننە هۆنراوە و هۆنەنامەکانم، هەڵکەوتی ژیانی من لە سەیر و سووڕی ڕۆژگاردا بهاوێنە بەر زەینی خۆیان. ویـست و مەبەسـتی من لە هۆنراوەدا تەنیا دەربڕینی هەسـتی نەتەوەویـستی بـووە و لـە درێژایـی تەمەن و لە هەموو هەلومەرجەکانی زەمان و مەکاندا هـاوڕاز و هاوبـازی ئـەو هەستە پاک و خاوێنە بووم و بە قەولی عەرەبان: «کل اناء یترشح بمافیه» و بـە واتەی خۆمان: گۆزە هەر ئەوەی دەدەڵێنێ کە تێیدایە.

سەربەرز و گەردنفراز بێ نەتەوەی کورد.

بۆکان سالی ١٣٨٤ی هەتاوی، محەممەدی نووری

## ڕوو لە دەرگای خودا

بــە نــاوی ئــەو کەســەی بــێ نــاوی پــاکی
مــــەلۆتکێک نەیـــدەدی داوێـــنی داکـــی
دەمــی قووچــاوی کۆرپــە و چــاوی پــڕ خــەو
بــــزەی تێناگـــەڕێ بــــێ ســـروەیی ئـــەو
تــــەک و تەنیایـــە، بـــێوێنـــە و شـــەریکە
لەگـــەڵ هـــەموان هەیـــە و لێیـــان تەریکـــە
ئـــەوی بـــەرز و بـــڵیندی و نـــزم و نەویـــە
چ ڕێـــکوپێـــک، چ ناڕێـــک پـــاکی بەویـــە
ژیـــانبـــەخش و گیـــانئەســـتێن ئـــەوە و بـــەس
کەســێ بــۆ بــێکەســان، ئیتــر ئــەوە و کــەس
لـــە تارمـــایی بـــەدەر کوانـــێ نیـــشانێک؟
کـــە لێـــڵی کـــرد ڕچـــە و ڕەوتی حیـــسانێک
بـــە زەیـــن کـــێ ڕادەگـــا پێـــی وابـــێ چـــۆنی
هـــەموو هاتووینـــەدی هـــەر تـــۆی کـــە کـــۆنی
گـــڵ و ئـــاو شـــین دەکـــەن میـــوە و گـــوڵ و گیـــا
بـــە ویـــن ئـــەو بـــۆن و ڕەنـــگ و تامـــە تـــەنیا

# خواگیان

هەچەندی دیمەنە ڕوانیم لە ژیندا
لە هەوراز و نشێوی ڕووی زەویندا
هەموو جوانن دەڵێم گیاندار و بێگیان
شەپۆلێکن لە نێو دەریای ئەویندا

خواگیان کوا ئەمن ترسم لە تۆیە؟
ئەگەر بمبێ، لە بێگانە و لە خۆیە
هەزار عەیبم هەبێ تێکڕای دەپۆشی
بەقەد کایەک کەچی لای خۆیە، کۆیە

## بۆ سەر کێلی مەزارم

پەنای هێنایە دەرکەت دەرکراوێک
بەیەکجاری نە بۆ پشوێک و تاوێک
درێژەی تار و پۆی هەودای ژیانی
هەڵیوێزنی زەمان بۆ بستەجاوێک

خواگیان باش ئەزانی هەستوخوستم
هەڵەی هەنگاوەکەم، ویستی دروستم
بەپێی نووسراوی پێنووسی ئەزەل بوو
ئەوەی زانیم، ئەوەی ڕوانیم و بیستم

لە گەردولوولی گێژاوی زەمان‌دا
لە خواروخێچی هەنگاوی ژیان‌دا
دڵ و مێشکم بەکام زانست پەرەی گرت
لە ویستی تۆ بەدەر کێ منی تەکان دا

## لە سەر بستووی ژیان

لە سەر بستووی ژیان هۆنراوەیەکە دەڕوانێتە ساڵە ڕەشەکانی ١٣٢٥ و ٢٦ی هەتاوی، یانی ئەو کاتەی زەبروزەنگی ڕژێمی شایەتی بە تاوانی کوردیگوتن و نووسین، تەفوچەقی خستە هەرێمی کوردستان و پیاوە بەڕێزەکانی شەهید کرد و لە سێدارەی دان و لاوە بەهێزەکانی پەرانپەران و ئاوارەی کێو و شاخەکانی وڵاتی کردن. «هەژار»ی بێهاوڕێ بە هەردێکدا و «هێمن»ی هەڵوەدا بە هەڵەمووت و زەردێکدا و ئەوانی دیکەش هەریەک بە ئاخ و داخێک بە شاخوداخێکەوە دەخولانەوە و دەگلانەوە، چونکە خوێنخوا، خانەخوێ بوو!

باوەشی شەوی تاریک جێی حەسانەوە و حەساری حاوانەوە بوو. زیتە و زریوەی ئەستێرەکانیش دەبوونە زیپکە و زیخی چاوی بە شەوارکەوتووەکان و بە دەوارە ڕەپێکەوتووەکان. ئەمنی بە تەنیا ماوە وەک «یەهوودا»ی سەرگەردان، لەو هەڵدێر بۆ ئەو گۆل و ئەستێر دەبوو خۆم ببوێرم و سێبەرم وەشێرم؛ شەقاوم شل دەبوو، هەنگاوم کول دەبوو، نە ڕۆژ دەبڕایەوە و نە شەو دەپسایەوە. ڕۆژانە لە بن شاخ و بەردێکدا و شەوانە لە نێو شیو و وەردێکدا دەکەوتم و دەخەوتم؛ بە نێوی ماجەراجوو و بێگانەپەرست و سەدان نێو و نیتکەی ناحەز، وەک سێبەر لە ڕووناکی دەڕەویمەوە و وەک دەسلێوەشاوێ لە سێبەری خۆم دەسڵەمیمەوە! لە خاک و نیشتمانی خۆمدا غەوارە بووم، دزێو و بەدقەوارە بووم، تەنیا شەوی تاریک و ڕێگای باریک هاوڕاز و دەمسازم بوو. شەوێ ئەستێرم دەبژارد و ڕۆژێ خۆم لە خۆم دەبوارد. لەو هەلومەرجەدا بوو «لە سەر بستووی ژیان» لە دنیای دەردئاژنی دەروونەوە هەڵقوڵی و لە دەراوی دیدەوە هەڵچۆڕا. لە یەکەم دیدارێکدا دوای هاتنەوە کە مامۆستا «هەژار»م دی، کوتی: «کاک نووری، زۆر جاران لە سەر دوندی چیاکان لەگەڵ «هێمن»، لە کاتی ڕۆژپەڕی ئێواراندا «لە سەر بستووی ژیان»ی تۆمان دەخوێندەوە. دوو جاران دەگریاین، جارێک بۆخۆمان و جارێک بۆ نیشتمان و دووروڵاتییەکەمان!»

لەو کاتەوە ئەمنی بە تەنیا ماوە چاوەکانم دوو جاران دەبارین، جارێک بۆ «هەژار»ی هێژا و جارێک بۆ «هێمن»ی هەرماو و دەڵێم: «هەژار»، «هێمن»، شوێنەواری ژیانتان ڕێبازی هەتا مانمە. جا ئەوە ئێوە و ئەوەش ئەو هۆنراوەیە:

## لە سەر بستووی ژیان

لە سەر بستووی ژیان وەک داری چاکی
بەتەنیا مامەوە بێبەرگ و بێبەر
گەلێک بێتینترە تاوی هومێدم
لە زەردەی ڕۆژپەڕی مانگی خەزەڵوەر

شەوی تاریک وەرە بکشێ بە سەرما
کە ئامێزت پەنای ڕۆژگارڕەشانە
وەکووژێنە چرای ئەستێرەکانت
کە ڕووزەردیم لەبەر تالیعگەشانە

لەگەڵ ڕۆژی هومێد نالێکە هیوام
وەکوو سێبەر لە ڕووناکی ڕەویوم
هەناسەی لێبڕا بای فێنکی ئاوات
بە کوورەی داغی حەسرەت داچزیوم

لە چۆڵ و بەردەڵانی قاقڕی ژین
لە پێ کەوتووم تەریک و دوورەدەستم
بەڵام دەنگێ وەکوو خەونێکی هاڵۆز
بە گوێی ڕوحما دەچرپێنێ کە هەستم

بە دەستەکوتە دەر و دیوار و قوژبن
هەتا ڕۆچنەی نەجات بستبست دەپێوم
بزانم تیشکی سەربەستی لە کوێڕا
دەدا شۆق و بزەی داوێتە لێوم

بڕۆ ئەی شەو، وەرە ئەی ڕۆژی هیوا
لە چاڵاوی بەڵای دیلیم دەرێنە
لە سەر قسنی فەنای ئاواتەکانم
پەڕۆی ئاڵای هومێدم ڕاوەشێنە

بەهاری ١٣٢٦

## له کویێ یادم که

کــه مــردم نــه‌ما شــوێن و ئاکــاری مــن
حه‌ســاوه زه‌مــان گــوێی لــه هــاواری مــن
دڵــی ناهومێــد و له‌شــی بــێ‌وه‌رار
بــه ساردی و سڕی که‌وتــه کۆشــی مــه‌زار
بــه یــادم نه‌کــه‌ی دیمــه‌نی ئــاو و گــوڵ
وه‌زه‌ینــت کــه‌وێ یــادی مــن بێنیــه دڵ
گوڵــی مــن کوڵــی دڵ بــوو فرمێــسکی چــاو
لــه دیــدمم ده‌ره‌خــسین نــه گوڵــزار و ئــاو
ئه‌وانــــه‌م لــــه‌وان پــــاک‌داوێنتــــرن
لــه ســروه‌ی بــه‌یان خــاس و خــاوێنترن
کــه دیتــت هــه‌تیوێکی کــوردی هــه‌ژار
که‌ســاس و کــز و بــێ نــه‌وا و په‌ســار
له هیوا و هومێـد بـێ‌بـه‌ش و بـه‌هره بـوو
لــه فرمێــسکی ڕوون کۆشــی پرقــه‌تره بــوو
بــه یــادم بــڕۆ و بیگــره بــاوه‌ش بــه‌تاو
لــه گۆنــه‌ی سـڕی پاکــه‌وه ئه‌شــک و ئــاو
من ئه‌و دانــه ئه‌شکه‌م لــه نێــو چــاوی ویم
گوڵــی ڕوومــه‌تی ســیس و ژاکــاوی ویم
هه‌ناســه‌ی ســڕی، ســۆزی گیــانی منــه
نیــــشانێکی ده‌وری ژیــــانی منــــه

ساڵی١٣٢٧

## تیری نیگا

بە کام تیری نیگایەک ئەنگاوم
دەپاڵێوێ دڵۆپەی خوێن هەناوم
لە ئامێزی غەمی دووریتی دەگرم
هەتا باوەش دەبا ئەژنۆی شکاوم
ئەوا ڕۆیین بە دووی یەکدا دڵ و دین
ئەمن لەو نێوەدا بێچارە، ماوم
دەبا بگری هەتا ماوە لە سەر دڵ!
زنەکێشی خەفەتپاڵێوی چاوم
لە هەورازی ژیان هێندەم ڕکێف خوارد
شەکەت کەوتم جدەو بووم و ساوام
لە پێچاڵی تەنین بۆ ڕایەڵوپۆ
مەکووکێکی خولی هەودا پساوم
لە مەزرای مەینەتا شین بووم لەخۆڕا
لە ئاخ و حەسرەت و ئەشکا ڕواوم
چ ڕێکوپێک بەبێ کورتی و درێژی
کراسێکم بە بەژنی غەم بڕاوم
بە ئاواتت دەژیم تا هەم لەگەڵ غەم
لە تانووتی ڕەقیب گورچووبڕاوم

سالی ١٣٣٨، ئاوایی عەمبار

## یا وەتەن یا مردنم

ئەو چوار هۆنراوەی کە بە دووی یەک‌دا دەیانخوێننەوە، لە کتێبی «شێعر و بەرهەڵستی و ڕاچەنین لە کوردستانی ئێران» لە نووسینی بەڕێز «مەحموود زامدار» کە وەزارەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنی ئێراق لە ڕووی ڕۆژنامە و گۆوارەکانی دەورانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران کۆی کردۆتەوە و لەم ئاخرییانەدا وەگیرم‌کەوت، ئەم چوار هۆنراوەی خۆمی تێدابوو. لام وابوو چوار گەنجینەم دیتۆتەوە، چونکە دەڕوانێتە دەورانێکی دوور و درێژ و ٦٠ساڵ لە مەوبەر و بیرەوەرییەکی هەرگیز فەرامۆش‌نەکراو. بەڕێز «مەحموود زامدار» ئاوا دەنووسێ: «لە ژمارەی ٣ی گۆواری کوردستان کە زمان‌حاڵی حیزبی دێموکراتی کوردستان بوو لە مەهابادی خوێنین‌دا و لە ساڵی لە مەهاباد دەردەچوو، شێعری «یا وەتەن یا مردنم»ی محەممەدی عەتری گلۆلانی ـ عەتری گلۆلانی ناوی نهێنیم بوو لە کۆمەڵەی (ژ.ک)دا ـ دەخوێنینەوە کە ئەڵێ:

## یا وەتەن یا مردنم

باری ئەستۆی دوژمنە وا هێسی کردۆ گەردنم
نامەوێ ئەو ژینە تاڵە یا وەتەن یا مردنم

ئەی وەتەن لەو وەختەوە ئەم ڕۆڵەیەت خستۆتە ڕۆ
شیری تۆ کەوتۆتە یاد و مێهری تۆی گرتۆتە خۆ
دڵ بە سازی تۆ بەکەیفە ڕوو بە خۆشی ڕوویی تۆ
پێم گوتی: دەبمە بەلاگەردانی تۆ بێ هیچ درۆ
وەختی ئیجرای قەولمە ئۆباڵ بە تەختی گەردنم
نامەوێ ئەو ژینە تاڵە یا وەتەن یا مردنم

دوژمنی بەدخوو ئەگەر تۆ بمدەیەی زێڕی وڵات
دار و بەرد و خاک و خۆڵم بۆ بکەیتە حاسڵات
بمکەیە سەرداری دنیا تاجی شاهیم کەی خەڵات
شەرتە تێیهەڵدمم لە تاجت بیگەیەنمە ڕۆژهەڵات
چۆن دەبێ مەحکوومی تۆ بم کەچ بکەم بۆت گەردنم
نامەوێ ئەو ژینە تاڵە یا وەتەن یا مردنم

لاوەکان گەر ڕوح فیداکەن بۆ وەتەن هێشتا کەمە
گەر بدا ئاوی حەیاتێ دوژمنت، ژەهرە، غەمە
خۆشە دەردێکی کە داکی نیشتمانی مەرهەمە
سینگەکەم قەڵغانی تۆیە ئەی وەتەن پێشمەرگەمە
ژیانی من قوربانی تۆ بێ جا بڵیندە گەردنم
نامەوێ ئەو ژینە تاڵە یا وەتەن یا مردنم

غەم مەخۆ داکی وەتەن تۆوی مرادت شین ئەکا
لاوی تۆ سەرخۆشە ئەورۆ پاکی داوای ژین ئەکا
داغی باڵای سەوزی تۆیە دوژمنت هەر شین ئەکا
تینی زوڵمی کۆنی تۆیە قەلبی من پڕ کین ئەکا
نامەوێ ژێردەستی دوژمن بێتە تۆقی گەردنم
نامەوێ ئەو ژینە تاڵە یا وەتەن یا مردنم

حازرم بۆ حیفزی ئاو و خاکەکەت ئەی نیشتمان
شەرتە بیڕێژم لە بەر پێت، خوێنی گەش ڕووحی ڕەوان
خوێنەکەم بۆ تۆ حەڵاڵە، ماڵیشم، هەردووکیان
یا دەبێ هیچیان نەبن یا دوژمنت هیچکامیان
دەچمە بەر مەیدانی دوژمن جا حەڵاڵ کە گەردنم
نامەوێ ئەو ژینە تاڵە یا وەتەن یا مردنم

ئەی وەتەن گەر ژین هەبێ، حەققە کە تۆ ژینی منی
نامەوێ سەیری گوڵستان تۆ کە پەرژینی منی
ئاورم بۆ هێزی دوژمن چونکە تۆ تینی منی
قیبلەکەم، ئیمانەکەم، پەیمانەکەم، دینی منی
گەر بوتی زیننار ئەبەستم ببیە خاچی گەردنم
نامەوێ ئەو ژینە تاڵە یا وەتەن یا مردنم

## سۆزی دەروون

دیسان «مەحموود زامدار» دەنووسێ:

«هەر لە یەکێک لە ژمارەکانی هەمان گۆواردا و لە هەمان ساڵدا، شێعرێکی بەرزی محەممەدی عەتری گلۆلانی بە ناوی «سۆزی دەروون» بلاو بۆتەوە و تێیا ئەڵێ:

## سۆزی دەروون

خەراجاتی دوو زولفی تۆ ئەرێ ماچینە یا چینە؟
دوو کوڵمەی گەش لە بن چیندا دەکا دیاری کە ماچینە
دڵم سەودایی هەرزەی کرد لە بێستوونی جەفا، یارم
دەزانم دڵ کە فەرهادە، لە دووی سەودایی شیرینە
لە ڕۆژی ئەووەڵێ دیتم کە ژینی من وەتەن! پاکی
دەبێ قوربانی خاکت بێ، بژی ئەو دیدە دووربینە
کە من مەجنوونی سەحرا بووم، ئەتۆش ئەی لەیلەکەی عەقڵم
بەسە قیبلەت مەگۆڕە دڵ مەکە ئەم دین و ئەو دینە
ڕوحم دەرچوو لە بێڕەحمی بکە ڕەحمێ بە من ئەی دڵ
بەسە جەور و جەفا تا کەی چیە ئەم ئاە و ئەسرینە
بەهاران کاتی جۆباران، وەتەن حاشا لە گوڵزاران
کە تۆ رووبارەکەی من بی، شنەت گوڵزارە نەسرینە
بە شەرتێکی وەفاکەی تۆ لە کوێستانت وەتەن تامێک
بە دەستی خۆت کە زەهریش بێ، لە زارم تامی هەنگوینە
کە من مردم لە دووری تۆ نەبینم ڕوویی وەسڵی تۆ
چیە ئەم کێشەیی عومرە، نەبێ ئەو ژینە ژەهرینە
لە باغاتی مرادمدا کە سەربەست بووم بەجارێکی
وەرە سەیری تەبیعەتکە، وەتەن چەند جوان و نەخشینە

لەمێژە بیری تیژ دەرکی فیدای عومری منی کروە
کە دەیرێژم لە سەر خاک و دەکەم قوربانی ئەم ژینە
لە ڕۆژی مردنم یاران بەگەل پاکتان وەرن توخوا
تەماشاکەن لە خوێناوا لەشم سوورە و سەرم شینە
لەشم سوورە لەبەر شادی کە خۆم دانا لەسەر خاکم
لەسەر شینە سەری شینگام لە زوڵمی دەوری پێشینە
برۆ ئەی دەوری خەرپشتە، بڕۆ ئەی زاڵی زاڵکوشتە
چ کارێکت حەقانەت کرد، چ دەورێکت لە ڕووی دینە؟
سورەییات بێنە نێو کار و تەرازووت بێنە بەر مەیدان
بکێشە میللەتی دنیا، بزانە کێهە سەنگینە؟
بە ئاواتی هەموو کەس بووی بە غەیری کوردی بێچارە
لە عیلم و بەهرە بێبەش بوون، ڕەبی کوێربی، ئەوەش دینە
دەڵێم بیڵێم ئەوی سۆزی دەروونە و دڵ ڕەها کەم من
لە کەند و بەند کە وا تۆی خاوەنی ئەم دەورە ڕەنگینە
بەلاّن لازم نیە جارێ بەسە ئەم داد و هاوارە
ببیستە ئەی فەلەک کەڕ نی، هەرای ئەم لاوە غەمگینە

دیسان بەڕێز «مەحموود زامدار» دەنووسێ: «لە ژمارە ٤ی گۆڤاری کوردستان، ساڵی ١٩٤٦ی زایینی، شاعیری خۆشئاوازە «محەممەدی عەتری گڵۆڵانی» لە شێعرێکدا بە نێوی «تیشکی سەربەستی وەدەرخست» دەڵێ:

## تیشکی سەربەستی

تاکوو کەنگێ من بناڵم بەو هەناسەی سەردەوە
تاکوو کەنگێ لێوبەباری بەو دڵەی پڕدەردەوە
تاکوو کەنگێ ناهومێدی، سەرکزی، ئاوارەیی
دەستەوئەژنۆ خوێنی چاوم بێ بە ڕەنگی زەردەوە
خوێنی جەرگم تاکوو کەنگێ بێتە قووتی دڵ وەتەن؟
تاکوو کەنگێ دیل و یەخسیری بە دەستی جەردەوە
بەسیە جووتیاری «قەزا» تۆ تا بەکەی بۆ قەومی کورد
تۆوی بەدبەختی دەچێنی هەر بە شێو و وەردەوە
بۆچی داست کول نەبوو، پاڵەی«قەدەر» بۆ شینی کورد
وەختی ڕۆژاوایی کارە، بەسیە کار و کردەوە
ڕۆژی بەدبەختی تەواو بوو، بەختی نوێمان هاتەوە
تیشکی سەربەستی وەدەرخست ها بە شاخ و زەردەوە!
سەیری ئێستای خۆش نیە چون زۆر زووە سبحەینەکەی
خۆشی ڕوونی کاتی چێشتانە بە کێو و هەردەوە
خەتتوخاڵیان دابڕێژن، شین بکا فەسڵی بەهار
جا وەرە قاسپەی کەوان دێ، هەر بە دار و بەردەوە
کاتی زستانی بەسەرچوو، زەحمەتی چی ما وەتەن
کاری زەحمەت کوا هەیە موشکیل بە دەستی مەردەوە؟
دوێشەوێ دیتم لە خەودا نیشتمان داکی وەتەن
زۆر بەکەیف و دڵگوشاد و ڕوویەکی بێگەردەوە

پێی کوتم: تا پێو بڵێم ئەی لاوەکان و گەنجەکان
ڕۆژی کار و هەڵمەتە، فیکرێکی کەن بۆ کردەوە
لاوەکان! داکی وەتەن ئەوڕۆکە زۆر خۆشحاڵە لێو
چون لەسەر نێو و نیشانی دەستی مەردیو کردەوە
هەر بژی سەدری موعەززەم «پێشەوا»یی قەومی کورد
چون لە سەر تەختەی زەمانە، نەردی کوردی بردەوە
هەر بژی سەدریموعەززەم ڕێبەری ئازادی کورد
چونکە تاریخی سەلاحی کوردی زیندوو کردەوە
هەر بژێ سەدریموعەززەم ڕێنوێنی قەومی کورد
هەر بژی ناموسی نۆ میلیۆنی کورد کۆکردەوە

دیسان «مەحموود زامدار لە کتێبەکەی خۆیدا دەنووسێ: «لە گۆڤاری ژمارە ٤ی کوردستاندا کە لە ساڵی ١٩٤٦ی زایینی دەرئەچوو، هەمیسان «محەممەدی عەتری گڵۆڵانی» پارچە شێعرێکی بەنرخی بە ناوی «دەکا پیرۆزی سەربەستی» بڵاو کردۆتەوە کە ئەڵێ:

## دەکا پیرۆزی سەربەستی

بەرت چەند خۆشە سەربەستی، ببی پیرۆز چ دارێکی
وەنەوشە و سوورگوڵت ڕەنگاند، عەجەب ڕەنگین نیگارێکی
وەتەن نەمدیبوو سەربەستی، لە ژێری بیریدا کول بووم
لە ڕۆژی تەمبەڵیم خۆشبە، کە هۆگر بووم بە کارێکی
نە بولبول قەدری گوڵ دەگرێ، نە گوڵ ڕێزی بەهاری خۆی
کە هات کاتی خەزەڵوەریان، دەزانن خۆشبەهارێکی
هەتا میداڵی ناموسی لە غوربەتدا نەکرد قوربان
نەکەوتە بیری خاکی خۆی مرۆوی کورد و یارێکی؟[1]
لە ژێر کۆڵی عەدوو تا کەی، ڕکە و کێو و چیا دەبڕی؟
بخە سەر کۆڵی پشتی خۆی، ملی بشکێ بەجارێکی!
وەتەن گەر خوێنی خۆم نەڕژاند وەکوو سێلاو لە بەر پێتا
بە گێژاوی دڵم شین کە، هەموو شێو و بەیارێکی
وەتەن تا خەڵفی سیسی تۆ نەبێ پاراو بە خوێناوم
لە باغچۆڵەی ژیانی خۆم، نەکەم شەرتە بژارێکی
کە تۆ ڕیشەی ژیانم بی، ئەمن پێوەندی باڵاتم
دەبێ بڕژێتە بن ڕیشەت لە چاوانم ڕووبارێکی
ئەمن ئەو لاوە نیم دایم لە پێبەندی ڕوحم دابم
دەبێ ڕوح بۆچی دەربەست بێ کە بیبەخشم بە یارێکی

---

١ـ دوو کەس لە ئاغاواتە شاخوازەکان چووبوونە تاران و شا میداڵی دابوونێ، بەداخەوە یەکیان میداڵەکەی لێ ون دەبێ کە هەژار لەو بارەوە دەڵێ:

«ون بوو میداڵم، وێران بوو ماڵم؟!»

نەخۆشــی دڵ لــە بیرێــتی لــە باغــاتی وڵاتی خــۆی
دەبــوو بمــرێ لــە ئــاواتی بــەر و بــەرگ و نیــسارێکی
لە نێو باغی بەهەشتا بــووم و جۆگــەی شــیر و نــەمچێژا
بە من چی حەوزی کەوسەر بوو کە شیرین بوو بە زارێکــی
ڕەبی ئەی دڵ کە ئەو دەردەی بە تۆیان دا لــە بــیرت چــێ
لــە جــێ مارانگــەزا تــۆ بی، ڕزیــوی ژەهــری مــارێکی
ئەمن وەک بولبولی بەربوو لە تەنگانــەی قەفــەز ئــەوڕۆ
دەڵێم پــیرۆزی سەربەســتی بــە هــەر دەشــت و نزارێکــی
دڵــم ئــازادی دەس غــەم بــوو، بــە ئــازادی دەژیم ئیتــر
ســەرم ســەربەرزە ئەوڕۆکــە، بەقــەد بــەرزی چنــارێکی
وەرە ئەی بولبولی عیــشقم لــە نێــو پێوەندەکــەت بمــرە
بە بۆنی «عەتری» گوڵ دیــسان نــەبی پێبەنــدی خــارێکی

## بیرەوەرییەک لە خۆم و «سوارە»ی نەمر

لە هاوین و پایزی ساڵی ۱۳۵۲، بۆ ماوەی شەش مانگان لە نەخۆشخانەی «بووعەلی» تاران لە ژێر چاوەدێری دوکتوران‌دا بۆ موعالەجەی نەخۆشی «سیل» مابوومەوە. زیاتری ڕۆژەکانی هەینی، کاک «سوارە»ی ئێلخانی‌زادە کە ئەودەم لە ئیزگەی ڕادیۆ تاران‌دا بەرنامەی «ئەدەب و فەرهەنگی کوردی» بەڕێوە دەبرد، دەهاتە لام. لە حەساری ئەو بیمارستانە کە حەوشەیەکی پڕ گوڵ و سەوزە و چیمەن بوو دادەنیشتین و باسی شێعر و هۆنراوەی ئەدەبی کوردی و فارسیمان دەکرد. ئەگەر شتێکم لە بارەی شێعر و هۆنراوە نووسیبا، لێی‌وەردەگرتم و لە بەرنامە تایبەتییەکانی خۆی‌دا بڵاوی دەکردەوە. هاوکات لەگەڵ من، یەکێک لە ئاغاواتەکانی عێلی «گەڵباغ»ی وەک من نەخۆشی ئەو بیمارستانە بوو. ئەو ڕۆژە پۆلێک ژن و پیاوی خانەوادەکەی بە لیباس و بەرگی خۆوڵاتییەوە هاتبوونە دیداری نەخۆشەکەیان و ڕووبەڕووی ئێمە لە بن سێبەری داران، لە سەر کورسیان دانیشتن؛ ژنەکانیان باڵابەرز و ڕازاوە بە لیباس و خشڵاوی مەڵبەندییەوە دانیشتن. هەردووکمان لە سلسلە و پلپلە و زریوە و زیزانە و تاسکلاو و سینگ و بەرۆکیان واقمان وڕمابوو؛ دیمەنی دڵگیری وان دوای ماوەیەک ڕۆیشتنیان کاری لە سەر هەستی شاعیرانە و جوانی‌پەسەندی من و «سوارە» کردبوو.

حەوتەی دوایی کە «سوارە» هاتەوە دیدارم، هۆنراوەی «دڵی نەماو»م نووسیبۆوە، دامێ و بۆم نووسی: «کاک «سوارە»گیان دەڵێن: کاتێ مامان ناشی بێ، مناڵ چەوتوچەوێڵ دێتە دنیاوە. «نووری» کە دەورەی ژیانی هیچ خۆشییەکی نەچراوە، بێ و لە کاتی نەخۆشی و تەمەنی پەڕیوەی خۆی شوورەی جوانترین هەستی ژیان بکێشێ، هەر ئەوە دێتەدەرێ کە ئەیبینی و بە ناوی «دڵی نەماو» پێشکەشی دەکا. ڕجام وایە نەبێتە پینەی ناحەزی بەرنامە بوشناخەکەت لە ڕادیۆ تاران. داخوازی سەربەرزیتم. ئەوە تۆ و ئەو هۆنراوەیە.

## دڵی نەماو

لە ژێر تۆڕی دەسماڵ و زریوەی تاسکلاودا
وێنەی مانگێک دەلەرزی لە شەپۆلی گوڵاودا

نیسێ و ڕووناکی گەردن، یەخە و درزی بەرۆکی
خەرمانەی خۆری باران، لە گۆلی هەور و ساودا

داوداوی بسکی خاوی، خاڵ و برۆ و بژانگی
هەزار مەلی ئاواتی گیرۆدەی دان و داو دا

تاسەی تینووی ئارەزوو، ئاواڵەی کرد ئامێزی
ماسی سپی بوو خزی بە نێو باسکی بلاودا

تکەی کوڵی دڵی من فرمێسکی ڕوونی شادی
کۆشت وەبەر دەگێرم کە گیرنابی لە چاودا

گەنجی گێژاوی جوانیت بە گیان و دڵ کڕیارم
ئەگەرچی باسی سەرمە، دڵ و دەیدەم بە ئاو دا

سەرنجم دا پارێزی دڵی زاماری شەوڕۆ
هەتا تیری بژانگت بە شوێن خوێنی تکاودا

لە نوێژگای خۆشەویستی، لە پێش میحرابی ئەبرۆت
تاقواز بوو چاوی داوای لە تەحیات و سلاودا

مایەی هەست و ژیانم پێخوستی نازی تۆ بوو
نازدار بەسم بگێڕە بە دووی دڵی نەماودا

آنکه یک دیدن کند ادراک آن　　سالها نتوان نمودن با زبان

## چاوەڕێم یان چاوە ڕێم

تامی دەچێ واتە کە دەیجووی بە زار
جوانە لە ڕێی دیدەوە بتکێتە خوار
بۆ وتە و هەستی دەروون چاوەڕێم
بەستەڵەکە گیانە هەرێمی وتار
تا نەتەوی پێ بە هەوالان نەبا
هەر بە بزەی لێو و بە چاوانە کار
نایەوێ هەڵکاتە زمان ڕاز و خواز
هەر ئەوە خۆی باسە لە سەر لێوە بار
زەردەیی تاوی کە مژی گوڵبەدەم
گەشکە دەبێ بولبولی شێتی هەژار
تاوی هومێدێ کە پژایە سەران
دیارە نسێ دادەسەپێتە نسار
مانەوەیە و هەستی ژیانە و بەقا
من بە تەما و تۆ بە شنەی بای بەهار
دازی لە سەر بەردی نەمێنێ دەروون
نایکەمە حاشاری مڵە و مشک و مار
بەرگ و بەری پاکی بەرێ بای خەزان
هەر بە تەمای ژیانەوەیە پیرەدار

ئەم هۆنراوەیە لە لایەن ئەو کەسانەوە کراوەتە «پێنج‌خشتەکی»:
١ـ مامۆستا «حەقیقی». ٢ـ «نادر محەممەدی». ٣ـ «یۆسف عەسکەری».
٤ـ «ڕەسووڵ چووپانی(شوانە)».

## دەردی بێدەرمان

زۆر چەقڵی جەفام لە پێ چەقیوە
بە زۆر نیگای سارد گیانم تەزیوە

زۆر مەلی رامی ڕاوی دڵداری
لە سەر هێلانەی بەختم فڕیوە

زۆرکات باغچۆڵەی ئاوات و شادیم
بە شەختەی مەینەت گەڵای وەریوە

زۆر تیری تانووت جەرگی پێکاوم
مەودای برینی ئەودیوئەودیوە

زۆرکات لێم بۆتە سەردڕی نەیار
ئەو کر و ڕیسەی بۆخۆم تەنیوە

بەڵام ئەی نازدار، فریشتەی جوانیم
هەستی بزۆزی هۆی زیندەگانیم

بزەی هەتاوی سەر لە بەیانم
هەمووم لەبیرچوو کاتێ کە ڕوانیم

وەک بێمەیلی تۆ دەردم نەدیوە!
دڵ نەبرژیوە، غەم نەباریوە!

دێی تازەقەڵا ١٣٣١

## پەیامێک بۆ کوڕی زەمان

کـــوڕم هـــەتا هـــەی کـــەس مـــەدە فریـــو
مەڕفێنـــە پـــارووی هـــەژار و هـــەتیو
کـــوڕی زەمـــان بـــە، بـــە خـــۆت بنـــازە
بـــە تـــۆچی کـــێ بـــوون فەرامـــەرز و گیـــو
زانـــا و شـــیاو بـــە، ناکرێتـــەوە بـــۆت
گرێپووچکـــەی ژیـــن بـــە مێـــشکی ڕزیـــو
ناگەیـــە لووتکـــەی ئـــاوات و هومێـــد
بـــێ پـــشوو و نـــسکۆی هـــەوراز و نـــشیو
لـــە هـــاوڕێی بـــێڕێ و ڕەوشـــتی ناحـــەز
هەڵـــێ وەک بـــەرخی لـــە گـــورگی ڕەویـــو
شـــۆربەی دیـــزەی خـــۆت نـــان نەخووســـێنێ
بـــە هیـــوای جـــیران نابێتـــە تێکوشـــیو
لـــە نێـــو ئەشـــکەوتان بـــەرپێت وەلێـــسی
وەک ورچـــی برســـی لـــە لانـــێ خزیـــو
بـــەردی بەســـتێنان بـــەرپێت شـــوخاڵکـــا
وەک پلکەگۆشـــتی بـــە ســـێڵدا چزیـــو
مەردانـــەترە لـــەوەی بـــۆ کاتێـــک
بەریـــە بـــەر نـــەیار کـــڕنۆش و نـــشیو
هەســـتی پیـــاوەتی لـــە دەس بەرمـــەدە
مەرگـــە دەســـتاوی هـــیچبەخۆنـــەدیو
لـــە نێـــو خـــۆیی‌دا خـــۆت بخۆیـــەوە
بێگانـــەخوازی نەکەیتـــە بژیـــو
گـــرێ و کۆســـپی ژیـــن ورەت بەرنـــەدا
مـــافی مـــەزارە، لـــە دنیابـــەزیو

کـــوڕم هـــەتا هـــەی بـــە خـــۆت بنـــازە
ئـــەوە پێداویـــست بـــۆ دنیـــای تـــازە

عەمبار سالی ١٣٤٥

## دمم و دەست

دەچوومە شاری ورمێ، لە مەهابادێ سواری ئوتووبووسێک بووم. ژنێکی زۆر قۆز و جوان لە سەر سەندەلێکەی پێش دمی مـن سـوار ببـوو و دوو ژنی دیکـەی شۆخ و ڕازاوە بەڕێیان دەکرد، یەکیان گوتی: «نازدار گیان، دەبێ لە ورمێ سەری باجە خونچە و دادە گوڵی بدەی، ڕاسپاردەکانی ئێمە ڕابگەیەنی، لە بیرت نەچێ ها!» نازدار بە پێکەنینەوە گوتی: «بەو دمودەستەی ئەو هەموو ڕاسپاردەی چۆن ڕاگەیەنم؟» ژنەکان پێکەنین و دەستیان ڕاداشتێ و گوتیان: «بەو دمم و دەستەت؟» لە دوایە خواحافیزییان کرد و ڕۆیشتن.

واتەی «دمودەست»ی ئەو ژنانە لە زەینمدا مانا و جێگایان گـۆڕا و ئامـاژەی بەپەلە و تاڵووکەیان پێوە نەما، واژەی دمم و دەست لەسەر زار و زمانم بوو بـە زیکری خەفی و جـەللی دەروێـشان، زار دەیکـوت و خـەیاڵ دەیگێـڕاوە، هـەتا گەیشتمە ورمێ بوو بەو دمودەستەی کە دەیبینی، دەنا نە دەستم لە قەدی کەس وەرێنا و نە ڕۆژباشی وام بۆ هەڵکەوتووە.

## دمم و دەست

| | |
|---|---|
| دەستم لە قەدی وەراند کە هەسـتم | دوو مەمکی هەناری کەوتە دەسـتم |
| ڕۆژباشم ئەکرد لە کوڵم و لێـوی | ئاوقای دەمم بوو گورجـێ گەسـتم |
| سوڕ ماوە سەرم لە بەختی سوێرم | وا بەو دمودەستە گەیمـە قەسـتم |
| لەو کاتەوە هەرچی دەس دەگێـڕم | هەر بۆو دەمەیە حەزم، مەبەسـتم |
| پێت وا نەبێ مەی لە کاری خستووم | هەر بەو دمودەستەیە کـە مەسـتم |

هەژار دەڵێ:

هەزار دەوران گەڕا مەیگێڕی گەردوون تا هەڵێکم هات
لەبەر پیری ئەویشی لێڕژاندم دەستی لەرزۆکم

ئەمنیش دەڵێم:

کاتێک «هەژار»ی دڵ پڕ لە هاوار دەیەوێ گەرمەشینێکی لە سەر تەرمەکی ئاواتە نێژراوەکانی بگێڕێ، بەڵان بەڵای بەرهەڵستی زەمان بڕستی لێبڕیوە، دەستی لەرزۆکی پیری ئەو مەودایەشی ناداتێ کە لێوی ئاواتێکی تەڕکا!
یان: کاتێ «هێمن»ێکی هەڵوەدا لە «تاریک و ڕوون»ی ژیانی پڕ مەینەتی خۆیدا هەر «ناڵەی جودایی» لە دڵ و دەروونیدا دەزرینگێتەوە، ئەمن، ئەمنێکی بە تەنیاماوە «لە سەر بستووی ژیان» بۆچی غەم و کەسەرەکانی «هەژار»ی هێژا و «هێمن»ی هەرماو نەکەمە پاشەڕۆکی ژیانە تاڵەکەی خۆم و بەپیر هاواری «هەژار»ی نەمرەوە نەچم کە لەم تەکبەیتەدا بە قووڵایی دەریایەک و بە بەرینایی دنیایەک شوورەی شیوەنی بۆ هەموو هەڵپڕووزاوان کێشاوە.
جا بۆیە منیش بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە بەپیرییەوە دەچم و بۆی دەستێنمەوە و دەڵێم:

ئاواتی شیرین

چیها ئاواتی شیرینم لە بێستوونی جەفا نەخشا
ئەوەی فەرهاد بە تێشەی کرد، هەڵمکەند من بە نینۆکم

لە کوێن ئاواڵ و هاوپیاڵەی چەلان و کاتی جوامێری
کەوا بۆ هاودەمی هاتوونە لای یەکتر چەنە و چۆکم

لە خەڵوەتخانەکەی ژینم ئەوەی دڵخوازە تۆراوە
غەمە هەرگیز نەبان نابێ، ئەویش پێی وایە بانۆکم

به میزان و تەرازوو و کۆت هەڵمسەنگێنی ئەی گەردوون
دەزانی چەند لەمێژینەم، نە ئەفسانەم، نە چیرۆکم
بە کۆ ڕاتماڵی خەرمانم تەرازوو و کۆت فەلەک ون بێ
کە تۆ کۆی خۆت دەپارێزی، بە کۆگاوە ئەمیش کۆکم
«هەژار»، «نووری» هەزارانجار تلاسکەی بەست و نەیناڵاند
بە بوولەرزەی نەلەرزی دڵ، بە مەرگی تۆیە لەرزۆکم

مەولانا دەفەرمێ:

عیسی مریم بە کوهی می‌گریخت
شیر گویی خون او می‌خواست ریخت
آن یکی در پی دوید و گفت: «خیر
در پیت کس نیست، چەگریزی چو طیر؟»
گفت: «از احمق گریزانم، برو
می‌رهانم خویش را، بندم مشو»

## ئامان لە دەس حیسانی کەر!

سەد سالی کەساس و دەربەدەر بم
بێبەرگ و نەوا و قەستەسەر بم
وەک بەرخێ لە داکی هەڵبڕابێ
حەیرانی وڵات و دەشت و دەر بم
ئاواڵی بەراز و ورچ و ڕێوی
هاوماڵی گەلێک لە جانەوەر بم
وەک دێو و درنج و غوولی غاران
تاراوی گەل و بەرەی بەشەر بم
ئاسوودەترم لەوەی سەعاتێک
هاوڕازی قسەی حیسانی کەر بم!

عەمبار ۱۳۵۰

## دایک لە ڕوانگەی زانایانەوە

«ویکتۆر هۆگۆ»:

### «ئاواتی کچێکی کوێر»

«خوایە گیان دەڵێن کاتی بەهاران زەوی‌وزاری بە گوڵ و گیـای ڕەنگاوڕەنـگ دەخەملێنی کە چاو لە تەماشای تێر نابێ. خوایە گیان دەڵێن: شەوانە ئاسمـانی شین بە زیتە و زریوەی هەزاران ئەستێرەی گەش و مانگی شەبەقدار دەڕازێتـەوە کە هەر جوان و شیرینە تێی‌بڕوانی. خوایە گیان دەڵـێن: ڕۆژ کـە بـەیانان سـەر دێنێتەدەرێ، دنیای نوورباران دەکا و بزەی داوێتە هەموو دیمەنێکی.

خوایە گیان: داوات لێ‌دەکەم: بـە درێژایـی هەناسـەیەکی ڕوونـاکی باوێیـە چاوەکانم، ئەویشم بۆیە ناوێ کە تەماشای گوڵ و بەهار و مانـگ و ئەسـتێرە و ڕۆژی ڕووناکی پێ‌بکەم! بۆ ئەوەمە تەنیا جارێکی ڕوومەت و ڕووکاری دایکمی پێ تەماشا کەم، هیچی دیکە نا.»

پەیامبەری ئیسلام ڕادەگەیەنێ: «ئەگەر لە نوێژی ڕەوادا بـاب بـانگی کـردی نوێژەکەت مەبڕە، بەڵان کاتێک دایکت بانگی کردی نوێژەکەت بـەجێ‌بێـڵە و بـە هاوارییەوە بچۆ.» حوکەما دەڵێن: «ئەگەر ماکی دایک نەبوایە، بوونەوەر تـەنیا بریتی بوو لە جـەماد و هیچـی دیکـە نـا. ئەگـەر وایـە دایـک مـاکی حـەیاتی بوونەوەرە.» جا بۆیە دەڵێم:

### سڵاو لە دایک

ئەگەر یـەزدانی مـەزن، وێنێکـی وەک خـۆی بایـە
کڕنۆشم بۆ دەکـرد و دەمکـوت: ئـەتۆی ئـەی دایـە

سەرقافڵەی خێڵی خێزان، گەر تۆ نەبای ئـەی دایـک
کـاروانی کـوڕی خیلقـەت دەکـشایەوە بـۆ دوایـە

نە فریشتەی، نە وەک پەری، تۆ ژیان وەدی‌هێنەری
بەشەر بێشکەی لە کوێ بـوو کـە تـۆ ڕاتنەژاندایـە

سـامان‌دەهەنـدەی ژیـانی، بنچینـەی ڕاوەسـتانی
بۆ هەستوخوستی کۆرپە، ئـەرکت لـە دوا خودایـە

بۆ خەلقی خوو و خەسڵەت ئیعجـازی تـۆ نەبوایـە
مەسیح و مەسح و دەرمان، مووسا و یەدی بەیزایە؟!

بە هەستی ڕوون و خاوێن بە پـاکی تەشـکوداوێـن
گۆچی ژەکی ژینی تۆن، «ڕازی» و «کوڕی سـینا»یـە

ئەتۆی بە شەوگاری ڕەش، بە چاوی لە خەو بێبەش
بە گەرمی لەش و باوەش، کۆرپەی دەخەیتـە کایـە

دایکە کە بـە زمـانی حـاڵ، دەخاتـە زەیـنی منـداڵ
ڕێـی گاگۆلـکە و گـڕوگاڵ، بـە دارداره و لای‌لایـە

بە کام نەسیم دەپشکووت، غونچەی دەمی مەلۆتکـە
شـنەی شاباڵـی پـەری دایکـی بەسـەر نەکـشایە؟

بـە برژانگـی دەماڵـم، تـۆزی پـیرۆزی بـەرپێت
سەر پردەبازی ڕێت بێ، بەهەشـت لـە بـەر پێتایـە

## بیرەوەرییەکی کاتی جوانی

دەفیــــزێ وەک قـــەفی گۆچانـــێ پـــشتم
کــــە بـــیرم دێتـــەوە کـــاتی جحێـــڵی

وەکـــوو مێژۆکـــی نێـــو ئـــاوێ دەلـــەرزم
کـــە دەڕوانمـــە تریفـــەی ژیـــن بـــە لێـــڵی

هـــــەواری زینـــدەگی کێچـــی هەڵـــێنا
تـــەکوتـــوێی تێکـــەوت ناومالـــی خێـــڵی

دەزانم دڵ ئـــەتۆش باربەســـتی کـــۆچی
لـــە نێـــو تاوڵـــی لەشـــا تـــەنیام دەهێـــڵی

گـــەلێک ئـــاوارەیی هـــەورازی شـــین بـــووم
بـــەرەو لێـــژی نـــەمان ئـــەمجا بـــە وێـــڵی

گـــەلێک پیاوانـــە چـــووم بـــەگژی زەمـــاندا
بە پاشـقول بـــاویدام خـــستمی بـــە دێـــڵی

گرێپووچکـــەی نـــەهات نـــەکراوە بـــۆمن
بـــە مـــردن دیمـــەوە ئـــەم کاتـــە فێـــڵی

بۆکان، ساڵی ١٣٦٨

## پۆلێک دێوانه

کاتێک دەڕوانمە دیمەنی دنیای دەوروبەری خۆم و سەرنج دەدەمە داوای دوورودرێژی دەروونم، دەبینم نە لێکدێن و نە پێکدێن. ئەوەی ویست و خواستی دەروونە، دێوەزمەی بێز و بێزارییە بۆ دەرەوە و ئەوەی جێی قەدر و ڕێزە بۆ دنیای دەرەوە، هۆی بێزی دەروونە. جا لە نێو ئەو ڕێز و بێزەدایە دڵم پێکدادێ و غەمم تێکڕا دێ! جا لە نێو ئەو بێز و ڕێزانەدایە، دەکەومە سەر کوتانەوەی هەستەکانی دەروونی خۆم، بێدەنگیان دەکەم و لێم وست دەبن، بەڵان کوا هەست بە وست پێخوست دەکرێ؟ وەک جووجکەی ساوا لە قەفەسی تەنگی دەروون‌دا، دەنووک دەگێڕن و داوای بەش و بژیوی خۆیان دەکەن! ئەمنیش بێدەنگ وەک زڕداکی نالەبار، جووجیلەی هەستەکانم وەبەر چەپۆکان دەدەم و لە باتی بەش و بژیو دەڵێم: ئەیوای پۆلێک دێوانە.

## پۆلێک دێوانه

زمان!

ئامان، ئامان زمانی من     جووڵێنەوەی بیر و هەستم
باسی سەر و گیانی من     بۆچی پێتکوت ئەتپەرەستم؟

من و گێژی دەریای ئەوین     دنیای وڕی و بێسامانی
بە کام بزەی ڕووکاری ژین     بووژانەوە و وێژەوانی

هەیداد، بێداد زمانی شڕ     بۆ لە کالان هاتیەدەرێ
ئاوری کوژاوەت خستە گڕ     هەزار سەودا و تەنیا سەرێ

چەند بێغەم بووم گرێمدابووی     بۆ کردتەوە بوخچەی دەروون
خۆت ڕاپسکاند بەرەڵلا بووی     نەتهێشتەوە دەراوی ڕوون

**چاو!**

ئەی چاو خۆ تۆ بازی پیر بووی      بۆ دیمەنی نیزیک و دوور
کانگەی گریان بە چی ژیر بووی      وا لێکت نا چاوی مشوور؟!

**گوێچکە!**

گوێچکەی بەهەست بۆ دەنگوباس      هەوالگری قەلای سەر بووی
قەلا رمیا بووە پەلاس      تۆ هەر مات و بێخەبەر بووی

**ئەی دڵ!**

دڵی کلۆڵ کوێرە بوو چاو      بێبەرجەوەند کەوتیە شوێنی
بوویە نێچیری چاوڕاو      ئەی گۆڕ، ئێستا لەپێک خوێنی

**ئەی عەقڵ!**

عەقڵی زانا زانیت ئەوین      گڕ و تینە بێپسانەوە
ژانی دەکاتە تۆشەی ژین      لای کایەیە حەسانەوە

چۆن هەڵە بووی لای خۆ ئەتۆ      سەرقافڵەی ئەو کارانە بووی
مەستەخەساری ڕەنجەڕۆ      عاشقی پولێک دێوانە بووی؟

**ئەی ئەوین!**

ئەوین توخوا لام لێ لادە      ماڵی دەروون شەقە و شڕۆڵ
ساکەدەشتێکی بەربادە      خۆ نابیە کوندی کاولی چۆڵ

## پیرێژنی کۆنەکار

لە دەورانی کۆن و نوێــوە هــەتا ئەوڕۆکــە، کاتێــک شـێواوی و شـپرێوی، هەستوخوستی گیانی هۆنەرەکانی داگرتبێ، یان زەمانە چرنۆکی ناحەزی خۆی لە دڵ و دەروونیاندا گێرابێ، ناڵەیان لێپەیدا بووە و هەڵمەتی خۆیان ئاوقـای پیرێژنی زەمانە و عەجووزەی گەڕاڵی دەوران و چەرخوخولی زەمانە کردۆتەوە، وەک «مەلیکوششوعەرای بەهار» لە دەس عەجووزەی دەهر دەناڵێنێ و دەڵێ:

کاهنــدەی مــردی ای عجــوزەی ری | بفـــزای بـــە رامـــش و رامـــشگر
دە دە بـــە مخنثـــان بـــی معنـــی! | کـــینتـــوز بـــە مردمـــان دانـــشور
هــر شـب بـە کنـار ناکـسی بغنـو | هــر روز بـــە روی ســـفلەای بنگـــر
تـــا مایـــەی ســـفلگی نگـــردد کـــم | هـــر روز بـــرای ســـفلەی دیگـــر

جا بۆیە پێم وایە جێی ڕەخنە نیە ئەگـەر ئـەمنێکی بـێبـەش لـە ژیـان بـە مستەکۆڵەی زەمان و چەپۆکی پیرێژنی کۆنـەکاری دەوران هـاواری بـەجێ یـان بێجێی خۆم بەرزکەمەوە ئەگەرچی دەڵێن: «کابرا بە کەرێ ناوێرێ وەردەگەڕێتـە کورتانێ!» هەڵمەتەکەم بۆ سەر پیرێژنی کۆنەکاری دەوران وەک تفی سەرەوژوور وایە و هەر ڕووکاری خۆم دەگرێتەوە، ئەو چی بکا کە بۆخۆم چیم نەکردووە؟!

گلـــە از هـــیچ کـــس نبایـــد کـــرد | کز تن ماست، آنچـه بـر تـن ماسـت

بەڵان خەتا کەس وە ئەستۆی خۆی ناگرێ، «کلاشی مام ئاشەوان»ە لـە سـەر سینگی خۆمی لادەبەم و دەڵێم: هەی داد و بێـداد لـە دەس پیرێـژنی کۆنـەکاری دەوران.

## پیرێژنی کۆنەکاری دەوران

پیرێژنی کۆنەکاری دەوران
شیپانەتەقێن و دەرکوبان‌دڕ

کۆلانگەڕی کووچەیی شەو و ڕۆژ
بێعار و گەڕاڵ و بلچ و بن‌شڕ

جارێکی نەهاتە ژوانی هیوام
هەرچەندە کە پیرە ئەو، ئەمن کوڕ

تا ڕۆژی هومێدی مە نەزۆکە
بۆ چارەڕەشی هەمیشە زگپڕ

لەو چەرخ و خولان و فیکەدەورە
نەیداوە گەڕێک لە ئێمە ئاوڕ

وەک گورپەیی دەستەمۆیە حیزە
ژێردەستی هەموو کەسە بە من خڕ

ئەو دێلە لەگەڵ کەسان بەفێلە
بەربێنکەیی ناکەسانی سیخوڕ

چی کەم بوو لە نێو گەلان گەلی من
بۆچی دەبێ ئەو پڕ و ئەمیش قڕ

دەک چەرخ‌وخولت سەرەونخوون‌بێ
دەورەت بە دەوار بێ نان‌ودۆبڕ

## وێنەکەم

دۆستێکی ئەدەبدۆست داوای وێنەکەمی کرد تا لە بڵاوکردنەوەی هێندێک لە هۆنراوەکانمدا کەلکی لێوەرگرێ. پێم گوت: «براکەم، من کە ژیانم هیچ وێنەیەکی نەبووە، وێنەکەم دەتوانێ چ نەخشێکی پێداویست باوێتە بەر چاو و زەینی بینەران و خوێنەران!» هەر چۆنێک بێ ئەو هۆنراوەیەی خوارەوەم بۆ نووسی و دامە دەستی.

## وێنەکەم

لە کوێ دەدوێنێ دنیا لێوی دړواوم
چلۆن دەنوێنێ وێنەم هەستی خنکاوم

ئەوەندە چاوەڕێی پێکهاتی ئاوات مام
لە گۆڕیشدا دەڵێم با لێکنەنێم چاوم

گوتم تا هەم لە ئەستۆی خۆمی دانەڕنم
گوناهێکی بە کوردیم دیتووە و دواوم

بڵێی ببیەن گەلی ڕێبواری دوای من دێن
هەرای کوردی لە کاروانان بەجێماوم؟

زەمان پێیوانەبێ خستوومی وا کەوتووم
لە سێبەی ڕۆژی هاتی خۆمە تێخزاوم

# کرنۆشێک لە پێش بارەگای هۆنەر

هۆنراوەیەکی مامۆستا «گۆران»م دی بە نێوی «گـۆرانی گـۆران»ی، هـۆش و بیری منی ڕاکێشا بەرەو دنیایەکی دیکە، ئەو دنیایەی کـە گیـان و ڕەوانی تـێدا دەبزوێ و دەپشکوێ. بارەگای ڕووناکبیرانێ کە بە هەر زاراوە و ڕاوێژێک تێـیدا دەدوێن. هەر ڕەنگ و نەژاد و تیرە و تەبارێک بن، لە ڕواڵەت و دیمەنی ئینسانی خۆیاندا یەزدانی و مەلەکووتی دەدوێن، هەستی مرۆڤ تەکان دەدەن و خوست و عاتفەی بەشەری ڕادەژێنن. بە دیـتنی ئـەم هـۆنراوە، گـڕ و تـینی سـووتمانی دەروونم لە بارەگای هۆنەراندا کووژاندەوە و هاتمەوە دنیای هەسـتی بەشـەری خۆمەوە. وەک لە پێشدا ئاماژەم پێکرد، کاتێک لە نەخۆشـخانەی «بووعـەلی» تاران لە ژێر چاوەدێری دوکتوراندا مابوومەوە، زیاتری ڕۆژەکانی هەینی، کاک «سوارە»ی نەمر دەهاتە لام. هۆنراوەی «کرنۆشێک لە پـێش بارەگـای هۆنـەر»م دایە کە ئەویش لە بەرنامە ئەدەبییەکەی خۆیدا لە تاران بڵاوی کـردەوە. یـادی بەخێر و ڕەوانی شادبێ.

## کرنۆشێک لە پێش بارەگای هۆنەر

مـن چـی بـڵێم بـە جـوانی — بـە ڕێکـی و بـە ڕەوانی
وەک «گـۆرانی گـۆران»ی — ئینـسانی بـێ و یـەزدانی
فریـشتە بێتـە دەرکـێ — پـەری بێتـە هەڵـپەڕکێ
زەوی بێتـە سـەمایە — گـۆرانی کوانـێ وایـە
هۆنـەر تـۆ ئینـسانی پـاک — نموونـەی ڕەوشـتی چـاک

بـۆ کـێ دەگری، بـۆ کـێ دەژی — دەبیـە پۆلـوو، دەبیـە ڕەژی
چۆن سووتاوی، چـۆن چۆقیـوی — جارێـک شـەمی، جارێـک پیـوی
هەڵدەگیرسێی بـۆ دنیـای ڕوون — دادەمـرێنی کوڵـی دەروون
تـۆ فیردەوسـی، ویکتۆرهۆگـۆی — تـۆ لامـارتین یـا خـۆ خـاجۆی

تۆ گۆرانی، ئەستێرەی کۆی
دنیا دەڕوا کوا تۆ دەڕۆی

برۆی، چاوی، بژانگی
لە ڕووی زەرد و ڕەشانگی

خوێنی لە نێو پێستی سوور
یان هەر سپی و دەریای نوور

گیانی لە نێو هەمووانی
ڕەنگ و نەژاد نازانی

ڕۆڵەی پاکی یەزدانی
بە نێو کوڕی حیسانی

هۆنەر بڵێ تۆ لە کوێی
نە ئاوا بووی نە لە سوێی

نەنزیکی نە لێم دووری
بڵێسەی کۆگای نووری

دنیای پڕ ئاوازەی تۆ
واتەی کۆن و تازەی تۆ

لە هەر کوێ خۆ بنوێنی
خۆری پڕشنگ ئەپژێنی

مامۆستا حوسێن ئاغای خۆشەویست!

هەتا فیزەمزەی ئاشەوانی و دایکەدزەی ئاوەدانی لە ئارادا بێ دەڵێم: چۆڵپەرستیم خۆشترە!

دەڵێن وتە و ورتە کات و هاتی هەیە، جا بۆیە هەمیشە چاوەڕێی هاتنی کاتێکم کە چزەیەک یان بزەیەکی باوێتە دڵ و دەروونم. غەم یان خۆشی فەرقێ ناکا، هەردووکیان هەستوخوستی دەلەرزێنن و دەبزوێنن. هورووژمی هاواریان هان دەدەن تا هەڕا کاتە سەر لێواری زار و زمان هەتا زەخیرەی زاخاوی دەروون لە زنەکێشی دیدەوە یان لە زێباری زارەوە هەڵچۆڕێنن و هات و کاتی نەدۆڕێنن.

بەڵان دڵ دەڵێ: ئەمن کاتم دۆڕاوە و هاتم گۆڕاوە! چەندێکە لە هەموو شت بێزارم، دەپرینگێمەوە، وەک زەنگی کلیسا بە پتەیەک بە کوتەیەک دەزرینگێمەوە. لە سێبەری خۆم سڵەی دەکەم، هەستی تەڵەکە و تەڵەی دەکەم.

دەڵێم: لە چی، لە کێ؟ دەڵێ: لە ئەم، لە ئەو، لە ئاوەدانی!

دەڵێ: چیوەچزەی دێوەزمەی بیابانیم لە فیزەمزەی ئاشەوانی و دایکەدزەی پێ دڵگیرترە، گیان ژیرترە، جا بۆیە پڕ بەدڵ هاوار دەکەم دەڵێم: چۆڵپەرستیم خۆشترە.

## چۆڵپەرستیم خۆشترە

دان و داوە ئاوەدانی و چۆڵپەرستیم خۆشترە
خێڵی جندۆکە لە فێڵی دۆستی قەستیم خۆشترە
من لە یارانی زەمانە هەر نەیاریم هاتەڕێ
هاودڵیم بۆ ساغ نەبۆوە، دڵشکستیم خۆشترە
تا وتەی زارم لەگەڵ ڕازی دەروون هاوڕێ نەبێ
هەر کپی و ماتی و کڕیم، بێ هەستوخوستیم خۆشترە
من کە بەهرێکم نەدی لەم ڕێڕەوی و پێپڕکەیە
بەرهەمم هەر بوو بە وەستان، هەڵنەوێستیم خۆشترە

پــۆرکــەی ئــاوات نــەپێوێ، دەس بــە هیــوا ڕانـــەگا!
پەل بڕاو و دەس شـکاو، بــێ پــێ و دەســتیم خۆشــترە
ئەم پەرستی و ئەو نەویستی، هەر دەمێکی ڕووگەیــەک
خۆم لەبەرچی پــێ دزێــو بــێ، خۆپەرسـتیم خۆشــترە
بەسمە دەســتەکوتەی لــەخۆڕا و ڕێبــڕینی بــێوچــان
ڕەنجــی ڕابــردووم بـــە بـــا دا، بابەدەســتیم خۆشــترە
خمگـــەری دەوران دەبیـــنم هـــــەردەمێ ڕەنگێکـــــە وا
ڕەنگە پێــیوابــێ لـــە ژینـــا ڕەنگــی نیــستیم خۆشــترە
چـــون گونـــاهی تێگەیــشتن بۆتـــە داوی زینـــدەگیم
کردەوەی گێــژ و خــولان و شـێت و مەســتیم خۆشــترە

## ماڵ تەبایی

کوڕ لە نێو کۆڕی گەلاندا وەک گوڵی بێخار نەبێ
بێنیشان ون بێ لە ژینا شوێنەواری دیار نەبێ
تا بە سەربەرزی بژی بمرێت و دواکەوتوو نەبێ
سەر لە سەر داری ببینێ، مل لە نێو هەوسار نەبێ
با لە کاولاندا وەکوو کێویان کەساس و کۆیلە بێ
سوغرەکێشی ناحەزان و باربەری زۆردار نەبێ
کوانێ بۆ سبەی بە ڕوونی دیمەنی دنیا دەبینێ
بەرجەوەندی دەردی پار و مەخسەرەی پێرار نەبێ
چەندە خۆش ماڵتەبایی و نیشتمانی گەرم و گوڕ
خێڵ و هاوماڵت کەسیرەی بادەوەی ڕۆژگار نەبێ

بۆکان، ١٣٧٦

## ئەمن و سەعدوون و پەپوولە

کاتی بەهار بوو، بەیار و زەوی‌وزار، دەشت و دۆڵ و بەربنار ژیابوونەوە. سەوزە و گوڵ و گیا، گیانی تازەیان هاتبۆوە بەری و سەریان لە داوێنی زەوی هێنابووە دەرێ. ژیان و گیانێکی ملۆزمی خەزەڵوەر یان مۆتەی سەرماوەز لە ناخی بەفرانبار و ڕێبەندانی ئاخنیبوون. بە شنەبای شەماڵ و ڕێژنەی هەوری گەواڵگەواڵ کەوتبوونە لێوبزە و گڕوگاڵ. بەهار دیمەنی دژ و داماوی چڕ و چیای بە چیمک و چیمەنی تەنیبوو.

کەژ و کێو، دار و دەوەن بە ڕەنگی سوور و شین، ئاڵ و زەردە خەنی ببوو، هەموو شت پێدەکەنی، گوڵ، گەڵا، زەمەند و زەنوێر، جۆگەلە و کانیلکە، مەنداو و هەڵدێر، دەترووسکانەوە، دەبرووسکانەوە، ڕادەژان، بە شنەیەکی دەهاژان. سیرەی سوێرە و چرەی جوڕرە و قاسپەی کەو خەوی سروشتی ڕەواندبوو، بەند و پێوەندی زۆرداری سەرمای پساندبوو. غەم و پەژارەم زۆر بوو، بۆ چارەسەری ڕووم کردبووە دەرێ هەتا بە دیمەنی چیمەنێ، بە خێوەتی خەملاوی بنار و بانوان، پەژارە ڕەها کەم و خەرمانی خەمان بە با کەم. لە بن هەر بەردێکی دەردێکی وەشێرم، لە لای هەر گەڵایەکی بەڵایەکی وەگێرم، لە لای هەر گوڵێک دەردی دڵێکی ببژێرم، نەمدەزانی لە کوێم و بە دڵ لە چی دەدوێم، خۆم لێ ون ببوو، خۆم لێ گۆڕابوو و بڕستی بیر و هەستم بە دیمەنی سروشتی دۆڕابوو.

لەو کاتەی‌دا هەستێک و دەستێک، ڕایەڵوپۆی چاو و گوێ لە نێو دەنگ و ڕەنگی دیمەن‌دا تێکەڵی کردم و بۆ لای خۆی بردم. ڕوانیمە لای هەستەکە دیتم: سەعدوون بوو. سەعدوون کێ بوو، چی بوو؟ سەعدوون لاوێکی ١٧ساڵەی شێت‌وپێت و دێوانە بوو، نەسرەوتوی ڕۆژێ و نەنوستووی شەوانە بوو. دەستیان لێ‌وەشاندبوو بەڵان ئەو دەستی نەدەوەشاند، خۆی لە کەس نەدەگەیاند، ڕووت‌وقووت چۆن لە دایکی بەرببۆوە هەر وا دەژیا، دەگەڕا، دەژوا و کوڕی وێچووی بابەئادمم بوو، هەر گەڵا هەنجیرەکەی کەم بوو.

گەرما و سەرمای نەدەزانی، چۆلی پێخۆشتر بوو لە ئاوەدانی، بە هەموو ڕێیەک و جێیەکی دەزانی، خەڵکی مەڵبەندی هەموو دەیانناسی، برسی با دەچۆ ماڵێکی، نە بۆ سواڵێکی، بابۆڵێکی وەردەگرت و دەڕۆیی. هەنگاوی کورت و هێواش دەهاویشت و دەحەجمی، جانەوەری خۆشتر دەویست لە ئادەمی. کیسەڵ، مارمێلک، بۆق، پەپوولە، لەگەڵ هەمووان دەدوا و لە حیسانی نەدەگەیی. هەستی سەعدوون وەخەبەری هێنام، دەستی سەعدوون سەرنجی ڕاکێشام، دەستەکانی هەڵۆڵ پێکەوە نابوو، قامکەکانی وەک شووڵی قەفەسی وێکهێنابوو. پێدەکەنی و دەزریقاوە، لە کەلێنی قامکەکانی ڕادەما ڕادەچەنی، لەپڕ دەستەکانی لێک ترازاند، پەپوولێکی خاڵدار و باڵ تەڵای لە نێو قامکەکانی هاتەدەرێ، باڵی لێک دا سووڕێکی خوارد و لە سەر پەلکی گیایەکی دیکە نیشتەوە، سەعدوون پێکەنی تریقاوە، چۆوە پێشێ، دیسان هەر بەو شێوەی پەپوولەکەی لە نێو قەفەسی قامکەکانیدا وەگیر هێناوە. پێدەکەنی ورتەی دەهات، وتووێژێکیان بوو کە ئەمن لێی حاڵی نەبووم. نە پەپوولە ڕازی بوو هەڵفڕێ بڕوا و خۆی ونکا، نە سەعدوون وازی لەو بازییە دەهێنا. سەرم سوڕمابوو لە خۆم، لە سەعدوون، لە پەپوولە؟! هەژنۆم شل ببوو، دەمەویست بڕێک باری لاقم بگۆڕم، بەردێک لە بەر پێم خزی و خللۆر بۆوە. سەعدوون ڕوانی ئەمنی دی، سڵ بوو ڕاچەنی، وەک هەمیشە کاتی تووڕەیی، دەستەکانی بەتوندی بە هەر دوو لا سمتیدا تەپاند و بەرەو جیا تێیتەقاند.

ئەمن مابوومەوە و دنیایەک پرسیار و پەپوولێکی هەڵوەدا و بێقەرار. بە زمانی بێزمانی لەگەڵ پەپوولە کەوتمە وێژەوانی. ئەوە ئەمن و پەپوولە لە دنیای مەنگ و بێدەنگی دەروونندا.

باشە ئەوەش دیزە بە دەرخۆنە نەبێ کە سەعدوون هەر لەو سەروبەندەیدا، هەر لەو کێوپارەیە بە گوللەی کێوپشکنەکانی دەوڵەت کوژرا و گیانی شیرینی لە دەس دا. هەر ئەو هەلکەوتانە بوو بە هۆی هۆنراوەی میراتگرەکانی سەعدوون، یانی پەپوولەکانی هاودەم و هاوڕازی.

## ئەمن و پەپوولە

پەپوولــە چووکــەی پــەڕوباڵ تــەڵ
هەستی نەسرەوتووی گــوڵ و گیـا و گــەڵ
هێــدی و بەســپای وەکــوو پــەڕی قــوو
دەکەویــە هــەوا بــە هــاڵاوی هــوو
دێــی و تێدەکــشێی وەک بــزەی منــاڵ
لــە ســەر تریفــەی کانیلکــەی خــەیاڵ
وێنــەی تراوکــەی دەروونی تــوونی
دیــدەی دوورهــەنگێو داوێیــە ڕوونی
خۆزگــە دەمــزانی چیــت لــە دڵدایــە
سروشــت تــۆی بــۆچی هێنایــە کایــە
لــە دەم ڕووبــار و گۆمیلکــە و کــانی
هــەواڵپرســی کێــی بــۆ کــێ دەڕوانی
کــــۆچی زۆرداری سەرماوسۆڵــــە
ژیانــەوەی شــینکەی دەراو و دۆڵــە
تاســە و تاویلکــەی بــاس و هەواڵــە
شــنەی شــەپۆلی خــەون و خەیاڵــە
جیکــە و جرووکــەی مــەلی کۆســارە
هــاڕەی هەڵــدێری پــاڵ و بنــارە
خــستووتیە ســەما و ســەیری ســەرچڵان
ئــەو بازبازۆکــەی مەڵــبەندی گــوڵان
وەک خــەونی هاڵــۆز خــەیاڵبــزوێنی
وەنــەوزی چیمــەن دادەچــڵەکێنی

ناحەجمی ساتێک وا بێقەراری
دەڵێی تاوتێی نۆبەتێداری
پشوێک، وچانێک، پەپوولە زێڕە
بەسەرهاتی خۆت بۆ من وەگێڕە
تۆ هەر پەپوولەی یان لێم گۆڕاوی
هیوای ئاوارەی ئەویندۆڕاوی
هەستی بزربووی لە ژیان بەزیوی؟
گیانی ناکاوی لە لەش ڕەویوی؟
دڵخورپە و کۆسپی دڵی کۆستکەوتووی
ئاخر هەناسەی کۆرپەی سەر حەتووی
مەرج و پەیمانی کام کیژ، کام لاوی
مرادی مردووی کام دڵسووتاوی؟
ڕێبواری ڕێگای دووروڵاتانی
پەیامی شینگای سوورخەڵاتانی
بێهەست، بەسپایی، ئاوا بەپارێز
گوڵاڵان چڵچڵ دەگری لە ئامێز؟
بە باڵەپڕژە و بە شنەی بای خەیاڵ
ڕادەگەیەنی ڕاسپاردە و هەواڵ
خۆزگە پەپوولە وەک تۆ ئازاد بام
سەر لە پێناوی ڕێگای مراد بام
ئاوارەی کێو و کەژ و هەردان بام
پەیامهێنەری خاوەندەردان بام
مەبەستم زۆرە، حەزم لە دوانە
سەد گرێوگۆڵم لە سەر زوانە

هـــەزاران وتـــە و مەبەســـت و پرســـیار
دەتکێنـــە دەروون وەک ڕێژنـــەی بـــەهار
شـــەپۆلان دەدەن بـــۆ ســـەرڕێژ مـــاون
پـــاکی چـــاوەڕێی چۆرچـــۆڕەی چـــاون
نـــە زمانـــێ دەگـــرن، نـــە دەخزێنـــە زار
لەگـــەڵ فرمێـــسکان هەڵـــدەڕژێنە خـــوار
پەپوولـــە ئـــەمنیش پەڕوباڵـــم بـــا
پێـــی پـــارێزی نێـــو درکوداڵـــم بـــا
چـــاوم پاڵـــوێنەی گـــوڵی دڵ نـــەبوو
مەبەست لە زمـــانم قوشـــقی و سڵ نـــەبوو
سەربەســـــت و ئـــــازاد دەژیـــــام و دەژوام
بـــە چـــاو و بـــە زمـــان دەمـــدی و دەدوام
بـــەڵان پەپوولـــە ئـــەمنی دوورەبـــەش
لە ئاسمـــانی ڕوون لـــە ئەستێرەی گـــەش
هـــەر هـــەنگاوێکی خـــستمە ڕێـــی ئـــاوات
هەڵە و هەڵدێر بـــوو بـــەرەو ســـەرمەقولات
هـــەدەر بـــوو هیـــوای هـــەرێمی ژیـــانم
هـــەر بـــەو تاوانـــەی ســـەر وەحیـــسانم
ئەتۆش وەکـــوو مـــن بـــەرەی بەشـــەر بـــای
ســـەرکوتکـــراوی تانـــە و تەشـــەر بـــای
باڵـــی تـــەلاییت دەبـــوو بـــە بـــەلا
نە خـــاوەن بـــاڵ بـــووی، نـــە تـــۆزی تـــەلا
وا بەڕاشـــکاوی لـــە دەم کـــانی و ئـــاو
لـــە گـــوڵ و گیـــا و گـــەلا نەتـــدەکرد سڵاو
پەپوولـــە زێـــڕەی بـــاڵتـــۆز تەلایـــە
بـــێدەنـــگ ڕاتکەیانـــد چیـــت لـــە دڵدایـــە

لــە هەســتوخوســت و ئاکــاری جوانــت
تکایـــە گوێچکـــەم ویـــردی زوانـــت
مــاڵ لــە مــەریوان دڵ لــە دوو جێگــای
هـــەنگاوهاوێژی دوو ڕێچکـــە ڕێگـــای
بــە ڕۆژ هەڵـــوەدای چیــا و دمم چـــەمی
بــە شـــەو پەروانـــەی ڕووکــاری شـــەمی
ســـەر لـــە پێنــاوی شـــەمی شـــەوگاری
هەســـتی ڕۆژانـــەی گـــوڵ و گوڵـــزاری
دەڵـــێی کـــوژراوی ئـــەوینی دڵـــدار
هەڵـــدەداتەوە بـــە شـــنەی بـــای بـــەهار
مەترســـی نـــاوێ گیـــان بـــەختکـــردن
لـــە ڕێـــی ئاواتـــا، هـــەر مانـــە مـــردن
گیانێـــک بـــە نـــەمان نەکووژێتـــەوە
بـــە شـــنەی بـــای بـــەهار نابووژێتـــەوە
خەونـــە، خەیاڵـــە، ژیـــن بـــە بـێ ئـــەوین
ژیـــنن، ئـــەوینن، شـــینکەی ســـەر زەویـــن
پەپوولـــەی زانـــای کـــوێرەڕێی ژیـــان
شـــارەزای هـــەردی هـــەرێمی نـــەمان
ئـــەتۆ و شـــەم و شـــەو، شـــۆر و شـــەیدایی
ئـــەمن و بـــێدەنگـــی و غـــەم و تـــەنیایی
کـــاتی ئێـــوارە و کۆتـــایی کـــارە
شـــەم وەکـــوو شـــەوان چـــاوەڕێی یـــارە
ڕۆژباش پەپوولـــە شـــەو گەییـــە دمم چـــەم
تـــۆ بـــەراو شـــەم و ئـــەمنیش هـــەم و غـــەم

## ژان و ژین

نامە و هۆنراوەیەکی تەنز و شۆخییە کە بۆ دۆستێکی خۆشەویستی خۆم نووسیوە.

برای بەرز و بەڕێزم مامۆستاسێن‌ئاغای موهتەدی.

لە دوا عەرزی سلاوێکی زۆر و داوای لەش‌ساغی لە خوای گەورە و بێ‌هاوتا.

مامەگیان: لەم دنیا پان و بەرینەدا تەنیا دامەنێکی دەستم پێی‌ڕادەگەیشت، ئاتەکی بێ‌پاتەکی تۆ بوو. ئەویش وادیارە مانگی ڕۆژوان (ڕەمەزان) لە خوی شەتەک داوە، تەبەک بێ نان و نمەک ماوە.

بەڵێ ڕەمەزانە، ئەتۆ وەک دەوڵەمەندی دمم لە پووش دەیگری و نایخۆی، ئەمنیش وەک دەروێشی خۆش‌لەوەڕ دەیخۆم و نایگرم. دەڵێی باز و ڕاوچین، ئەوی دەیگرێ نایخوا و ئەوی دەیخوا نایگرێ. لە بەش و ڕیشی زەمانەدا وا هاتووە:

جام می و خون دل، هر یک به کسی دادند
در دایره قسمت، اوضاع چنین باشد
در کار گلاب و گل، حکم ازلی این بود
کاین شاهد بازاری، وان پردەنشین باشد

ئەمن دەمەوێ بە نێوی ژان و ژین کەمێک لەسەری بڕۆم و ئەم هۆنراوە فارسییە بە درێژەدادڕی بڕێک شی‌کەمەوە.

## ژان و ژین

گەڵای سەوز و زمڕود هەر دوو یەک ڕەنگ
بەڵان پێ‌شێلە ئەویان، ئەم نگینە
گڕی عیشق و گرووی دڵ هەر دوو سەرکێش
بەڵان ئەویان سڕە، ئەمیان بەتینە

غـــەم و خۆشـــی لـــە فرمێـــسکا دەڕەخـــسن
بـــەڵان ئـــەویان لـــە شـــادی، ئـــەم لـــە شـــینە
هـــەوای زەنـــوێر، نـــەوای بلـــوێر لەجۆشـــن
بـــەڵان یـــەکیان حـــەزە، یـــەکیان حەزینـــە
شـــەم و پەروانـــە بـــۆ یـــەکتر دەســـووتێن
بـــەڵان یـــەکیان «مـــەم»ە، یـــەک «خـــاتووزین»ە
چـــڵ و گـــوڵ هـــەر دوو هـــاوڕازن لـــە باغـــا
بـــەڵان ئـــەو بـــۆ چـــەوەڵ و ئـــەم بـــۆ چنینـــە
هـــەتا دنیـــا هەیـــە و داوای شـــەڕ و خێـــر
بەشـــی هێنـــدێکی ژانـــە و هێنـــدێ ژینـــە

بۆکان، ڕەمەزانی ساڵی ١٣٧٤

## کاتی جحێڵی یان بڵقی سەر ئاو

کاتی جحێڵی وەک بڵقی سەر ئاو
سەرێکی سوورا و قووتی دا گێژاو
ئەو دڵی سڵی نەحەجمیو ساتێ
بەحاڵ دەتەپێ و دەبزوێ تاوتاو
دەنگ تەکایەوە و لە گوێچکەی بەهەست
لە دیمەن تۆرا دیدەی دوورەچاو
خاو و خلیسکە شەقاوی بێهێز
شلوشەوێقی ڕێی گۆڕە هەنگاو
هۆش و بیروڕام تووڕە و تۆراون
هەر چەنە و چۆکم لێکدەکەن سلاو
تالان و بڕۆی هەستوخوستانە
لە کاولی لەشا، هەر گیانە جێماو
هەر ئەوم ماوە پاشماوەی تالان
هەربینا هاتن بۆویش بە سەرراو

بۆکان ساڵی ١٣٧٧

## کوا لە ڕازی باز دەگا کوندێک، قەلێک؟

لە سەرەتای یەکێک لە دیوانە هۆنراوەکانی «نیمایووشیج»دا، ئەم چوارێنەی ژێرەوەم چاو پێکەوت. لام وایە بە بەرینایی هەڵبەستەکانی دەربڕ و هاواری غەم و پەژارەی ئەم هۆنەرە سەربەرزەیە لە دەس زەمان، لە چنگ ژیان کە دەڵێ:

از پس پنجاهی و اندی ز عمر — نعره برمی‌آیدم از هر رگی
کاش بودم باز دور از هر کسی — چادری و گوسفندی و سگی

باوەڕ ناکەم نەداری و نیمە، نیمای ناردبێتە دەرکی نیاز و پێداویستی ژیان. نیما هاواری هاوڕاز و دەمسازێکی دەکا کە:
زاراوەی زمانی لەگەڵ ژاراوی زەمانی تێکەڵ نەکا، کاتێک دەبینی کەس‌وکار و کردەوە ناحەزە، وەڕەزە و ئاواتەخوازی سەگ و چادر و پەزە! بەڵان کام هۆنەرێک و نەتەوەخوازێک بووە کە زەمان لە زمانی گەیشتبێ؟ لە دوای خۆی هەر بەو زمانە یادوارەی شین و شەپۆڕیان بۆ گێڕاوە. دەمەوێ لێرەدا وتەکەی «نیما» بە ڕبە و کیلەی خۆم بپێوم و کەشکەکەی لە سوێنەی خۆمدا بشێوم و بڵێم:

## کوا لە ڕازی باز دەگا کوندێک، قەلێک؟

پاش ئەوەی پەنجا و چەند ساڵێک ژیای
نەعرەتەی کێشایە مێشکت هەر ڕەگێک
داخەکەم ئاواتی کورتت پێک نەهات
چەند سەرێک مەڕ، چادرۆکێک و سەگێک
کوا مەڕ و چادر بوو چارەی دەردی تۆ
تۆ کە بووت ئاواتی بەرزی تر گەلێک
کام هونەرمەند گەیوەتە ئاواتی خۆی؟
یان بەپێی ویستی گەڕا دەوران، چەلێک؟

هۆنەرە هاواری بەرزە و بێهونەر
بێهەرا بۆی دێتە پێش هاتێک، هەلێک
نەیچنیوە قەت گوڵی هیوا و هومێد
هەر لە لاقی ڕادەچێ چەقڵێک، پەلێک
چەند «هەژار» و «هێمن» و «ئاوات» گەڕان
شاخبەشاخ و کێوبەکێو وێنەی مەلێک
ئەو مەلەی ناڵەی شەوانەی تا سەحەر
شیوەنی فەوتانی هەلیە بۆ گەلێک
هاوزەمانی و هاوزمانی پێدەوێ
کوا لە ڕازی باز دەگا، کوندێک، قەلێک؟

بۆکان، ١٣٧٢

## دەبێ، بەڵان کوا دەبێ؟

دڵێک دەکرێ کە هەمبانەی غەمان بێ
مەکۆگەی مەینەت و هاوار و ژان بێ
دەبێ سیس‌بوونی گوڵ بڕوانی بێ‌دەنگ
دڕوودالی بژار کەی سەز و جوان بێ
بزەی خۆشی دەبێ بڕژێتە سەر لێو
بە وانەی بەهرەیان قۆرتی ژیان بێ
دەبێ بێ‌دەردیسەر دیلان بگێڕی
لە کۆڕێکدا کە شینی سەرهەشان بێ
دەبێ چاوت نەبینی قەت ئەوانەی
بەهاری شادییان بەرگی خەزان بێ
دەبێ یاران تەرەی دیداری خۆت کەی
قەدەمڕەنجەی نەیاران زێڕوەشان بێ
بەڵان کوانێ دەبێ هەر ڕۆژێ ڕەنگێک
بگۆڕی و هەر ئەوەت پێناسی مان بێ؟
بەڵان کوانێ دەبێ، زگ‌گورگی سەرمەڕ
بەزی هۆزت مەزەی چێژ و ددان بێ؟
بەڵان کوانێ دەبێ بیفرۆشی هەرزان
حەقی کۆڕێک، بە قیمەت هێند گران بێ؟
دەڵێم شەرتە هەتا «نووری» هەبێ ڕۆژ
دەبێ کۆلکێشی کۆڕم ئەرکی شان بێ

بۆکان، ١٣٧٨

## چاووڕاو

بەڕێز مامۆستا سێنئاغای خۆشەویست! دەزانم ڕاوت زۆر کردووە و بە باشی لە زمانی سلێ دەگەی، لان و کۆنەلان و تەماڵ و بازرە و هەزارە و دوولا و خوزەت تاقی کردۆتەوە، کاتی دیتنەوە فیکە و فیتوو سەدان چاووڕاوی دیکە دێتە پێشێ.

ئەوجار بە هەرا و هەڵلای ڕاوچییان و قووڕە و نووزەی تاژی و تولەی دەمهەراش چی بە سەر ڕۆژگاری هەلوەدای گردەنشینی سلەی دێنن. بەڵام مامە گیان، ئەوە جێگای سەرنجە، نە ڕاوچی لە ڕاو دەکەوێ، نە سلێ لە فیکە و فێڵ دەسلەمێتەوە، نە واز لە پاڵ و جێخێلی دێنێ. هەر لەشی بۆ بەش تەرخان دەکا و دەڵێ: سەرە بە دووی سامانەوە. مامە گیان، بڵێی ڕۆژێک بێ ڕاوچی و تاژی و تولە دابین بن و سلێش لە هەردی خۆی بێ دەردی هەڵمەت و پەلامار بحەسێتەوە؟ ڕجام وایە لە ڕازی من و لە نیازی سلێ بگەی.

## چاووڕاو

بلێ سلێ، هەلێ لە داو، لە چاووڕاو، لە لانی بەر تەلانەوە
هەرادەکەن، هەڕادەکەن سەگەل بەگەل، بە لان و کۆنەلانەوە
لە دەوروبەر خولانەوە؟
بلێ سلێ، هەلێ مەلێ ئەزم کە لانمە هەلدەبەزم
گەلێکم دی لە هەردی تۆ بە دەردی تۆ لە بەر تەلان تلانەوە
بەرەو نەمان گلانەوە
ئەتۆ سلەی، شلە و قولەی، تۆ تاراوی تاژی و تولەی
لە ماڵی خۆ، تەماڵی تۆ! لە ماڵی وا، چ حەستەمە حەسانەوە
ڕۆژی ڕەشی بێپسانەوە
تەماتە تۆ، بە ماتە تۆ، لە چاووڕاو بێ باز و باو، خۆ بازرە کەی
ئەو کارە بوو، شوێن و دوولا و هەزارە بوو، هەزار مەزار ڕازانەوە
ڕاوچی برسی بووژانەوە
سلێ دەڵێ بەلێ، بن بەرد و دار، لاپاڵ و بەربنار، تامانمە
بە فیکە و فێڵ، وارگە و جێخێڵ، جێنایەلم، لانکەی مانە و ژیانەوە
لەسەر بوونە و بڕانەوە

دێی گلۆلان، پایزی ساڵی ١٣٦٢

## چرای خانەوادە

لە وەرامی نامەی یەکێک لە بەرێزان و عەزیزانی دەورەی ژیانم، خوالێخۆشبوو جەنابی حاجی «قاسمئاغای موهتەدی» کە جێگایەکی تایبەتی لە دنیای هاوڕازی و یەکدڵی لە ماوەی ژیانماندا و لە سەیر و سووڕی زەماندا درێژەی هەبوو و تا ئاخرین ڕۆژەکانی ژیانی ئەو شەرت و پەیمانە بەردەوام بوو.

### سەروەرم چرای خێڵ و خانەوادە، جەنابی حاجی قاسمئاغای موهتەدی

هەچەند ماوێکە دیار نی دوورەچاوی
لە چاوڕاو بە دوور لە دڵان خزاوی
کە بەڕواڵەت دەروبان چۆڵە بێ تۆ
لە زەینی ئێمەدا هەر لێرە ماوی
چ فەرقێکی دەکا دووری و نزیکی
کە بۆ ڕۆچنەی دەروون تیشکی هەتاوی
ئەوەندەی میر و مەزنم دین و ڕۆیین
بە مێرخاسی و بە جوامێری و شیاوی
لە ژینتدا وەدیتهێنا هەموویان
بە بەژنی خۆت بڕی ناوبانگی پیاوی
کەمی و زۆری ژیان ناهێننە گۆڕێ
کە تێپەڕ بوو بە سەربەرزی تەواوی
بە لەشساغی بژی و زەنوێر و زیندوو
چرای نێو خانەوادەی هەڵکراوی
لە یەزدانی مەزن داخوازە «نووری»
گەل و کۆگات نەبینن لێکبڵاوی

بۆکان، ڕێبەندانی ١٣٧٢

# کەشکی ئاوەسوو

تیری جەفایە کە لێوی هەموو دەم بزێوی دروو
قفڵی مەزاری ڕازی دەروونە زاری بێپشوو

بواری وتاری تەنگەبەرە بێبڕستە بازاڕی زار
دەراوی هەراوە مەینەت و هاسانە هاتوچوو

هەستی هەناسە قەتیس ماوە لە سەر لێوی بێبزە
هەر ماری شانی ئەژدەهاکە کە دێنێتەدەر چزوو

نادیارە یار و دیاری بێدەماغە داخ و دەرد
گاڵەی نەیاری نالەبارە کە کەوتۆتە های و هوو

باکی نەماوە لە هەڵدڕین و هەڵبڕینی خۆی گەلم
حەیاتکاو لە چاوا پلووسکی دەویٚ ئاوی ئابڕوو

بابردەڵەی بە دەمی بادەوەی نەگبەتا دەڕۆن
بێگانەخواز و خۆنەویستییە بوونە کەشکی ئاوەسوو

ئاوڕی کە نەداوە لە ئاوری پشتەسەری کاکی خۆم
بۆ دەستەچیلەی سۆبەی سڕی نەیاری بوو بە فوو

«هێدی» کە شانە و ئاوێنە و کلتوورە باسەکەی
«نووری» لە ڕۆژ ڕەوییوە کەلاوەنشینە بۆتە کوندەبوو

از بـال و پـر غبـار تمنـا فـشاندهایـم          بر شـاخ گـل گـران بنمـود آشـیان مـا

## تۆزی تەمەننا

لــه دەوری بــاڵ و پــەڕم غوبــاری تەمــەننام تەکانــدووه
ئەرکم نەماوه لــه ســەر بــەرگی گوڵــیش جـێم دەبێتــەوه

ویــستم کــه تــاقی دیــده بڕازێنمــەوه بــه مــانگی ڕووت
چ بکەم شەداره دەروون، به زۆنگــی دڵــم هــەر دەزێتــەوه

بێوەی نیه که هەڵوەدای هەرده، تەرەی بــەرد و زەرده دڵ
ڕاوگــەی نــەیاره هــەردی هــەرێم، کوانــێ دێتــەوه؟

نێچیری بریندارى تیری مەینــەت و بــێناڵــه هــەر ژیــام
ناسۆری زامی زەمانه بــه ئــێش و ژانــه کــه دەکولێتــەوه

ڕێبــواری هــەرێمی هومێــدم و ئاســۆی تــەنیوه تــەم
شنەی بــەهاری ژیانــەوه دێ، تــەوژمی چیــا دەچێتــەوه

بۆکان، ساڵی ١٣٨٠

## زەمانە و زانا

ژیان هەر خەوخشپە و خۆراک نیە، هەر جلوبەرگ و پۆشاک نیە. بە هیـوا و هومێد ژیان دەبووژێتەوە دەنا دنیا تاریکە، شەوەزەنگە. چرای ئاوات و ئارەزوو نەگڕێ، گیان دەکووژێتەوە. ئەگە حیسان ئازادی نەبێ، ژیان نەگبەتە، نگریسە، نەنگە، تیلەباری قەفەسێکی تەنگە. حیسان نەفـەسکێشە، هەناسـە و هـەوای دەوێ، هەر بە نالە ناژێ و نەوای دەوێ.

نامەوێ نەزانی و تەوەزەلی خۆم باوێمە ئەستۆی ئەم و ئەو، بەڵام بۆم هەیە بپرسم ئاخۆ ئەم بەش و ڕیشە سروشتییە؟ مەسەلەی جەهەننەمی و بەهەشتییە؟ چارەنووس وای نووسیوە بەشی هێندێکان پلە و بارەگایە و بەشی هێندێکان پەنا و پەسیو؟

«شەمسی تەورێزی» دەڵێ: «نووسەرێک سێ خـەتی نووسـی، یـەکیان هـەر بۆخۆی دەیخوێندەوە و کەسی دی نـا، یـەکیان بۆخۆشـی دەیخوێنـدەوە و ئـی دیکەش، یەکیان نە بۆخۆی دەیخوێندەوە و نە کەسی دی!» «شەمـسی تـەورێزی دەڵێ: «ئەمن ئەو خەتەی سـێهەمم!» دیـارە «شـەمس» بـەپێی عیرفـانی خـۆی لێکیداوەتەوە. بەڵام ئەمن بە شێوەی شانەی خۆم شیدەکەمەوە و دەڵێم: خەتی ۳ ئەمنم، چونکە خەتێک بە نێوی زلهێز هەر بۆخـۆی دەیخـوا و کەسـی دی نـا، خەتێک بە نێوی دنیای پێشکەوتوویی ئی خۆشیان دەخۆن و ئی خەڵکی دیکەش، بەڵان خەتی ۳ نە هەیەتی بیخۆا و نە بەشی دەدەن! لەسەر ئەوەشڕا پێی دەڵـێن کوردی سەربزێو؟! وەک بە نابینا دەڵێن کوێری لە خوا یاغی! جا بۆیە ئـەمنیش بێبەشی خۆم و تەشقەڵەی نەیارەکانیش داوێمە سەر ئەستۆی زەمانە و دەڵێم:

| | |
|---|---|
| آزمـــودم عقـــل دورانـــدیش را | بعـد از ایـن دیوانـه سـازم خـویش را |
| هـــست دیوانـــه کـــه دیوانـــه نـــشد | ایـن عـسس را دیـد و در خانـه نـشد |

## زەمانە و زانا

زەمانـــە گـــەر لەگـــەڵ زانـــا نـــەبانی
لەگـــەڵ ئـــەمنی نـــەزان بـــۆچی نـــەبا نی؟
ئەگـــە پـــێموابـــوو هێنـــدێ کـــەچ دەســـووڕی
ببـــووره لـــێم، ئـــەوەش بەڵـــگەی نـــەزانی
کـــە زانابـــام منـــیش وەک خەڵـــکی دیکـــە
خـــەتی سەربەســـتی ژیـــنم پـــێ‌دەزانی
قـولی ڕەش بوونـــە خواجـــەی سەرســـەرایان
دەژیـــن ئـــازاد بـــە خۆشـــی و کامـــەرانی
هـــەموو زۆرداری مێـــژوو بوونـــە داشـــدار
منـــیش وا چاولەبـــەختی ئاسمـــانی
کـــوڕی مـــاد و نـــەوەی هۆخـــشترەی بـــووم
کـــە ئێـــستا تەقـــڵەمە بـــۆ پاســـەوانی
لە ڕۆژی بەشبەشا هەر کـــەس بـــەپێی خـــۆی
خـــولی دەوران، دەبـــوو بڕوانییـــە شـــانی!
وەجاغێـــک شـــوێنەواری خێـــڵی ون کـــا
نـــەمانی باشـــترە یـــەکجار لـــە مـــانی
کەســـاس و لارەمـــل کـــەوتووم زەمانـــە
لـــەوەی زیـــاتر کـــەچی چۆنـــە نیـــشانی؟!
ئەگـــەر «نـــووری» لەمـــەولاوە گـــوتی لـــەل
چەقۆیـــەک هەڵـــگرە ببـــڕە زمـــانی

## مووړووی ملی ڕۆژگار

ئەم هۆنراوەیەم لە شێعرێکی فارسییەوە وەرگێڕاوەتە سەر کوردی کە نیشانەی سکاڵای شاعیرە لە ژیان و سووڕی دەوران.

## مووړووی ملی ڕۆژگار

خولێک گەوهەری شەوچرای کەوتە دەست
تروسکەی بەری تیشکی ڕۆژی دەبەست

درەوشاوەتر بوو لە ڕۆژی بەتین
شیاوی جوقەی جەم بوو، تاج و نگین

خولی شێتوپێتی لە زانست بە دوور
کەرێکی بوو تەنیا، لەگەڵ گیانی جوور

دەڵێن گەوهەری وا بە قیمەت گران
لە ئەستۆی کەری خست، سپڵەی نەزان

منی شەوچرای بورجی ئەفلاکیان
ئەسیری تەڵەی خەسڵەتی خاکیان

ئەوا بەختی ئەبلەی ڕەش و نالەبار
منی کردە مووړووی ملی ڕۆژگار

## شێعری شڕۆڵ

شێعری شڕۆڵ کە وەک چۆغەی بێگرۆڵ، نە هـالاوی هـاوینی لـە هـەناوان دەگێڕێتەوە، نە شان و شەپیلکان لە سۆزی سەرمای زستانی دەشێرێتەوە!

دەڵێن: ئاخۆ شیکراوی کام شانەیە، یان سـەررێژی زاخـاوی دەروونی کـام دێوانەیە کە بەبێ راستەوپاستە بە باڵای بەرزی شێعری بـڕیوە؟ بـۆ بـەژنی بـە فیس و هەوای هۆنراوەی تەنیوە؟ دەڵـێم: بەڵـێ وایـە، «شـێعری شـڕۆڵ» وەک کەروێشکی بازرە دوا هەزارە و دوولای لە خوزەی خەفەتی خۆی خزیوە. لە ڕاو و ڕاوێژی نـەیاران نەبـەزیوە. گۆیـا یـەکێک لـە هۆنـەرە گـۆڕاوە دۆڕاوەکـانی وڵاتەکەمان، کە ژمم و ژیانی نێو یارانی بە نان و نەوای نەیارانی دەگۆڕییـەوە، لـە کـۆڕێکی ئـەدەبیدا هۆنراوەیـەکی نەتـەوەیی مـن دێتـە گـۆڕێ، هۆنـەری خۆلیگۆڕاو دەڵێ: «ئەوە پرتەوبۆلەی بن لێوانە، کێ کڕیارێتی؟ ئەم ڕۆژانە پیاو دەبێ ڕەوت و ڕەوشتی ڕۆژگار بناسێ، سەما بە دڵی شەخس دەکرێ. بـە هـەرا و هوریای خۆڕایی و شێعری شڕۆڵ نەماسێ.»

جێی خۆیەتی بڵێم «شێعری شڕۆڵ»ی خـۆم بـە تەپۆڵـکەی خۆڵـی نـەیاری ناگۆڕمەوە، تێیدا بگەوزم هەتا بڕوانێتە بیرەخەو و وەنەوزم! با هـەر برسـی و دوورەپەرێز بم نەک سەناخوانی خـەیانی تێروپـڕ و بـەهێز بم. بڕوانـە وتـەی «پەروینی ئیعتیسامی» شێرەژن کە دەڵێ:

هرچـه را مـی‌پزنـد خواهـد پخـت        چه تفاوت کـه مـاش یـا عدسـی اسـت
گر که طاووس یا کـه گنجشکی اسـت        عاقبـت رمـز دامـی و قفـسی اسـت

## شێعری شڕۆڵ

شێعری من وەک خۆم شڕ و شڕۆڵـن        میراتـە کۆنکـەی کـۆری کـلاۆڵن
ناڵەی نەسرەوتەی سینەی لەجۆشن        پۆلووی کووژاوەی زیلەمۆ و خۆڵـن

هەناسەبڕکەی هەورازی ژیانن　　پژواکی دەنگی ئەشکەوتی چۆڵن
هەنیسکی هیوای پێکنەهاتوومن　　فرمێسکی دیدە و قەترەی مژۆڵن
شین و شەپۆڕی کۆچی بێوادەی　　خێڵی باربەستەی نێو خڕ و دۆڵن
کوا دەڵێم شێعرن بێتین و لەرزۆک　　کەسیرەی زۆری و سەرماوسۆڵن
کوا دەڵێم شێعرن مات و بەستەزمان　　بێکاوێژ دەڵێی مەڕی سەر مۆڵن
کوا دەڵێم شێعرن گڕوکاڵی لاڵ　　لە سەر زار و لێو هەر گرێوگۆڵن

شێعرێکم ناوێ شان هەڵتەکێنێ
هەڵپەڕکێی نەیار گەرم دابێنێ

شێعرێکم دەوێ زمانی ساغ بێ　　بۆ شانی نەیار تێلا و پەیاغ بێ
شێعرێکم دەوێ نەیفرۆشی بە نان　　نەیکەیە پێخۆر ماست و تۆراغ بێ
چقڵ و دڕوو بێ بۆ چاوی نەیار　　شنەی نیشتمان ڕووبار و باغ بێ
شیری دوودەمی مەیدانی کێشە　　شەمی شەوگاری خێڵ و وەجاغ بێ
شێعرێکم ناوێ بۆ لێفەی نەیار　　کاتێک نێوئاخن جارێک قەراغ بێ
شێعرێکم ناوێ باندڕی ماڵ بێ　　بۆ بانی ڕەقیب کاگڵ و سواغ بێ

لێمگەڕێن شێعرم وەک خۆم شڕۆڵ بێ
نەک لە دوورەوە دەنگی دەهۆڵ بێ

## هەڵکشان و داکشان

به سیرەی ساردی تۆ بوو وا تەزیم من
لە تانووتی ڕەقیب کوانێ بەزیم من؟
لە گۆشەی خەڵوەتێکا دابەزیبووم
بە هیوای وەسڵی تۆ بوو هەڵبەزیم من
خەتای تۆ بوو لە هیچ کوێ دانەمەزرام
ڕەقیب هەر هەڵکشا و هەر داخزیم من
بە تینی تاوی ڕووی تۆ دادەگیرسێم
وەکوو ئاور بە سووتانێ دەژیم من
بە بێ سۆزی دەروون و دووکەڵی دڵ
بزووتی نیوەسووتاوی ڕەژیم من
لە چاوی پیسی دوژمن خۆم پەنا دا
دەنا تیرم لە جەرگی هەڵچەقیم من
دەڵێن بۆ هێندە ڕەشبینی لە ژینا
وەتا هەم لەم ژیانە ڕاچەنیم من
لە بەژنی بێقەوارەی دوژمن هالا
ئەوەی ڕستم، هەچەندێکی تەنیم من
لە دووی پێکهاتنی ڕۆژگاری ئاوات
بە کۆسەی هەڵوەدای ڕیش پێکەنیم من
سەرم دانێم لە پێناوی هەوای تۆ
دەڵێم ئەم کاتەیە تێیدا خەنیم من

بۆکان، ساڵی ١٣٧٥

## وڕێنە

کاتێک هۆنراوەکەی کاک «خالیدی حیسامی» (هێدی)م خوێندەوە، بوو بە هۆی ئەوە هەتا پێی وانەبێ هەر ئەو لە هەولێری کەوتۆتە «وڕێنە»، ئێمەش لێرە بێکار دانەمەزراوین، دەتوانین دەمەلاسکەی خەڵک بکەینەوە.

جا لە پێشدا «وڕێنە»ی «هێدی» دەخوێنینەوە، لە دوایە «دمەلاسکە»ی «نووری».

## وڕێنە

من بە خورپەی دڵ دەزانم هەستی پێی جانانە دێ
خۆشەویستی کاری خۆی کرد شەم لە دووی پەروانە دێ
سەیرە پێم من بۆ بە گۆشەی چاوی نەشئەی دەمگرێ
حاڵەتی وا چون هەمیشە هەر لە دووی پەیمانە دێ
لێی‌گەڕێ توخوا شەماڵیش بۆنی کەزیەی هەڵمژێ
گرژ و تووڕە جاربەجارێ گەر لە داخی شانە دێ
چاوی مەستت بێ هەموو شت کێشە دەفرۆشێ بەڵام
ئاگری فیتنە لە گۆڕی ئەو کل و کلدانە دێ
من لە دەس مەستی پەنام بۆ خانەقا برد دەمدی شێخ
ئاوەدان بێ وردەوردە وا لە لای مەیخانە دێ
ماچی لێوت گەر بە نرخی گیانی شیرن دەس‌کەوێ
کەس نیە گیانی بوێ، فەرزانە دێ، دێوانە دێ
خاڵی پیرۆزت خوداپێداوە وا باش کەوتووە
هیچ بە خۆی‌دانایە، ئەمما هێندە لەو لێوانە دێ
باسی جوانیت گەر لە کۆڕێ بێتە گۆڕێ یەک‌بەیەک
گوارە دێ ڕازێکی دێنێ، بازنە دێ، پاوانە دێ
من دەزانم شێعری من وێنەی تەواوی تۆ نیە
مەشقی ئەگریجەت دەکەم من ئەو وەکوو ڕیحانە دێ
«هێدی» لێم‌نەگری وڕێنە ئەوڕۆ مەرجی ئێمە بێ
دەرد ئەگەر دەردی ئەوین بێ، واتە هەر شێتانە دێ

به شوێن هۆنراوەکەی مام «هێدی»دا دەڕۆم به نێوی «دمەلاسکە»، بەڵان هەر کەس یاوە و وڕێنەی دەردەکانی خۆی ئەکا و هەر کام به مردووی خۆی هەڵدەڵێ.

## دمەلاسکە

من به خشپەی پێ دەزانم دز لە سەر ماڵانە دێ
خۆی لە من گۆڕیوە ئەوساڵ، هەر دزەی ساڵانە دێ
سەیرە سێرەی چاووڕاوی دێت و گەشکە دەیگرێ
بۆیە سبحەینێ لە دێدا دەنگی قورپێوانە دێ
چۆن پەرێشانم دەبینێ گورگە ڕاوی خۆشترە
بۆ مەبەستی پاڵەپەستۆ، بۆ بڕۆ و تالانە دێ
لێمگەڕێن توخوا گەماڵیش با کەلاکم هەڵدڕن
دەستەوئەژنۆ چاوەڕێ بم ساڵی دی نوخشانە دێ
چاوی مەستی پڕ فریوی بۆ ڕەقیبان ڕشتووە
دەردی نادیاری لە مشتەی نێوپڕی هەمبانە دێ
وا دەبێ پارێز لە چاوگێڕانی ئەو عەییارە دڵ؟
پێمکوتی فیتنەی دەگێڕێ، کوا کوتم لوقمانە دێ
من لە نیسێی کۆلکە قوشقی بووم، هەڵاتم کەوتمە نێو
خێزەرەی گورگان، لە لایەک دیم ئەوە یەککانە دێ
قەندی کۆپین گەر بە نرخی گیانی شیرین دەسکەوێ
سەردەرۆ دێ، تانجەڕۆ دێ، کوردە دێ، گۆرانە دێ
تا ڕەقیب باری لەبار بێ لێوبەباری ئێ منە
ناڵەیە، دەردە، هەچەندی ورتە لەو لێوانە دێ
باسی پووڵی گەر لە گۆڕا بێتە خەونی مردووەکان
مامەلا دەسنوێژی شتوە پڕ عەبای قورئانە دێ
من دەزانم شێعرەکانم تام و چێژیان تێکەڵە
هەر وەکوو چێشتی مجێوری کوێرەدێ، جێژنانە دێ
هەر کەسێ یاوە و وڕێنەی دەردەکانی خۆی دەکا
مەرجی ناوێ بۆ و بەرامی دۆ لە لای دۆدانە دێ

لەم چەند هۆنراوەی خوارەوەدا، دەکەومە پرسیار لە مامە «هێدی» و دەڵـێم: لە کاتێکدا ئەتۆ «شێواو» بووی و ئـەمنیش «عـەتری»، لـە تەمـەنی گەشـە و نەشەماندا لە هەرێمی هەڵبەسـت و هـەڵاچوونماندا لـە دێـی «شێخاڵـی» بـە گیرفانی خاڵی لە دنیای هومێد و هیوادا دەژیـاین، لـە سـیپارەی هەڵبەسـت و هۆنراوە دەدواین، پێگەمان شەوانی هەینی دێی «قۆرغان» بوو، ڕاوگەمان داوێنی «ئاڵمەڵوو» و تیرەشانی «سوڵتان» بوو، داخوا جانتـای بیرەوەرییـەکانت لـەو دیمەنانە هیچی تێدا ماوە؟ یان وەکوو کانییە درۆزنەی ژیانی مـن هەڵـچۆڕاوە؟ ئەمن نەگۆڕاوم، نەدۆڕاوم، نە لەو بیرەوەرییە زێڕینانە هەڵچۆڕاوم. جـا بۆیـە دەکەومە پرسیار لە تۆی هاوڕاز و هاوبازی لەمێژینە و دەڵێم:

کاکی «شێواو»ی لەمەوبـەر چۆنـە «هێـدی» بوویـەوە
ئاخی «شێخاڵی» بە خاڵی و داخی دێی «قۆرغـان»ە دێ
«ئاڵمەڵوو» هەر وا چـەقیوە، دونـدی هـەر وا بـاگرە
«قەمتەرە» قەمتەر کراوە تەم لە سـەر «سوڵـتان»ە دێ
بـاغی «یـاڵاوە» لـە یاڵـی ئەسـپی تـۆڕ هاڵـۆزترە
بۆنی بریانی لـە چرپـی و چۆمەڵـەی «بورهـان»ە دێ
بۆ لە بـیری «بـەیرەم‌ئا نی و «پیرمکایـل»ی دەردەدار
لێوەلرفـەی «خـاڵدەلیـل» و ناڵـەیی «دەرمـان»ە دێ
هەر لە «بەسری»ڕا هەتاکوو «تەپپەیی قازی» لە شـار
تەپلەیە و شەپکە و پەپاغە، چەک لە سەر دەستانە دێ
چەرخی چەپگەرد هەر دەسووڕێ من لە سووڕی بێبەشم
چون هەنیسکی هەڵـوەداییم هـەر وەکـوو جارانـە دێ
هەسـتی پێخوسـتی زەمانـە، دڵ گڕوگاڵـی نـەما
دارەدارەی دەوری پـیری پـێ لـە جـێ پـێنانـە دێ
باری قورسـی فـەرقێ ناکـا وشـتری چۆک بەسـتراو
حـاجی جـەبباریش بگـۆڕێ مەشـهەدی فەرمانـە دێ
چـاوی «نـووری» بۆیـە دەڕوانێتـە دونـدی کێوەکـان
چون دەڵێن بای وادە «هێدی» هەر لە لای کوێستانە دێ

## کاوێژی دوورەپەرێزێک

لـــە گۆشـــەیی دیـــدەوە ئامـــانجی تـــیرم
لەبـــەر وەی چاوەکـــەم وا گۆشـــەگیرم
گڕوو بـــوو یـــان گـــڕوگاڵ تـــێمگەیـــشتی
دڵـــت ژێـــر کردمـــەوە وا ئێـــستە ژێـــرم
کـــە مـــن ئـــاوارەیی مـــۆرەی ڕەقیـــبم
ئـــەتۆ پێـــت وا نـــەبێ لـــە وڵاتـــێ زیـــرم
گـــەدایی دەرکـــوبـــانی خێـــڵی خـــۆم بم
ئـــەوە ئـــەو کاتەیـــە پـــێم وایـــە مـــیرم
نـــەیار بمکاتـــە ســـالاری ســـوپای خـــۆی
هەڵـــمبوێرێ لـــە یـــاران، هـــەر ئەســـیرم
لە مەڵـــبەندێکی تێـــیدا بـــووم و گـــوورام
لەوێ پاراو بـــوو گیـــان و هـــۆش و بـــیرم
دڵـــم هـــەر ئـــۆگری شـــاخی وڵاتـــە
هـــەوای هێلانەمـــە لـــەم هـــەردە گـــیرم

بۆکان، ١٣٦٨

## باسێک لەسەر «پەری ئاشتی» مام «هێدی»

مامە «هێدی» ئەتۆ لە هەولێری لە مەی و نەی دەدوێـی و لـە «مەولـەوی»، ئەمنیش لێرە لە ئێش و ئۆفی خۆم دەدوێم و لەمولـەوی. ئـەتۆ تەختەبـەردێکی بەنـدەنێ نـادەی بـە تـەختی «کـەی» و «جـەم»ی، ئـەمنی گیرفـانشـڕی سەرمایەدۆڕاو، ئەوی هەمە دەیدەم بە پیواز و پارەڵماسی ترک و عەجـەمی! جـا ئەوە هۆنراوەکەی مام «هێدی» بە نێوی «پەری ئاشتی»:

## پەری ئاشتی

سووچی دەردانە ئەگـەر جـارێ خەیاڵـی مـەی دەکـەم
کوردەواری وا نەبێ، من ئارەزووی مەی کـەی دەکـەم؟
چوو لە چیرۆکی غەما داوێـنی نـەی گـرت مەولـەوی
من کە هەر فرمێسکی خۆم بێ شیوەنی بێنـەی دەکـەم؟
کۆڕی یاران سـاردە، دڕدۆنگـن عـەزیزان ئـەی خـودا
کەنگێ بەو هاوینـە چـاوەڕوانی سـەرمای دەی دەکـەم
دوورەدەسـتە نایگـەمێ، چبکـەم فریـشتەی ئاشـتی
چەندی من لەو ڕێگـەدا هـەوراز و لێـژی تـەی دەکـەم
قەت بە هەڵکەوتیش نەبوو خۆشـی لـە ژیـنمدا بـەڵام
ئەو دەمەی ئەو پەریە ڕادەبرێ ئـەمن ئۆخـەی دەکـەم
کەی ڕەوایـە وا بـە پیلـەی بـێجـێ تێـداچم کـە مـن
ئارەزووی ژینێکی سـادە و ئـەهوەن و بـێوەی دەکـەم
بـۆچی کـەس نایـە ئـەرێ بمخاتـە نێـو زنجـیرەوە
وا دەبیـنن خـۆم دەکـووژم، کـاری دێوانـەی دەکـەم
کۆیلەتی تۆ ئەی وەتەن تـا بـووی لـە دەوری مـادەوە
هەرچی هاتوە چاخی خۆی کردوویە من ئێستەی دەکەم
هەر لە سەر بەردێکی زێدی شیرنی خـۆم جـێم هـەبێ
جا دەزانی «هێدی» چۆن گاڵتەی بە تەختی «کەی» دەکەم
«هێدی» هەولێر ١٩٤٦/٦/٢٠

## کێ ناشتی

ئەمنیش دەڵێم مامە «هێدی» شەڕەمەتەڵۆکەی ناکەم، هۆنراوەکەت زۆر ڕێکوپێک و هۆنەرانەیە، باسوخواسەکەت تەواو دڵسۆزانەیە و ناوت ناوە «پەری ئاشتی». دەمەوێ لێرەدا پێشوازییەکت لێبکەم و نێوی بنێم «کێ ناشتی». لام وایە بۆخۆشت ئەو نێودێرییە پەسند دەکەی و پرسیارەکەش بێجێ نازانی کە پەری ئاشتی کێ ناشتی، بەلان لێرەدا وەرامەکە بێوەرامییە!

## کێ ناشتی

من کە زەجرم هێندە دیوە، کوا لە ژینا وەی دەکەم
تۆ لە مەی دەدوێی لەوێڕا لێرە من حەیحەی دەکەم
چۆن تەفی غەم نەمتەزێنێ تۆ لە وان و من لە وی
شینی بێفرمێسک ئەبینم، شیوەنی وا کەی دەکەم
کۆڕی یاران سڕ دەبن کاتێ دەبینم وا ئەتۆ
تۆفی دەی هاوینێ دێنی، فوو لە ئاورۆچکەی دەکەم!
هات لە ڕۆچنەیڕا فریشتە خۆی لە ئامێزت خزاند
خەلکی دی چ بکا کە من ئەسپی مرادم پەی دەکەم
هەلکەوێ بۆم بێتە ژوانێ سەد کەلێن و کون هەیە
تاکوو حالی بێ کە هاتووم، سووک بەحاڵ کۆخەی دەکەم
نایەوێ کەس کۆت و زنجیرت لە دەست و پێ بخا
دێوە دەستی لێوەشاندووی، ڕادەکەم، نوشتەی دەکەم
ئارەزووی ژیانی بەدڵخواز شەونخوونی پێدەوێ
هەر دەڵێی ئەمنی کەسم ڕاوێژی بن لێفەی دەکەم
کوانێ میراتی بەرەی مالم بە مافی خۆم نواند؟
کەی لەسەر ئەو مافەیە ئێستا کە وا وستەی دەکەم؟
بۆ لە سەر بەردی بژیم، مالم تەبا بێت و تەسەل؟!
کەیخودایی خێلی خۆم بم، جامی مەی پڕ مەی دەکەم؟
مامە «هێدی» مەرد و مەردانە لەوێڕا بادەوە
هەر وەکوو «نووری» کە هێلانەی لەکن ڕاوکەی دەکەم

## هەتا کەی، ئاخر هەتا کەی

هەتا کەی تەرمەکی ئاواتی مردووم
وەکوو دۆڵپا بە شانانی بگێڕم؟
هە تاکەی کۆتەڵی مێژووی گەلی کورد
لە سەحرا و لە شارانی بگێڕم
هەتاکەی بووکی هیوای ویشکەساڵی
بە تاسەی هەوری بارانی بگێڕم
هەتاکەی شۆڕەلاوی قیتوقۆزم
لە زەرد و ماه و شارانی بگێڕم
دەبێ فرمێسکی هەڵنەڕژاوی شینگام
هەتا کەنگێ لە چاوانی بگێڕم
کەوایە حەز دەکەم دوایین هەناسەم
لە دەوری کۆڕی یارانی بگێڕم

بۆکان، ١٣٨١

## ئاواتی ژێرگڵ

لـــە لای بێگانـــە چـــووم دەردیدڵـــم کـــرد
ملـــم بـــشکێ قـــسەی بـــێحاسـڵـم کـــرد
دەبـــێ هـــەرخۆم بچێـــژم تـــامی تاڵـــی
دڕووم چاند و تەمای بەرگی گوڵـــم کـــرد
گرێ و کۆسـپی ژیـــان ویـستم ڕەهاکـــەم
کەچی نـــەکراوەبۆم هـــیچ موشکـڵم کـــرد
کـــوتم ڕامـــی دەکـــەم ئەسـپی مـــرادم
ڕکێفـــی هەرنـــەدا قوشـقی و سـڵم کـــرد
دڵـــــی ئاواتـــــەخوازم دانـــــەمرکا
بـــە دەرد و زەجـــری دنیـــا عاقـڵم کـــرد
لەزینـــدانی لـەشـــا گیـــانی نەحـــەجمیو
بـــە هیـــوای ژیـــنی ئـــازاد ماتـڵم کـــرد
کە ژیان و گیان نەگەینـــە ڕۆژی ئـــاوات
هەمووی ئاواتی وان بـــوو ژێرگـڵم کـــرد

هۆنەنامەکانی من و بەڕێز «سەید کامیلی ئیمام زەنبیلی» (ئاوات) کە لە گۆڤاری سروەدا چاپ کراون، ئاوا نووسراوە:

## ئاوات و نووری

مامۆستا «نووری» لە کورتە نامەیەکدا بۆ ئەم ناوەندە نووسیویەتی: «کاتێک بە هۆی نەخۆشی لە نەخۆشخانەیەکی تەورێز لەژێر چاوەدێری دوکتوراندا مابوومەوە، دوای ماوەیەک دووری لە وڵات و دیداری دۆستان و یاران هاتمەوە ماڵی خۆم لە بۆکان. خوالێخۆشبوو مامۆستا سەید کامیلی ئیمامی «ئاوات»، ئەم هۆنراوەی لەگەڵ نامەیەکی ئەدیبانە بۆ ناردبووم و نووسیبووی:

الفت روحی ما دو نفر تازه ندارد      این رشته سر دراز دارد
آسوده شبی خواهم و خوش مهتابی      تا با تو حکایت کنم از هر بابی

اما با کمال تاسف اسووده شب وجود ندارد، پس به قول «سعدی»: بنشینم و لبر پیش گیرم. جا پاشان ئەم هۆنراوە دەنووسێ:

«نووری» ئەی مایەی ژین و گڕ و تینی «ئاوات»
ئەی وتەی شیرین و جوانت هەموو وەک نوقڵ و نەبات
من بە ئاواتی دڵی خۆم نەگەیشتم پیر بووم
چاکە بێمیننەتی پێ، هاتمە ڕێی هاتونەهات
زۆر لەمێژە وتووێژت کە لەگەڵ من نەبووە
گێژووێژم کڕ و کاس، غەم لە دڵم بۆتە قەڵات
مەلی دڵ ئێستە لە لای تۆ نیە لێت تۆراوە
بەو دووسێ شێعر بیلاوێنەوە با بێتەوە لات
دەڵێ ماوێکە هەواڵێکی نەپرسیوە لە من
چاکە ئاوارە ببم، بچمە کەژ و کێوی وڵات

«نووری»ش له وڵامدا دەنووسێ:

«ئاواتی ڕۆژی ڕوونم، هیوای ژیان و بوونم، من له قۆرغی پڕ له قاڵاوی ژیاندا لەش و بەشم بۆته بژیوی شاڵاوی قاڵاوان، مەلی تۆراوی دڵت بە کام چیمک و چیمەنی بژوێن ژیرکەمەوە هەتا دانەوێڵەی هونەر و ئەدەبی تێدا چینە کا، تێیدا بژوێ و بدوێ، له وەراما دەڵێم:

## قۆرغی قاڵاو

ئەی بە سەربەرزی ژیاوی له هەموو کاتی حەیات
ئەی نەوەستاوی له هەنگاوی بەرەو بەرزی وڵات
ئەی له گوڵزاری ئەدەبدا گوڵی تێراوی بەیان
ئەی له ئاسمانی هونەردا دەشەکێ نێو و نەوات
هیممەتی پیرە دەپێوێ هەموو مەودایی زەمان
پێ چیە بێت و نەبێ، ڕێگە چیە هاتونەهات؟
بەخودا مەستی هەواتە ئەوی هەستێکی هەیە
سەرە پێبازە له بەر پێت و دڵە پڕ له هەوات
ویشکەڕۆ ماوە دەروون و کپە مەڵبەندی وتار
قۆرغی قاڵاوە هەرێم چینە له چی کا عەنقات
ئەو دڵەی کانگەیی هیوا بوو بە ئاوات دەژیا
لەتکە خوێنێکە له خۆیدا دەتەپێ کات و سەعات
شەمی بێ«نووری» کوژاوەی شەوی تاریک و تەمم
وەرە ڕوونمکەوە ئەمجارە بە فووکەی مەسیحات

بۆکان مانگی «بەفرانباری» ١٣٦٢

مامۆستا «سەید کامیلی ئیمام زەنبیلی»، جارێکی نامەیەکی دووررودرێژی بۆ نووسیبووم، ئەو دەستە شێعرەی لەگەڵ بوو بە نێوی:

## باوەلیٚ باوێکی بەسە

تـەیری دڵ بـیٚپـەڕوپۆ تەپکەشـکاوێکی بەسـە
چـاوەڕێی تۆیـە کـە بێـی سووکەسـڵاوێکی بەسـە
مەڵـیٚ زسـتانە جلـی پـیر و فـەقیر پـارە بـووە
ڕۆژی ڕووت دەرخە هەتیو تـۆزە هـەتاوێکی بەسـە
پـایزە فــەرموو تەماشـا بکـە لانـەوخوارم
پیرەکەروێـشکیٚ لـە گـۆڕ کـەوتبیٚ ڕاوێکـی بەسـە
ئەو هەموو زولفە بە زنجـیری مەکـە بـۆ مـنی پـیر
تـەیریٚ وا بـیٚپـەڕوباڵ کـەوتبیٚ داوێکـی بەسـە
سـەید و پـیر و فـەقیرم وەرە لـێم قـەوماوە
بۆ منـە ئـەو مەسـەلەی «باوەلـیٚ بـاوێکی بەسـە»
وا بـە سـەرڕووتی و پێخاوسـی هاتۆتـەوە لات
«کامیـل»ت جووتـەکلاشـێک و کلاوێکـی بەسـە

لە جوابا بۆم نووسـییەوە بـەڕێز جـەنابی سـەید کـامیلی ئیمـام زەنبیلـی «ئاوات»ی خۆشەویست:

## باوەلیٚ باوێکی بەسە

هەستی نێژراوی دەرێناوە لـە نـاو گـۆڕی سکووت
مەسەلەی کـۆنی دەڵـێن «باوەلـیٚ بـاوێکی بەسـە»
باوەلیٚ، دیارە کـە شـەمزاوی بـە بـاوی گـەردوون
خۆ دەنا زوقمـە حـەریف خـۆی بزەتـاوێکی بەسـە

باوەلیٚ، بادەوە سەر باو و گوڕی کاتی کوڕی
شیر هەتا کۆن بیٚ دەڵێن هەر لەپەساوێکی بەسە
گێژی گێژاوی بەلابیٚ ئەوی دەشکێنیٚ دڵت
لای خودا دەستی دوعا قەلبی شکاوێکی بەسە
بە چەکی شیری برۆ و تیری بژانگ هەڵمەکە دڵ
شیر و تیر بۆچی دەسووی سیلەیی چاوێکی بەسە
نەتەوی بۆچی بزانیٚ بە هەموو هەستی دەروون
دڵ بە دڵ ڕێی بیٚ هەرای بۆچیە قاوێکی بەسە

## له گۆڤاری سروه وەرگیراوه
## دیسان نووری و ئاوات

جارێکیان مامۆستا سەید کامیلی ئیمامی «ئاوات»، بۆ بەشداری لە کۆڕێکی شاعیران‌دا مامۆستا «نووری» بانگهێشتن دەکا، بەڵام «نووری» لەبەر نەخۆشی ناتوانێ بەشداری بکا. ئەویش بە هۆنراوەی ژێرەوە نامەی بۆ دەنێرێ:

بۆ نەهاتی گیانەکەم دەعوەت کرای
خۆ لەگەڵ ئاوات لەمێژە تۆ برای
هێندە شیرینە برام خۆت و وتەت
هەر وەکوو قەند هابینا ڕۆژێ خورای
زووبە تەنیا شاعیرێک بووی و بەڵام
ئێستا مامۆستایەکی داستان‌سورای
بەو هەموو تەبع و قەریحە جوانەوە
کاکە بۆ چت‌کردووە بێ‌دەنگ کرای
خۆ لە ناو کۆڕی ئەدیبانی زەمان
زۆر بە زانا و بلیمەت ناسرای
«نووری» تۆ وەک نووری ڕۆژی ڕۆشنی
سەد چەلیش خۆ ون بکەی هەر ئاشکرای
بۆ شەوی شێعریش ئەگە ناردیان بچۆ
چونکە بۆ ئەم مەجلیسانە شەوچرای

نووری لە وەرامی «ئاوات»دا شێعری «لەش بەباری» دەهۆنێتەوە و بۆی دەنێرێ:

### لەشبەباری

سەرورەرم وا هەڵکەوت ئەوڕۆژە وا دەعوەت کرام
لەشبەباری باری خستم بۆ نەخۆشخانەی برام

کـۆڕی گـەرمی هۆنـەرانی ڕێنـەدام جـەوری زەمـان
بەختی نوستوو کاری خۆی کرد وا لە «ئاوات» هەڵبڕام
داری ویـشکی بـێبـەروبارم لـە کێوپـارەی ژیـان
بۆ مەلی ڕێبـواری شـەو بـێجـێ وەبـەر بیـوران درام
هەوری غەم تاریک دەکا ڕۆژێ کە «نـووری» دەرکـەوێ
کەی لـە نێـو تـەیمان و تانـەی ڕێگـران‌دا ئاشکرام؟
تـۆی لـە مەیـدانی ئـەدەب‌دا شاسـواری بـێنـەزیر
بۆ شنەی شەوگاری شێعریش تـۆ چـرای مـن پـاچرام
دەست و پێیان لێک‌دەدەم بۆوەی کە «ئاوات» سەرکەوێ
ڕۆژی ڕەش مەودای نەدامێ هـەر بـە زینـدوویی مـرام
دەرکـی داوام داخـراوە گوێچکـەیی گـەردوون کـەڕە
خـۆ دەنـا ئاسـانە ببیـە ئاسمـان دەنـگ و هـەرام

## نامەیەک و هۆنراوەیەک

ئەم نامە و هۆنراوەم لە وەرامــی پیرۆزبـایی جێـژنی نــەورۆزی ۱۳۷۷دا بـۆ دۆستێکی خۆلی گۆڕاو نووسییەوە کە بەداخەوە گوێدێری نەیاران بوو، نە یاران.

خۆشەویستم کاک...؟!

کارتی پیرۆزبایی‌یەکەت بە هۆی تازەبوونەوەی ساڵ، چەنـد ڕۆژێـک پـاش جێژنی قوربان بە دەستم گەیشت. لە وێ کە یادت کردووم، لە کونجی بێدەنگی و تەنیایی‌دا شادت کردووم. ڕۆژ و ڕۆژگارت هەمووی پیرۆز بێ، غەم و پـەژارە لــە دەورت هاڵۆز بێ، ژیانت هۆی شانازی گەل و هۆز بێ و دەڵێم:

| | |
|---|---|
| جێژنی سەری ساڵ و مانگی قوربان | یادگاری بەپیتی خەڵـک و یـەزدان |
| هەر ساڵێ کە دێن بە خێر و خۆشی | پیرۆز بێ لە تۆ و لــە خـاوخێزان |

کاکە گیان چونکە ئەمن هەر لە خەزەڵوەر و گەڵاڕێزانی‌دا ژیاوم، یان لە ناخی بەفرانبار و ڕێبەندانی‌دا خنکاوم، بە دیمـەنی بـەهاران و بــە چیمـەنی بـەیاران ڕانەهاتووە چاوم. ئەوەی کە دەڵێن بەهارە ساڵی تازە سەری لە سوێیە، کـاتی گۆڕینی کۆنکە کەوای ڕۆژگاری نوێیە، چونکە ئەوی پارەکە لەگەڵ پارەکە ڕۆیــی و تواوە.

ئەمن دەڵێم: هەر دووپاتەی وانە هیچ نەگۆڕاوە، دەردی دوێنێ ئەوڕۆش هــەر هاوڕێمە و هەر لەگەڵە، هەر تین و تەمەنە، هەنگاوهاوێژی ڕێچکـەی ڕۆژگـاری چەتوون و چەپەڵە! تازە نەبوومەتەوە بـڕێک کـۆنتر بـووم، وەک ئاشـی ئـاو لێبڕاو لە سەر تەوەر و بستەکەی خۆشم لاچووم. ڕۆژ هەر وەکوو ڕۆژەکانی لــە پەسیوی بەیانیان دەیتەدەرێ، شەویش هەر بە لێڵاوی بەستێنی خـۆی‌دا دێـت و تێدەپەڕێ.

کاکی بەڕێزم، دەردی ئەمنی بێبەش و بژیو لە ژیـانی ئاسـایی هــەر دەردە، ئەوەی دەگۆڕێ باسک و بنار و هەردە، بۆ من کە ئاواتی ئەمساڵم بۆتـە خۆزگـە بە پار، چدێنێ؟ بە من چی بووژانەوەی بی و چنوور و چنار کە بـا دەیانـشکێنێ؟ بۆ من کاتێک کاتی ژیانەوەیە کـە ببووژێتــەوە شـەمزاوەکانی بـیر و بـاوەڕ و

هەستم، دەنا بخۆ و برۆ یان بەپێی ڕۆژگاری چەواشە وەرە و بچۆ، کوا ژیانەوەیە یان ژیانە؟ ئەوە درێژەی مانگێکی پڕ لە برک و ژانە.

قامیش نیم بمدروون و هەڵدەمەوە، بمکەنە بلوێر و دەنگدەمەوە و نالەی سەر لێوان بم. بۆ هەڵپەرکێی سەربزێوان گوڵ و میوە نیم لە باغ و بێشاندا بۆ ڕنین و بۆ چنین، هەستوخوستی بزۆزم بۆ ڕاچەنین و نەحەجمین. گوڵ دەبێ بۆنی بێ، ڕەنگی بێ، حیسانیش چۆن و چەندی بێ، دەنگی بێ، بۆیە دەڵێن: «چۆن بژی شەرتە نەوەک چەندە بژی».

کاکی خۆم: لەم کات و حاڵوباڵەدا و لەم دووپاتەی ڕۆژەکانی سەری ساڵەدا کە سروشت هانای ژیانەوەی هاتۆتەوە بەری، ئەمنیش هەر بیرەوەری تاڵ و سوێرە لە ڕابردووی ژیانم هەڵدەقوڵێ و سەر دێنێتەدەرێ. پرسە و سەرەخۆشی ژیانی نەژیاوەی خۆم لە تۆی خۆشەویست و هەموو هەڵپرووزاوەکانی گەلی بێهەلی خۆم دەکەم و دەڵێم:

## ئەتۆ خۆش

کە مردم بێهەواڵ تەنیا ئەتۆ خۆش
مەڵێ بێوادە مرد، نەژیا ئەتۆ خۆش
سەدان ئاواتی ئاوارەم بەجێهێشت
لەگەل خۆم برد هەزار بریا ئەتۆ خۆش
کە دێتن ساڵی دی کاتی بەهاران
هەور بۆ ژیانەوەم گریا ئەتۆ خۆش
کە ڕایدا هەوری ئاوات و نەباری
بڵێ تا ساڵی دی دەریا ئەتۆ خۆش
لە سەربەرزی وڵات نزمیم گەلێ دی
ئەوەی کێشام لەڕێت جزیا ئەتۆ خۆش
ئەنەلحەقگۆ وەکوو مەنسووری هەللاج
سەرم بڕوا لە پێی دارا ئەتۆ خۆش
چ بوو ساتێک بە دڵشادی ژیابام
کە من نەمدی، کوڕی ئازا ئەتۆ خۆش

که «مەجنوون» وەسڵی «لەیلا»ی بردە بن گڵ
لە گۆڕیشدا دەڵێ «لەیلا» ئەتۆ خۆش
که «وامیق» هەر کوتای ئاسن بە ساردی
نەسووتا دڵ بەوی «عەزرا» ئەتۆ خۆش
که «مەم» زەینی بە «زین»ێ ڕوون نەبۆوە
«گوڵەندام» دڵ وە«بارام» دا ئەتۆ خۆش
هەتا بیستوون بە سەربەرزی بمێنێ
هەزار «فەرهاد» لەوێ فەوتا ئەتۆ خۆش
کە بانە «ئەربەبا»ی بانی هەوا بێ
«کەلیخان» با کەسیرمم کا ئەتۆ خۆش
هەتا «داشامەجید» داشداری شارە
«مەهاباد»ی لە باوەشدا ئەتۆ خۆش
کە «ناڵەشکێنە» ناڵەی دڵشکێنە
دەڵێم «ئابیدەر»ت ئاوا ئەتۆ خۆش
کە «نووری» سەربەسەر دارماڵی غەم بێ
دەڵێم کۆگای گەلی زانا ئەتۆ خۆش

کاکی بەڕێز، ئەمن گۆمیلکەئاوێکم لە قوڵکەی ژیاندا قەتیس ماوم، نە زەوی هەڵمدەلووشێ، نە هەوا دەمژێ هالاوم. ڕجام وایە سڵەی نەکەی لە سلاوم. ئیدی هەتا جارێکی دی و بەهارێکی دی، پێلاوەکانت سەر هەر دوو چاوم.

بەڵان بەهارێکی دی هات و تێپەڕ بوو و سلاوێکی دی بە دوویدا نەهات.

بۆکان، ١٣٧٧/١١/٢٢

## یادگاری یار

له جوابی نامەیەکی پڕسۆز و هۆنراوەیەکی حاجی «سەید جەمیلی هاشمی»دا نووسیمەوە:

دەبێ لە پێشدا بڵێم، حاجی سەید جەمیل بۆ من یادگاری عەزیزێکی خۆشەویست و بەڕێزە. یانی خوالێخۆشبوو جەنابی «سەید عەلیشا هاشمی» کە جێگەی وی لە دڵی مریدان و یارانی بەوەفای خۆیدا هیچ وەخت خاڵی نیە. لە ژیانی پڕ لە شانازی خۆیدا هەستی ئایینی و نەتەوەیی وەک یەک بە گرینگی و بە بایەخەوە بەڕێوە دەبرد. ئەمن بۆ یاد و بیرەوەری خۆم لەگەڵ ئەو زاتە، وتووێژم زۆرە کە لێرەدا جێگەی یادئاوەرییان نیە. بەڵام لە دوایین ڕۆژەکانی ژیانیدا کوڕی گەورەی خۆی (حاجی سەید جەمیل)ی کردە جێنشین و بۆ منی کردە یادگار.

### یادگاری یار

شێخەکەم، شێخزادەکەم، ئاواتی من، یادگاری یار
یاری کۆچکردووی دیاری ناحەزی ناپایەدار
بۆو دیارەی بۆ دەیارانی دیاری ئاخیرەت
گیانی پاکان ئاسرەوێ دیارە لە نێو هۆبە و هەوار
تاکوو ڕۆژ تینی هەیە تا مانگ و ئەستێرە گەشن
یادی وی هەر تازیە بێ و جێی هومێد بێ یادگار
ئارەزووی سەربەستی تۆمە سەرومرم تاکوو دەژیم
بۆ من و یار و دیارم بوویە جێگەی ئیفتیخار
دەرکی دڵ ئاواڵەیە، بۆ یادی یاران ڕۆژ و شەو
جا چ بوو وا لەشبەباری نایەلی بێم جاروبار
هەر بە تاسەی تۆ دەژیم ماوەی بڕینی ڕێم نیە
ناکرێ بێشارەزا ڕێگا بپێوێ ڕێبوار
بۆ لە بابی ئیفتیعالا شێو و وەرنم پێدەکەن
ئینتیزارە چێو و چرکەن کەسنەکێلە ئیزتیرار

کـوا لـه مەیـدانی ڕەقیبـا گێرەشـێوێنی دەکـەم
من بە شێعری ناڕەواج و ئـەو بـە کـاڵای ئیحتیکـار
گـەرمی بـازاڕی ڕەقیـب و ئـاڵوگـۆڕی ڕۆژ و شـەو
دەستەچیلەی بـۆ تـەنووری بۆتـە نـووری ڕۆژگـار
شێخەکەم ناکرێ ڕەقیبـان ڕەقهەڵـێنی وەک ڕەقـە
با چگە گورگی لە قولدا بـێ، سمۆچکـەی کـەمتیار
سەروەرم ئاواتمـە تـا هـەی بـە سـەربەرزی بـژی
بۆ نەیاران چقڵی چاو بی، بۆ کەسوکار یـاری غـار

وەرامەکەی جەنابی حاجی سەید جەمیل لە جوابی هۆنراوەکەی مندا:

به نێوی خودای گەورەی بێهاوتا

مامۆستای گەورە و خۆشەویستم مامە «نووری»!
سلاوێکی گەرموگوڕ لە قووڵایی دڵمەوە
کە چاوم بە نامەکەت کـەوت ئەوەنـدەم چـاو ڕوون بـۆوە کـە بـێ عەینـەک خوێندمەوە، یاخوا هەتا هەتایە بژی و تاڵی نـەچێژی. ئـەوە وڵامـی هـۆنراوە جوانەکەت، بەڵام بەر لە وەی دەستیان پێبکەم دەڵێم:

من لە مەیدانی ئەدەبدا ڕووبەڕووی «نـووری» دەڵـێم
ئـــەلفیرار و ئـــەلفیرار و ئـــەلفیرار و ئـــەلفیرار

هۆنەری وێژا و زانـا، خـۆشقـسە و شـیرین وتـار
خاوەنی گوڵزاری شـێعری جـوان و چـاک و بـێبـژار
یـاری کـەموێنـە و دیـاری گـەورەکان و ئێمەشـی
وا مەڵـێ گیـانم لـەتاوت هەڵـفڕێ ئـەی بێقـەرار
چون بەرەو نووری دەچی تیژتر لە نوور دەبڕی سنوور
کێوبـەکێو و ڕێبـەڕێ و دێبـەدێ و شاربەشـار
بـۆ بـڕینی دەردی دووری ڕێبـڕینی «نـووری»یـە
مەرهـەمی زامـی لەمێژینـە کـولاوە و کۆنـەکار

مانەوە و لەش‌ساغی و دڵخۆشی و سەرکەوتنت
وا لە لووتکەی کێوی ئامانجم دەبینم هەر چوار
خۆشەویستی و یادی تۆ وا جێگری دڵمن دەڵێی
بیری خۆم و غەیری خۆشم دێن لەوێ دەگرن قەرار
تینی شێعرت شێخی بێشینیش دەکاتە قەترە ئاو
زەحمەتە شێخزادە خۆ ڕاگرێت و مەیدە بەر پلار
ژینە کاتێ پێکەنینە و سەردەمێ ناڵە و گرین
هەر وەکوو هەورەتریشقە تێپەڕێ کاتی بەهار
کوا ڕەقیبی کەللەڕەق بەم شێخە دەکرێتە ڕەقە
پێی بڵێ ئەو سەرڕەقێکم بۆ نەرمکا چەشنی مار
واتەکەم چەشنی «جەمیل» ئەو کاتە بێجێ بێ و بچێ
کون دەکا جەرگی نەیاری ناتەبار و نالەبار

## مانگی ڕۆژووان

نامه و هۆنراوەیەکی تەنز بۆ چەند مامۆستای ئەدیب و زانا و ئەهلی قەڵەم.

مامۆستایانی بەڕێز

ئەوەندەی ئێوە لە مانگی بەخێری ڕۆژووان‌دا هەڵوەدای زلووبیای بەربانگ و کولێرەی پارشێوان دەبن، سەدهێندە ئەمنی بێبانگ و سەڵا هەناسەی تەنیاییم هەڵکێشاوە و لە کەلێن و کاژێران‌دا بە بێدەنگی سیغارم کێشاوە و دووکەڵەکەم بەبا داوە. ئەگەر مامۆستا «عەباسی» و مامۆستا «گرووە» بەجووتە لە نموفلچم بەرنەبن و نەبنە داشداری ڕەمەزان کە بۆچی سەر و گوێت تێک‌کردۆتەوە؟ نەڵێن بوویە مریشکی خراپ و هێلکە ناکەی و ڕاوکەش دەخۆیەوە؟ پێم نەڵێن لفتولێسی خۆت پەک‌خستووە، شالاویش بۆ دمولەپووشەکانی قاقرەمانگی ڕۆژووان دەهێنی؟

دەڵێم مامۆستایانی بەڕێز، دەزانم ئەگەرچی کاتی ڕێبەندانە، بەڵام مانگی خەرمانانی مام‌مەلاکانە، یازدە مانگ نوستوون و دایانچاندووە. ئەورۆ وەک خێرۆکی کۆنەجاڕی پارەکە بە قوولە و هەرای هەرەوەزی ئاوماڵە دەس‌بەتاڵەکان دەیدروونەوە و هەر بە قەرز دەیدەنەوە بە خۆیان و نەغد لێیان وەردەگرنەوە. بەو قەرز و فەڕزە هەتا ساڵێکی دی بێ هەڵلای ڕۆژێ و بێ قوولەی شەوێ سەردەنێنەوە، ئیدی هیچمان لە هیچ.

دەڵێم ئەوەیە زیافەتوڵڵا، نە بیدروویەوە، نە بیچێنی کیلەی لە کوی سوور وەرێنی، سەرمان نایەشێ چاکی دەکەنەوە. مامۆستایان لێم‌گەڕێن دیقدڵی مانگێکی ڕەبەق کە دەنگتان لێ‌گۆڕیبووم و منتان لە جەهەننەمی تەنیایی‌دا هێشتبۆوە، بۆخۆتان لێوبەبار و دەم‌قووچاو بەرەو بەهەشتی مەوعوود، هەڵدێر و هەڵەمووتی کوێرەڕێی ژیانتان دەبڕی و ئاوڕێکی بەخێروو لە بەجێماوەکانی هەنگاو شلوشەوێقی ئەم ڕێگەیە نەدەداوە. یاخوا ئێوە زووتر بگەنێ با ئێمە هەر خەریکی پینە و پیلۆز و باخییەی پێلاوە شڕەکانمان بین لەو ڕێگایەدا.

اسب تازی دوتک رود به شتاب      شتر آهسته رود شب و روز

مامه گیان، به هۆی پیرۆزبایی مانگی ڕۆژووان و لەباتی سەرفترەی مانگی زیافەتوڵلا، ئەم لاوێچە خشتوخاڵەی بە نێوی هۆنراوە شکدەبەم کە پێشکەش بە بارەگای مامۆستا عەباسی و گرووهی دەکەم. ئەگەر وەریشی‌ناگرن ماڵی قەڵب سەر وەساحەبی.

هەر بژین بەخۆشی – م.ن

## مانگی ڕۆژووان

مانگی ڕۆژووان ئاشبەتاڵی لفتولێسی زارییە
بۆ مەلای جێژنە بەڕاستی زیافەتوڵلای بارییە
زیافەتی خوا بۆ ئەوە سەرفترەیە و خێرە و زەکات
جیرەخۆری ڕۆژووە ئەو، ئی من ئیفتیخارییە
ڕۆژ لەبەر هەڵلای مەلا و شەو لەبەر قوولەی سەلا
مەحشەری کوبڕای بەڕاستی و قیامەتی یەکجارییە
دامە و ڕیزێن و شەترەنجە لە هەر لایەک دەچی
کوانێ مانگی دیکە تێی‌دا ئەو هەموو بێکارییە
هێندە باوێشک و وەنەوزم داوە بێ‌جێ و بێ‌جیهەت
زار دەلێی کۆنەتەغاری ماستفرۆشی شارییە
سەر لە لێفە ئاخنینە و ماتییە و کەروێشکەخەو
وەک تەماڵی نێو خوزە حاستی هەناسەم دیارییە
سۆفی و شێخ و مەلا تیپی بەڕۆژووی لێوبەبار
چاو بە مۆلەق ڕادەوەستن کەنگێ لای ئیفتارییە
مەشکەفی و فرنی و زلووبیا ڕیزی سەر سفرەی دەبن
قوببەتولبەیزاش پلاوی دومسیا و دەربارییە

ڕاستئەکەن سفرەی خوا ڕەنگینە میوان تێر ئەکا
مام‌مەلا کوانێ ئەمن بەو خوانە جوانە فێر ئەکا

بە هۆی کۆچی حاجی سەید «ئەنوەری هاشمی زەنبیلی» بۆ شاری کەرەج

## چاوی ڕێبین

شێخی من شار خۆشترە تا هەی بە هیـوای دێ نـەبی
ناگەیە دەریا بـە بریـا، چـۆم و شـەتت و زێ نـەبی

ئەرکی سەرکەوتن گرانـە تـا دەگەیتـە سـەر سـنوور
سەر ئەگەرچی بێتە پێی دار، هەر بە سەر بی، پێ نەبێ
کوا بە دەستەکوتە دەپێـوری لێـژ و هـەورازی ژیـان
چـاوی ڕێبـینی دەوێ ڕێبـوار هـەتا لاڕێ نـەبی

چۆن دەبێ چاویلکە بێ بۆ هەور و ساوی چاوی حیـز
حەیفە بـۆ دیـدەی دزێـو تـیر و کـەوان و ژێ نـەبی

خانەقای زەنبیل بە تۆچی قیبلە بـوو بـۆ ئـەهلی دڵ
گەر لە نێـو کـۆڕی دڵاندا کـردەوەت وەک وێ نـەبی

شێخەکەم کوا زەرگ و سیخ، سیخواری دڵ سیقاڵ دەدا
گەر هەناسەت مشتومالی دەردی گەشکە و فـێ نـەبی

خزمەتی داماوە داخـوازی خـودا و خێـزان و خەڵـک
ڕۆژوو ڕۆژی پاشـەڕۆژە ئـەورۆ پـێ بـێ پـێ نـەبی

زۆر کەسان چوونە کەرەج دیتم کە بـێجـێ هاتنـەوە
شێخی من یاخوا ئەتۆ لەو شارە قەت بـێجـێ نـەبی

## هەر کەس بە جۆرێک دڵم دەشکێنێ

هێرشی جاشەکان بە پشتیوانی دەوڵەت بۆ سەر پێشمەرگە، وەک کورتەدەرد و هۆنراوەیەک پێشکەشی یەکێک لە دۆستانی خۆشەویست، مام وسێنئاغا دەکەم و پەژارەی خۆم دەردەبڕم.

بە دیدارت چنانم گر بدانی          وەکوو بۆقێ بە قەوزەی حەوز و کانی

نامەوێ بە واتەی عەرەبان وەجهە شەبەهی هێندە قەویکەم، ببمە ئەسکەندەر و هەڵوەدای ئاوی حەیاتێ بم و بڵێم:

بە دیدارت چنانم گر بدانی          چو اسکندر به اب زندگانی

بەڵام دەکرێ ئەمنی بێبەش لە هەموو سەروبەری ژیان لە دەرەوەی قەوزەی حەوزێ، بڵقان هەڵدەم و قرەقرم بێ ئەگەر بوێرم! کاتێ هەستی مارم کرد یان هەڕەشەی زۆردارم کرد خۆمی تێدا وەشێرم.

مامەگیان ڕەنگە پێت وابێ ماوەیەکە لەبەر تێری و تەسەلی قرە و قووڕم نەماوە، مرتەقێ ناکەم یام کاروبارم لەبارە؟ نا نا، لەبەر کەسادی و کەسەلی چرە و گوڕم نەماوە، دەنا هەر وا جلوبەڕم خوارە. هەر داخ و دەردە لە دڵی زار و زەبوونەوە دەتکێتە ڕۆژی ڕەشی ژیانی بێشوێنەوار و بێدەنگیم. هەر ئاخی سارده لە ناخی دەروونەوە سەردەکێشێتە شەوەزەنگی دنیای بێڕەنگیم.

نازانم چیم و چیم دەوێ؟ لە پەلەقاژە و پێپرکەی ئێرە و ئەوێ؟ داوی کام داوایە لە پەڕ و باڵی بیر و هەستم هالاوە؟ دنەی کام بنەیە نایگەمێ و برستم لێبڕاوە؟ نە ئەوەی دەمەوێ بۆم لە پرێسکەی سرتە و پرتەوە دەپێچرێ و دێتەدەرێ، نە ئەوەی نامۆیە و نامەوێ بێ چپە و چرتە سەر هەڵدەدا و دێتە سەرێ. دەبینم تێناگەم، دەڕوانم نایناسم، چاوم هەتەری تارماییەکی دەکا پێم وایە هەوە حیسانە! کاتێ بەوردی لێی خورد دەبمەوە، دێوە، درنجە، خێوی کانیانە!

دەڵێم: خوایە گیان یان دەوا و دەرمانێک بۆ چاوانم، یان پەنا و پەسیوێک بۆ تاوانم. بەڵام نە ئاسەواری ئاشەکۆنێک حەشارم دەدا، نە پەساری

پردەڕووخاوێک باشارم دەکا! مامە گیان سەرکۆنەم مەکە، بە سۆنەم مەکە. هەستوخوستم نەبەزیوە، دەست و هەستم تەزیوە، بە هالاوی هووی گەرمی دەکەمەوە و ساوی دەدەمەوە. دەڵێم: با لە نێو قەفی پشتێنیدا پیرەڵۆک نەبێ، ترسی لە سەرما و بەستەڵۆک نەبێ، دەنا هەر وا بە دەستەکوتە مەودای ژیان بست بە بست دەپێوم، تا چاو هەتەر دەکا دەڕوانم لە شۆقێکی، لە شەبەقێکی بزەی باوێتە لێوم.

هەرچەند تۆف و تەزووی ڕەشەبا، ناتەبا بێ، هەرچەندی چزەی کزەی مەینەتی لە جێی لێوم دانابێ، دەبێ هەستم نەبەزێ، هەر دەستم بتەزێ!

دەڵێن ئاوات و ئارەزوو وەک خەونی هاڵۆز هاتی بە کاتە، وەدیهاتنی خەفەتە یام خەڵاتە. خوا بکا ئەو خەونە ئاڵۆزانەی کە نەتەوەکەمان دەیبینن و پێیەوە ڕادەپەڕن، وەدیهاتنەکەی خێر و خەڵات بێ. مامە گیان، بۆت هەیە بپرسی ئەوە دەڵێی چی؟ لە چی چینەی دەکەی؟ دەستیان لێوەشاندووی یام وڕێنەی دەکەی؟

باشی بۆ چووی، هێندم لەخۆڕا پێواوە، سەرم لێشێواوە. دەڵێم هەڵێم لە خێش، لە خەڵک، لە خۆمی بێکەلک. نازانم خەونە یان بەخەبەرم! بێدارم وا لە هەموو شت بێزارم! لێرەدا ناڵەی «نیما»ی نەماوم دێتەوە بنگوێ:

از پـش پنجـاهی و انـدی ز عمـر نعـره برمـی‌آیـدم از هـر رگـی
کـاش بـودم بـاز دور از هـر کـسی چــادری و گوســفندی و ســگی

دیارە «نیما» کەسی بەراوەژووی پێ لە ناکەس باشترە. ئەمنیش دەڵێم: یاخوا کەسی کەس خۆی ئاوەژوو نەکاتەوە، خۆی و خودا و خەڵکی لە بیر نەباتەوە. «نیما» کاتێ دەبینێ کەسوکار و کردەوە ناحەزە، وەڕەزە، داخوازی چادر و سەگ و پەزە. وەک «نیما» چادر و مەڕی بۆ حاڵی خۆی نەدی، ئەمنیش دووبەرەکی و شەڕم لە خێڵ و ماڵی خۆم نەدیبا، بەڵام چبکەم.

هەرکەس بە جۆرێ دڵم دەشکێنێ غەم و پەژارەم لە ژین دەخزێنێ
دوژمن بەجێیخۆ بەڵام دۆست بۆچی پەیمانی یاریم لەگەڵ دەپسێنێ

لە نیسێی دۆستان دەپرینگێتەوە
ئەستۆی بۆ ڕەقیب دادەسەپێنێ
نیفەکی نەیار دەدروێتەوە
شیرازەی خێزان هەڵدەوەشێنێ
هەرنەبێ خێڵێک بناغەی عێلێ
بە کوتکی زۆردار تێکدەڕووخێنێ
دەوران وەک بڵحی لە مێردی نەبان
لە من لالووتە و حەریف دەدوێنێ
کەلاوە دیدمم لە فرمێسکی ڕوون
کاسەی دڵ پڕە و خوێن دەدەلێنێ
هەناسەی‌ساردم هێندە هەڵکێشا
هالاوی هاوین هووم دەیتەزێنێ!

کاکە گیان، وتە و ورتەم زۆرە، سەری هەوداکە درێژە، بەڵان گلۆڵەی کلۆڵی بەرەو لێژە، نە ڕێگەی چنینم هەیە نە مەودای تەنین! دەزانم ئەوی دەبێتە خوری ریسەکەمە. ئەوەی بەتاڵوحەتاڵ، دارماڵە خێزەرەی بکا و ببێتە سەر عەیارەی لێوم. عەرەب دەڵێن: «احسن‌الکلام ماقلّ و دلّ»، ئەمنیش بە کوردی کردوومە بە قەللەودەللە، یانی هیچی بە سەر هیچەوە نەبێ. دەڵێن نەکیر و مونکیر چوونە لای خودا و گوتیان: قوربان کابرایەک مردووە نێوی «عەللامە سەبزەواری»یە، هەرچی لێی‌دەپرسین وەرامێکی دەداتەوە و ئێمە لێی حاڵی نابین دەڵێ چی؟

خوا فەرمووی: بڕۆن لێی‌گەڕێن، بەڵێ ئەوە «عەللامە سەبزەواری»یە! تا لە حەیاتدا بوو، ئەوەی دەیگوت و دەینووسی، ئەمنیش لێی حاڵی نەدەبووم.

ڕجام وایە ئەگەر یارانێکی لەو درێژدادرییەی من حاڵی نەبوون، دەڵێم بە خوام ببەخشن و لێمگەڕێن. ئامین یا ڕەبەلعالەمین.

## «حاجی سەید جەمیل» و «نووری»

ئەم هۆنراوەم لە وەرامی نامە و هۆنراوە جوانەکەی خاڵە «سـەید جـەمیل»دا نووسیوەتەوە:

### یادی خاڵە جەمیل

دڵ کەلاوی تۆف و تەم بـێ کوانـێ مـەیلی مـەی دەکـا
دەردی دووری هێنـد بەسـۆزە ناڵـەیی بـێنـەی دەکـا
سـەد ئەوەنـدمم داغ و دەردی ڕۆژگـاری دوون هـەبێ
یادی تۆ «خاڵـە جـەمیل» ڕێگـای مـورادم تـەی دەکـا
جەزبەیی دیداری تـۆ قـەت قـورب و بوعـدی بـۆ نیـە
تۆ لەوێ هوو هوو دەکەی، دڵ لێرەوە حەیحەی دەکـا
سەد خەزان بێ یا خەزەڵـوەر بـەرگی شـادیم نـاوەرێ
چون بەهاری پڕ لـە جوانیـت ژینـەوەم بـێوەی دەکـا
گەنجی دنیاشم هەبێ، بێ مـەیلی تـۆ هـەر بـێبەشـم
ئەو کەسەی زەینی بە دیـدارت گەشـە سـەرفەی دەکـا
مـن لـە یـەزدانی دەزانم خانـەقات خانـەی دڵـە
بۆیـە دیـندۆڕاو بـە پـڕتاو دێ لـەوێ تۆبـەی دەکـا
شێخی من تیغی جەفات جەرگم هەموو کـونکـون بکـا
ئەو دەمەی دڵ دادەمرکێ، دەسـرەوێ و ئۆخـەی دەکـا
دڵ کـە پەروانـەی شـەمی دیـداری تۆیـە بۆیـە دێ
لێوەلرفـەی نۆبەتێـدار ئـارەزووی سـۆبەی دەکـا
مـن بـە دیـداری بـەهاری تـۆ دەژیم مینـوو چیـە
هـۆگری ئـەو دیمەنـە کوانـێ هـەوای هۆبـەی دەکـا؟
شێخی و شاعیر بەڕاستی، هەم ئەدیبی، هەم «جەمیل»
پێم نەڵێی «نووری» لەخۆڕا دێ لە لام وسـتەی دەکـا؟

## وەرامی حاجی سەید جەمیل

ئەم هۆنراوەی خاڵە سەید جەمیل لە جوابی نامە و هۆنراوەکەی من نووسیبوویەوە، بە پێویستی دەزانم لێرەدا بۆ بیرەوەری بیهێنمەوە.

### دڵی دڵدار

دڵ و دڵدار وەکوو مەنجەڵ هەمیشە پڕ کوڵ و جۆشە
بڕۆ بەو ڕێیەدا ئەی دڵ هەتاکوو ماوی تێکۆشە

ئەگەر گەنجی ئەوین دەسخەی لە بەر پێی دابنێ گیانت
دەنا ناکڕدرێ هەرگیز بە پووڵ و پارە و قۆشە

خەیاڵی خاڵەکەی جارێ لە ناو چاوم گەڕا و ڕۆیی
دوو چاوم بۆیە پڕ ئاون، گلێنەم بۆیە ڕەشپۆشە

لەگەڵ مەیگێڕ و مەیخانە و مەی ونەی تاکوو کەی بدوێم
کە من تەنیا بە سایەی چاوەکانی تۆ دڵم خۆشە

بە دنیای بێوەفا هەڵنافریوێ قەت وەفاداری
کە دنیادیو و زانا و پێکراو و خاوەنی هۆشە

دڵم بۆ شیری شێعری «نووری» دەگریت و گڕوو دەگرێ
دەجا چیبوو ئەتۆش سینەت پڕە جارجارە بیدۆشە

«جەمیل» تاکوو لەگەڵ دڵبەر بەڕاستی ڕانەکێشی پێ
بەشت دەرد و غەم و ژەهراوە تاکوو دەمری بینۆشە

**ئەوەی دەیخوێننەوە، نووسەری بەڕێز کاک ئەحمەدی قازی لە سروەی ژمارە ۲۲۲دا بە چاپی گەیاندووە**

## هەنگامەی جەفەنگنامەی شاعیران

کاتێک دوو شاعیری خاوەن چێژ و زەوق بە شەوقەوە بە گیانی تەنز و شۆخی و جەفەنگەوە، هۆنە و نامە بۆ یەکتر دەنێرن، دنیایەکی تازەی دوورەغەم پێکدێنن و زۆر وردەکاری هونەری دەخولقێنن کە سەرنجی خوێنەری دڵتەڕی شێعرناس ڕادەکێشێ و جسناتەشێعرێک «ژانر» سەر هەڵدەدا کە دەبێتە چاشنی و مەزەی سەر سفرەی شێعر و ئەدەبی گەلان.

بەڕێز «حاجی سەید جەمیل» کە پێشتر شێعرمان لێ بلاو کردۆتەوە، هەموو کات دەگەڵ مامۆستای بەڕێز و ناسراو «محەممەدی نووری» لێک لە پێکۆڵن و ئەم جۆرە شێعرانە بۆ یەکتر دەنێرن و ئێمەش تا بگاتە دەستمان بە شانازییەوە بۆ ئەهلی زەوق بلاویان دەکەینەوە.

مامۆستا «نووری» دە نامەیەکدا بۆ بەرپرسی ئەم بەشە نووسیویەتی: «جارێکی حاجی سەید جەمیل ئەم هۆنراوەی ژێرەوەی بۆ ناردبووم، دەیزانی لەم دنیا پان و بەرینەدا هیچ کار و مەشخەڵەتێکم (اشتغال) نیە، لە بابی «ئیفتیعال»دا شەڕەمەتەڵۆکەی پێدەکردم و شێعری ژێرەوەی بۆ ناردبووم.

| | |
|---|---|
| هۆنەری مەشهووری گەلە و نووریە | ئیشتەهەرە یەشتەهیروو ئیشتیهار |
| چونکە گوتی دێم و نەهات بۆیە دڵ | ئینکەسەرە یەنکەسیروو ئینکیسار |
| باشە کە تاقیکەمەوە بەڵکە بێ | ئیختەبەرە یەختەبیروو ئیختیبار |
| بۆچی لە بۆکانی وەدەرناکەوی | ئینحەسەرە یەنحەسیروو ئینحیسار |
| ماوە کەمە بۆیە قسەم دوایی هات | ئیختەسەرە یەختەسیروو ئیختیسار |
| بۆیە جەمیل نایە نەخۆشە برا | ئیعتەزەرە یەعتەزیروو ئیعتیزار |

## وڵامی «نووری»

بەڕێز خاڵە سەید جەمیلی خۆشەویست:

ئەمن دەڵێم خواجەم! ئەتۆ دەڵێی خوا چەند زاڕۆڵەی داوێیەی! ئەمن دەڵێم لە دنیای «ئیشتەغەلە یەشتەغیل و ئیشتیغال» بێبەشم، لەبەر بێکاری مێشان دەخەسێنم، ئەتۆ دەڵێی وەرە جوانەگام بۆ بخەسێنە. جا بۆیە چونکە مەلەش نازانم، لە بەحری «ئیفتیعال»دا بڵقان دەخۆم و دەڵێم:

## قنە و وشکەغار

داومەتە دەست وشتری مەستی قەتار
ئیختەیەرە یەختەییروو ئیختیار
دیارە بە پووڵ و پلە و پارتییە
ئیعتەبەرە یەعتەبیروو ئیعتیبار
ئێمە لە نێو خەڵک و لەبازاڕ و بانک
ئیفتەقەرە یەفتەقیروو ئیفتیقار
باشە لە دەس سفتەیی بۆجێ و محەل
ئیستەتەرە یەستەتیروو ئیستیتار
قەند و قوماش زۆر و زەوەندە بەڵام
ئیحتەکەرە یەحتەکیروو ئیحتیکار
وەختە لە تاو کۆپینی سووتاو بکەم
ئیحتەکەرە، یەحتەکیروو ئیحتیکار
من لە تەڵەبکار و لەبەختی ڕەشم
ئینزەجەرە یەنزەجیروو ئینزیجار
نیوەیی بورجێ بە تەمای بورجی دی
اینتەزەرە یەنتەزیروو ئینتیزار
خۆزگە بە ئەو ڕۆژە چزەی تاسکەباب
ئینتەشەرە یەنتەشیروو ئینتیشار

ڕۆژێ کــــه بــــۆم تێربــــێ زگــــی لامەســــەب
ئینتەســــــەرە یەنتەســـــیروو ئینتیــــــسار
«کــــاوە» دەبـــوو کــــامی لــــە کــــاوێژ کــــەوێ
وا مــــــنی خــــستۆتە قنــــە و ویــــشکەغار

«کاوە»، نەوەی خوالێخۆشبوو شاعیری بەناوبانگ «سەید کامیلی ئیمـامی» (ئاوات) لەگەڵ «سەید جەمیل» هاوکاری شێعری کردووە.

## دیسان نامە و هۆنراوەیەکی شۆخی

پاش چەند جارێک کە «حاجی سەید جەمیل» بۆ «نووری» دەنووســێ لەگـەڵ «حاجی سەید عومەری هاشمی» بچینە مەهاباد و نەکرا ئەو دیدارە بکـەین. دوای ماوەیەک بێخەبەری «نووری» ئەم هۆنراوەی خوارەوە دەنووســێ و تاوانەکـەی داوێتە ئەستۆی «حاجی سەید عومەری هاشمی»

## ئەی ڕووتی چەند دزێوە

شــــێخەکەم ماوێکــــە هــــەر ناپرســــی لــــێم
هەڵــــــوەدام، ئاوارەمــــــە یــــــان نیــــشتەجێم
بــــێ‌هــــەواڵ هێــــشتووتمەوە ســــووچم چیــــە
یــــان خــــەتای ســــەید عومبــــەرە هاتۆتــــە پــــێم
هــــەر کــــوتم بــــا ســــەید عومــــەر بــــێ و پێکــــەوە
بێینــــە شــــاری، مــــن بەتــــەنیا چــــیم و کــــێم؟
ســــەید عومــــەر پێــــی وایــــە جــــەردە و ڕێگــــرم
خــــۆم مــــەلاس داوە لــــە گیرفــــانی خــــزێم
ئــــەی لــــە ڕووتی چەنــــد دزێــــوە خــــزم و خــــێش
ســــڵ دەبــــن لــــێم بۆیــــە مــــن ڕووتی دەگــــێم
مــــن لــــە داخــــی پــــۆزی عــــالی ســــەید عومــــەر
هێنــــد هەناســــەم ســــواره وەک مەشــــکەی دەژێم

کوا دراو و پووڵ و پارمم پێدەوێ
خانەقای خاڵە جەمیل بێ، خانەخوێم
لێمگەڕێ هەر شرتوگوم بم چاترە
هێندە ڕاکەم تا دەگیرێ هەر دوو گوێم
سەیرە دەوران قسری شادی و خۆشییە
من لە جێی وی هەردەمێ دەردێ دەزێم
هەر کوتم دەچمە مەهابادێ و زەمان
سەد گرێ و گۆڵەی دەخاتە دەست و پێم
بۆتە بەیتی مامە «هێمن» هاتنم
دێم و دێم و دێم و دێم و دێم و دێم

با لەشم نەکشێ بە دووەدا سەروەرم
خۆ لە بۆکانیش ئەتۆی تاجی سەرم

## له سەر گۆڕی «ئەحمەدی كۆر»

لەو سالانەی کە لە دێی عەمبار نیشتەجێ بووم، زۆر کاتی وابوو زەبروزەنگی زەمان، زمانی وتاری دەبەستم، لە هەستوخوست و هەرا و هوریای ژیانی دەخستم. ڕواڵەتی چەرمەسەری گەل و دیمەنی چەوسانەوەی کۆمەڵ، بیر و باوەڕ و بۆچوونیان دەشڵەژاندم و هورووژمیان بۆ دەهێنام تا ڕۆژێکی لای ئێوارێ:

نیسێی دێوەزمەی غەم و پەژارە
سواری سەرم بوون سەر لە ئێوارە
ڕێچکەی شالاوی خەیالاتی دوور
بیریان کێشامە دەریای بێسنوور
دنیای بێدەنگی و دیاری خامۆشان
مەڵبەندی خێڵی ڕێک کفنپۆشان

پێڵاوم لە پێکرد و بەرەو گۆڕستانی دێ و شارستانی ئەڕواح وەڕێکەوتم:

مەزرای مەزاری گیانی بێهەواڵ
دنیای بێکاتی ڕۆژ و مانگ و ساڵ
کۆزیلکەی گیانی ئازا و سەربەخۆ
بێ حەیف و مەیلی دیاری گلکۆ
بێدەنگ و ئارام دوور لە غەوغای ژین
شاری ئاواڵەی بێ دەرک و پەرژین
خێڵی کۆچکردووی بە تویێ کراسێک
بێدەنگ و هەرا، بێ باس و خواسێک
کۆمەڵەی یەکڕەنگ خێڵی سەلاح بوون
دەتگوت چاوەڕێی حەشری ئەڕواح بوون

بەشم بە لەش و بەدەن و پێستەوە نەمابوو، گیانێکی ڕەوان بووم، گۆڕ بە گۆڕ دەدوام و دەلوام، هەتا گەیشتمە گۆڕخانە گلێنەکەی «ئەحمەدی کۆر» کە ساڵەها بوو لە دنیا بەزیبوو، ئاو و گڵ هێنابووی لە گۆڕستانی دێی «عەمبار» لە خاک خزیبوو، چواردەورەی چارداخی بەشخوراوەکانی لە مان و ژیان هەڵبڕاوەکان بوو. ئەحمەدی کۆرێکی دوا مەرگی دنیای عیرفان و سەیر و سلووکی عارفانەی بە زمانی شێعر و مناجات بە دیدەی دەروون ڕوون کردەوە، ئەمنی لاڵ بە زمانی حاڵ گلۆڵەی هاڵۆزی سەدسەری خۆم لە بن کێلی مەزارەکەی دانا و گوتم:

## سڵاو لە تۆ «ئەحمەدی کۆر»

سڵاو لە تۆ ئەحمەدی کۆر
خۆزگەم بە خۆت کە نەتدی زۆر

لە چنگ ژینی سەرشۆڕی خۆم
میوانی کۆڕی گۆڕی تۆم

وەک یەک چێشتمان تامی تاڵی
تۆ بە کوێری و من بە لاڵی

وەک یەک لێمان گیرا کەڵک
تۆ بۆ خوا و من بۆ خەڵک

هەردووک وەکیەک لە غەم بارین
مردوو و زیندوویی عەمبارین

دەکرێ ئەوجار چاو هەڵێنی
کۆڕی دڵکوێران بدوێنی

چاوعوقابی خۆشخەبەر بووی
تۆ ناڵەی شام و سەحەر بووی

بڵێ لەکوێن خاوەن چاوان
بە زیندوویی بەشخوراوان

کوێران بۆ دیمەن بیناکەی
لاڵان بۆ وتار گۆیاکەی

تاڵی و سوێریت زۆر چێژیوە
تۆ بە کوێری زۆرت دیوە

لە ژیندا بۆ لاڵ و کوێربین
بۆ چاوەڕێی چاکە و خێربین

کاتێک سەربەست و ئازاد بن
من دەسرەوم، ئێوە شادبن

جوابی زۆردار مەدەنەوە
لاسای مردووان مەکەنەوە

کاتێک ڕوانیم ڕۆژ ئاوا بوو
مردوو سەریان دەرهێنابوو

پێم وابوو حەشرە وەستاون
لە دەورەمان ڕاوەستاون

لەم دنیایەی چوومە دەرێ
بێنەردیوان چوومە سەرێ

له وەرامی نامەیەکی دوور و درێژی «حاجی سەید ئەنوەری هاشمی» کە لە شاری کەرەجەوە نووسیبووی، ئەم هۆنراوەی خوارەوەم نووسی و بۆم ناردەوە:

## هەر لێرەوە هەتا کەرەج

ئەوەندەی چێو و زیخی چۆم و بەستێن
ئەوەندەی دوود و گازی چەرخ و ماشێن

ئەوەندەی گیاوگوڵ شین بوون لە دۆڵان
ئەوەندەی زیندەوەر دەبزوون لە کێوان

ئەوەندەی تەقەڵی دەدرێ لە لێفان
ئەوەندەی ماشەری ڕیشی خەلیفان

ئەوەندەی بزنەمووی دەژوێن لە لێڕان
ئەوەندەی بەرگنی دەکوتن بگێڕان

لە ڕێی بۆکانەوە تا شاری «سەقز»
مەکۆی سمتی خڕ و ناز و قڕ و ق...

لە بانی «هۆبەتوو»، «دیواندەرە»ش پاک
بە گۆڕخانە و مەزار و پیر و پیاوچاک

دەسووڕێم دەستەچەپ تا شاری «بیجار»
بە بێ‌هەست پێنەزانێ لۆتی قەففار

بناری «هەشتەرۆ» تا چۆمی «زەنگان»
بە وێرغە و تەقڵە و باز و هەلینگدان

بە قۆرغ و بێشە و بەیتوون و بژوێن
بە «تاکستان»ەوە تا شاری «قەزوێن»

لە وێڕا پێ‌بەپێ تا دەشتی «ئابێک»

نەوەستێ ئەسپی چاپارم سەعاتێک

هەتا شاری «کەرەج» کووچەی «پەرەستوو»
بەپێوان بستبەبست بستوو بە بستوو

هەمووی دۆعا و سڵاوی گەرم و گوڕ بێ
بە پیرۆزە و بە ئەڵماس و بە دوڕ بێ

لە دەوری «خاڵە ئەنوەر» ببنە پەرژین
لە من دۆعا و لە وانیش ڕەببی ئامین

بمێنی و هەر بژی تا هەی وەجاغ بی
وەجاغزادەی من و یارانی ساغ بی

ئەگەرچی زۆر گرانە دەردی دووری
بە یادی تۆ دەژی تا ماوە «نووری»

## هەمبانەی درۆ

هۆنراوەیەکی شۆخی و جەفەنگە بۆ دووسێ ئاواڵی خۆشەویستی خۆم نووسیبوو کە وادەیان دابوو تەسبیح و پێنووسم بۆ بنێرن و نەیانناردن:

## هەمبانەی درۆ

ئەو کەسەی وادەی دەدا و نایباتە سەر
گوێز لە هەمبانەی درۆ دێنێتە دەر
بێسەمەر چاوت لە وادەی وا نەبێ
داری بێدارە بەڵام ناهێنێ بەر
قەند و تەسبیحی منە قووتی دەدەن
کاکە «سەعد» و کاکە «عەولا» وەک کەوەر
کامە ئەوڕادە بە تەسبێحمی دەخەی
ئەی وەکوو سۆفیان لە یەزدان بێخەبەر
باغ و بێستان و چەوەندەرتان کەمە
وا دەخۆن ماڵی منی ڕووتی تەتەر
هەر دوو لاو و هەر دوو پیاون سەد حەیف
وادەتان بێ شوێنەوار دەڕواتە سەر
کا «حەمەد»ئاغاش دەزانم فێڵ لە فێڵیدا دەکا
نیوەکاریشی نەدامێ خواردی وەک شیر و شەکەر
شیر و تیری شاعیران مەدحە وە یا هەجوە هەمووی
گا وەکوو ڕمبی چەقیوە گا دەفیزێ وەک فەنەر
دەرکی سولحێ با نەبەستین شەڕفرۆشی چا نیە
هەر کەسەی وادێکی داوە وەک کەلان بیباتەسەر

بەڵان بەو هەڕەشە و گوڕەشانەشەوە نەیانناردن و خواردیان وەک گەزۆ و مازوو. کاڵەم دڕا چم پێنەبرا.

هۆنراوەیەکی «حاجی سەید جەمیل» لە جوابی نامەیەکی «نووری»دا

## شەهیدی عیشق

بە غەیری شۆری عیشقی تـۆ بەشـی زۆر و کـەمم نـاویَ
خەزێنەی غەزنەوی و تاجی کەی و کەیخوسـرەوم نـاویَ

دەمیَ ڕووی تـۆ لــە مـن بێـت و ببـزوێنی بـزەی لێـوت
بـــەهاران پێکـــەنینی غونچـــە و مـــاچی دەمـــم نـــاویَ

بە تیشکی ڕووی لە ڕۆژ ڕوونـاکترت مالـّـی دلـّـم ڕوونـە
فتیلە و چلچـرا و نوورئەفکـەن و بـەرق و شـەمم نـاویَ

لە «جەمشید» و «کلنتۆن» کوا منـەتبارم کـە تـۆم دیـوە
قریوەی فیلمی مـاهوارە و جـەلای جـامی جـەمم نـاویَ

کە دەڕوانم لە هەر لا چاو و پرچـی تـۆم لــە بـەر چـاوە
تەماشـای نێرگـسی شـەهلا و ئـالا و پەرچـەمم نـاویَ

«جـەمیل» کـوژراوی ڕێبـازی ئـەوینی دلـّـبەری خـۆتی
شـەهیدی عیـشقم و شـۆران و کفـن و ماتـەمم نـاویَ

کە«نووری» ڕووی دەمی شێعری لەگەڵ من بیَ دەمیَ بەسمە
لەمـەولا ژیـنی پـڕ ژان و هـەل و کـات و دەمـم نـاویَ

ئەم هۆنراوە لە جوابی نامە و هۆنراوەیەکی مندا نووسـراوە کـە بەداخـەوە نامە و هۆنراوەکەی خۆم بەدەستەوە نیە تا ئەویشم نووسیباوە.

# دز و خاوەن‌ماڵ

نازانم بۆچی دڵ لێرە بەندە    کەس ناڵێ خاڵۆ کەرت بە چەندە
ئەوەندەی دیومە ساردی لە یاران    نەمدیوە سڕی لە بەفر و باران
گلۆڵەی ژینم کەوتۆتە لێژی    ترکەگیان تۆ بۆ خاسم ناوێژی
سێ‌هەزار ساڵە لەم هەردە گیرم    بە ئاو و هەوای ئەم خاکە ژیرم
سێ‌هەزار ساڵە نەژادی ئاریام    لە ئێرانزەمین ئاریایی ژیام
تۆرەمەی مادم بە عەسڵ و ڕەسەن    ترکە پێم‌دەڵێ «سەن هاراڵی‌سەن»
بە دەورمدا دێ بە فڕوفیشاڵ    بۆتە نەقڵەکەی دز و خاوەن‌ماڵ
جا وەرە توخوا چاو نەبارێنێ    خلە شێوی کا، بلە دایچێنێ
بێ‌هۆ ژیانم لە خۆم حەرام کرد    کەس گوێی‌نەدامێ چەندی هەرام کرد
هاواری «هێمن» هووریای «هەژار»    لە شاخ و کێو و بەرپاڵ و بنار
لە گوێی زەمانا دەزرینگێتەوە    نەیار لە سامیان دەپرینگێتەوە
تۆ بۆچی هەستت لە خۆ بڕیوە    لۆکەی بێ‌دەنگیت لە گوێ خنیوە
کوا وا بوو «هەژار» بڕوا لە ترسان    «هێمن»ڕەنگی زەرد، هەڵێ لە برسان
برسی و ترسی گەل ئاوارەی کردن    هەر بەو داخەوە ژیان تا مردن
«ئاوات» ئاواتی بەرزی وڵات بوو    تامەزرۆی گەلی بەدەسەڵات بوو
«سوارە» بەپێیان هەرێم‌پشکن بوو    چقڵی نێوچاوی خێڵی دوژمن بوو
«هێدی» هەڵوەدای بەشی خوراوە    کوا لە جەم زیزە و لە گەل تۆراوە
مام هێدی و نووری لەیاران جێماو    شوێنگێڕی وانن هەنگاو بە هەنگاو
هێدی لە هەولێر گێرەی دەگێڕێ    «نووری» بە بێ‌هەو لێرەی دەگێڕێ
زۆرن ئەوانەی گیانفیدای گەلن    دوور لە نیشتمان چاوەڕێی هەلن
ڕۆڵەی نەبەزی ئەم ئاو و خاکەن    وێڵی ئازادی ئەم خاکە پاکەن
ویست و ئاواتی گەل و نیشتمان    ڕادەگەیەنن بە نێو و نیشان
مێر و مەلا و شێخ، پیرەپیاوەکان    لەو شار بۆ ئەو شار ژێرەلاوکان
هەڵوەدای هەردی بەش‌بەش‌کراون    تۆرەمەی «ماد»ن، میرات‌خوراون
تێکڕایان دەڵێن بە هەزار داستان    بمێنێ کورد و بژی کوردستان

## یادێک لە زادگا

ژیان هەر چەندێک دوورودرێژ بێ و لێک بڕەوێتەوە، ناکرێ بیرەوەرییەکانی دەورانی منداڵی لە کۆزەرەی ڕەنگاوڕەنگی ژیاندا بەسەر نەکاتەوە و تاڵ و شیرینی کات و ساتە گوزەراوەکان نەخاتەوە بەر زەینی خۆی. دەورانی تێگەیشتن و پێگەیشتنی کاتی منداڵی، لە ئاسمانی خەیاڵ و هەواڵیدا هێندە ڕووناکە کە لە تەواوی تێپەڕی تەمەنیدا دیمەنەکانی هەر دەدرەوشێنەوە و گەشەدارن. ئەو مەڵبەندەی تێیدا گووراوە و تێیدا گۆڕاوە، هیچ کاتێک لە خەیاڵیدا ناکوژێتەوە.

هەر ئەم هەستوخوستە بوو کە هۆنراوەی «یادێک لە زادگا» هەرەسی خستە نێو ڕەوان و دەروونمەوە و لە لێواری زار و زمانەوە سەرڕێژی کرد و شێلاوگەی بەست و هەڵڕژا بە نێو مەزاری ویشکەڕۆی تەمەنی پیریمەوە:

### یادێک لە زادگا

مەڵبەندی ژیان و جێی بیرەوەریم
ڕۆژگاری خۆشی بێدەردیسەریم
بەهاری سەوزی شلکی و خاویم
هەوارەبەرزەی دەورانی لاویم
ڕەوڕەوەی هەست و ژیانی دڵگیرم
وەک خەونی هاڵۆز دێتەوە بیرم
دێی کڵۆڵان و لانکەی گوڵان بوو
باغچۆڵە و مێرگ و رووگەی دڵان بوو
کووچە و کۆڵان و ڕێچکەی منداڵیم
دەخزێنە زەینی دوا حەفتاساڵیم
زەردەی ڕۆژهەڵات، کاتێ خۆر هەڵدێ
لە لووتکەی «سەراج» دەپژێتە ناودێ
کێوی «کۆڕەگیسک» هەروا چەقیوە
بۆ ڕۆژئاوای دێ پەنا و پەسیوە

مــــەزرای گـــوڵان و بـــاغی مـــیرانی
هــــەر قیبلـــە مـــاون بـــۆ ئـــاوەدانی
لـــە قـــەڵای خـــوارێ و لـــە قـــەڵای ســـەرێ
پـــۆلپـــۆل پـــەریزاد هـــەر دێنـــەدەرێ
هـــەروا وەک خۆیـــان شـــۆخ و شـــەنگ مـــاون
تەپکـــەی بـــێدانـــەی پەرچـــەمی خـــاون
لەبـــەر بـــێلا و کۆشـــک و تـــەلاران
هەر بە سیلەی چـاو دەدوێـن وەک جـاران
ڕاوچـــی نێوســـیپەن بـــە برژانگـــی تـــیر
دەپـــێکن جـــەرگ و هـــەناوی نـــێچیر
ئاغـــا و نۆکـــەری خەنجـــەر لـــە کەمـــەر
لـــە پەنجـــەرانڕا ســـەریان دێتـــەدەر
کـــانی کارخانـــان وەک خـــۆی خـــوڕ مـــاوە
کانگـــەی چاوبڕکـــەی کیـــژ و کـــوڕ مـــاوە
تاق و جووت ئاسکی گـۆزە لـە سـەر شـان
بە لەنجەی کوڕکوژ بـە تەقەی کەوشـان
کـــاتی ئێـــواران ڕۆژپـــەڕی هـــەتاو
بـــە ســـەرچاوانـدا هـــەر داوێـــن هـــەنگاو
ژوان و چاوبـــڕکێ و بـــزەی ســـەرلێوان
هـــەر وەک خـــۆی باوە لای نـــوێژیشێوان
ســـــەیزادەکەوێ و خاتووپــــــەریخان
لـــە کووچـــەی دێدا کـــۆڕن ئێـــواران
هـــەر هەواڵپرســـن لـــە بۆرەســـواران
دەرمـــانی شـــەوتێی نۆبەتێـــداران
کابـــانی مـــاڵان ڕادەگەیـــەنن
قیـــڕەی قـــشقەڕان میـــوانی دێـــنن
مـــامر بخوێنـــێ لای نـــوێژیشـــێوان
نـــاخۆش خەبـــەرێک دەهێـــنن میـــوان
دەبـــێ ســـەربڕی لێـــی ڕانەوەســـتی
لە دەرکـەی هەڵسووی خـوێنی بـە مـستی

حوجرەی فەقێیان لە پاڵ مزگەوتە
چواریان موستەعید، سووختەیان حەوتە
مامۆستای زانای مزگەوت و میحراب
مەلاوەهابە، ڕێنوێنی سەواب
پۆلی کەیخودا و ریشسپی جاران
لە حەوزی بەردێ کۆڕن ئێواران
جەفەنگ و گاڵتەی پیرەپیاوەکان
دامە و ڕیزێنی شۆڕەلاوەکان
درێژەی هەیە باس و ڕاوێژیان
لە قەراغ حەوز و سەر تاتەنوێژیان
ئاوی خڕاوکەی حەوزی بەرماڵان
شیوەڵەی خواردێی کردۆتە داڵان
چۆڕچۆڕە دەتکێ وەک فرمێسکی چاو
بۆ سەر ڕوومەتی گوڵی قەتیس ماو
ڕێی ئاشی شێخی و پێچپێچەکانی
هەر سینەکێشن تا کوێرەکانی
قەفی پێچپێچی ڕێگەی ئاڵمەڵوو
بە لابەلادا وەک شووخاڵی شوو
دەخزێ و پێچ دەخوا تا دەگاتە خوار
شانەوشانی کێو هەتا بەربنار
چاکی «زەکەریا» و داربووزەکانی
ڕەشماری ماوە بۆ پاسەوانی
قەف دەخواتەوە هەر وەکوو جاران
لە دەوری قسن و سێبەری داران
چاکی «پیربادین» هەر پیری بایە
بۆ بادارەکان کانگای شیفایە
ڕۆژی چوارشەممان بندارەکانی
دەسڕن ئارەقەی ڕێبوارەکانی
چلدانە و قسن و کێلی مەزاری

هـــەر فالـــی خێـــری دڵـــە و دڵـــداری
لەگـــەگ هـــەر لـــەوێن مالـــی حەقیانـــە
لـــە ســـەر دارەکـــان تەقەتەقیانـــە
قـــەڵای «قۆزلـــوێ» هـــەر قـــۆزە لـــەوێ
لەگـــەڵ ئەســـتێران هـــاوڕازە شـــەوێ
شـــوورەی دیـــوار و داڵان و هـــەیوان
دەخاتـــە زەیـــنی ڕێبـــواری لێـــزان
لـــە کـــام دەوراندا بنیـــات کـــراوە
بـــیری زەمانـــە تێـــیدا ســـوڕماوە
بـــەردی بناغـــەی ســـابات و ســـەرای
ئـــەو کرۆماتییـــەی بـــێدەنـــگ و هـــەرای
چەنـــد مـــیر و مـــەزنی تـــێدا گـــەوزیون
چەنـــد پێوەندلـــەپێ تێـــیدا لـــەرزیون
قـــەڵای قۆزلـــوێ، قـــەڵای قۆزلـــوێ
هـــەزاران ساڵـــە هـــەر قـــۆزە لـــەوێ
دەخزێتـــە قـــەڵا زەردەی بەربـــەیان
تـــا «قـــەرەقا»یـــە دەکـــشێ شانەوشـــان
بـــزەی گزینگـــی ســـەر لـــە بـــەیانی
دەمـــژێ شـــەونمی پەلکـــەی گـــوڵانی
قـــەرەقا ئێـــستاش وەک «باســـکی هـــاوار»
دەخاتـــە عاسمـــان ســـەرنجی ڕێبـــوار
ئـــەو گابەردانـــەی لـــە پاڵـــی کێـــودان
دەڵـــێی بێوەڵـــەن لـــە کۆشـــی دێـــودان
وەک ســـوار و پیـــادەی نێـــو دۆڵ و شـــیون
هێنـــدێ پاڵـــکەوتوو، هێنـــدێ چـــەقیون
تـــل نـــاخۆن هـــەروا مـــۆن و غـــەزریون
گیـــانی دێوەزمـــەی لـــە لـــەش ڕەویـــون

.....................................

## نووسراوەیەکی «یۆسف عەسکەری» لەسەر هۆنراوەیەکی «نووری»
## سەرنامەم بە ناوی تۆ خودایە

نازانم لەسەر «نووری» بنووسم یان لەسەر شێعرەکانی، هەرچەند شیاوی باسکردنی هیچیان نیم. چونکە نووری بە چەرخ و خولی زەمانە هێندە خاو بای نەخواردووە کە بە مەکووکی خولی هەوداپساوی بیری من تانوپۆی ژیان و شێعری بچندرێ و تەنانەت بتوانم لێشی بدوێم.

«نووری» بە ڕواڵەت پیرێکی جوانی ڕەزاسووکی خوێنشیرینە، ئەو پەپوولە زێڕەیە کە هەستی نەسرەوتووی گوڵ و گیا دەدرکێنێ؛ وەکی دیش کەسێکە کە هێدی و بەئەسپایی مەودای ژیانی پڕ لە ناخۆشی و چەرمەسەری تا ئێرەی بڕیوە و بە وورەی بەرز و قایمەوە بەرەو ڕۆچنەی نەجات، بست بە بست ئەم ڕێ پڕ لە نەهامەتی و ناکامی و نامرادییە دەپێوێ. خۆی کوتەنی:

هەزار ئاواتی شیرینم لە بێستوونی جەفا نەخشا
ئەوەی فەرهاد بە تیشەی کرد، هەڵمکەند من بە نینۆکم

«نووری» یادگاری کۆمار و مەکتەبەکەی «سەیفولقوزات»ە کە بە چاوێکی تیژ و وردبینەوە سیلەی لە ئاسۆی ئامانجی نەتەوەکەی گرتووە. هەزاران ڕەمز و ڕاز کە لە دەروونیدا قەتیس ماون، زمانیان پێدەگرێ و دەیانخاتە ناو بێشکەی نەرم و بلاوێنی شێعری کوردی.

ئەگەرچی «لە سەر بستووی ژیان وەک داری چاکی
بەتەنیا مایەوە بێبەرگ و بێبەر»

بەڵام لە نێو دڵی گەلەکەیدا ڕەگاژۆی کردووە، شێوەیەکی باشی لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا بۆخۆی تەرخان کردووە. نووسین و دوان لەسەر ئەم زاتە و ئەم بیرە ژیرە، نە کاری منە و نە مەودای ئەم دەرفەتە. هیوادارم مرۆی وردبین بە ئارەزوو ئەم کارە بکەن.

ئومێدم وایە خودا ئەم بەرەکەتەمان بۆ بپارێزێ و ئەویش بە حەز و مەبەستی خۆی بگا.

پێنج‌خشتەکی «یۆسف عەسکەری» لە سەر غەزەلێکی «نووری»:

## چاوەڕێم یان چاوە ڕێم

هەڵدەکەوێ بێیە وتە جاروبار
بۆ وتنی وەسفی قەد و زولفی یار
دەردی ئەوین، حەسرەتی لێوی بەبار
«تامی دەچێ واتە کە دەیجووی بە زار
جوانە لە ڕێی دیدەوە بتکێتە خوار»

زەرد و نەخۆش، گردەنشین دڵ بەسوێم
من لە ڕەشی تالعی خۆم نادوێم
لالە زەمان ڕێی قسە گیراوە لێم
«بۆ وتە و هەستی دەروون چاوەڕێم
بەستەڵەکە گیانە هەرێمی وتار»

زەردەخەنەت دێت و دڵی من دەبا
گۆشەیی چاوت حەزی من پڕ دەکا
غەمزە بەسە تاکوو کەست تێنەگا
«تا نەتەوێ پێ بە هەواڵان نەبا
هەر بە بزەی لێو و بە چاوانە کار»

پڕپڕی هەستە تەل و ژێ و سۆزی ساز
چەندە قەتیس ما لە دڵ ئاوات و ڕاز
حەستەمە درکاندنی دەردی نیاز
«نایەوێ هەڵکاتە زەمان ڕاز و خواز
هەر ئەوە خۆی باسە لە سەر لێوە بار»

بولبولە دەگری لە جەفا دەمبەدەم
چەشنی پەپوولە دەچزێ شەو بە شەم
تا لە وزە و چێژی جەفا و دەرد و خەم
«زەردەیی تاوی کە مژی گوڵبەدەم
گەشکە دەبێ بولبولی شێتی هەژار»

ئاوی ژیان زایەوە دۆڵ و دەران
بەفر و سەهۆڵ توانەوە بەو ئەخگەران
تیشکە بلیند، کورتە دەسی سێبەران
«تاوی هومێدێ کە پژایە سەران
دیارە نسێ دادەسەپێتە نسار»

فەسڵی بەهارە و دەمی عەیش و سەفا
پەرچەمی سەوزە دەشەکێنێ سەبا
پڕ لە هومێدە دڵ و سەر پڕ هەوا
«مانەوەیە و هەستی ژیانە و بەقا
من بە تەما و تۆش بە شنەی بای بەهار»

مێشک و دڵم پڕ لە هەزاران گروون
ڕێگەیی ژینم پڕی چقڵ و دڕوون
گەرچی کەنەفت کەوتم و پیر و زەبوون
«داری لە سەر بەردی نەمێنێ دەروون
نایکەمە حاشاری مڵە و مشک و مار»

باوەڕی من نایەتە جەغزی نەمان
بەرزی و سەربەرزییە هەر شەرتی مان
پاشی هەزار گۆڵمەز و پەندی زەمان
«بەرگ و بەری پاکی بەرێ بای خەزان
هەر بە تەمای ژیانەوەیە پیرەدار»

## «ئاسۆ» و «نووری»

لەم ئاخرییانەدا هۆنەری بەڕێز کاک «سەعیدی نەججاڕی» (ئاسۆ) بە بۆنەی جێژنی زەماوەندی «چیا»ی کوڕی، کارتی دەعوەتی بۆ ناردم. بەداخەوە بە هۆی نەخۆشی و لەشبەباری نەمتوانی لە جێژنەکەدا بەشداری بکەم و ئەم هۆنراوەی خوارەوەم کردە دیاری بۆ «چیا» و ئاسکۆڵەی هەڵگوردی ئاسۆی.

## ئاسۆی خۆشەویست

پەرژینی پیری و تەیمانی تەمەن
دیمەنی تووڕەی دنیای ناڕەسەن

هەناسەی سوار و هەنگاوی بێهێز
بیری شێوا و باوەڕی بێپێز

تێکرا سەرباری ڕۆژگاری ژیانن
هاتوون میوانن، تالانچی گیانن

ئەگەر ماوەم بێ هەڵدێم یەکجاری
بۆ ئاسۆ و چیای نێو کوردەواری

هەر بژی ئاسۆی سەربەرزی چیا
بۆ پەنای کوردی لە خۆشی جیا

لە ئاسۆی هیوا و چیای مەڵبەندم
شەرتە هەتا هەم نەپسێ پەیوەندم

## شاعیری عەرەب دەڵێ

ففی قبضی کف الطفل عند میلاده دلیل علی الحرص المرکب فی الحی
وفی بسطه یوم الممات اشاره الا فاعلمو انی خرجت بلا شی

## کوردێک (نووری) لاسای دەکاتەوە

لەپی قووچاوی کۆرپە کاتی بوونی نیشانی تێکەڵی توندە لە ژینا
لە کاتی مردنا دەستی بڵاوی دەڵێ: هەر با بە دەستیم پێیە، چی نا

## چەند چوارینەیەک

زەمانە هەردەمێ ڕەنگێ دەڕێژێ هەچەندی مەینەتە بە منی دەچێژێ
هومێدێکی لە ژینا پێک نەهێنام هەزار هیوام بە ڕۆژێکی دەنێژێ

کە دنیا پڕ لە خۆشی بێ و لە شادی گوڵاڵان شین بکا وادی بە وادی
هەموو کەس پێی خەنی بێ بەشبەشی کەن بەشی من مەینەتە و هەر نامرادی

نەوایی دڵتەزێنی ڕۆژگارم کڵی سووتاوی دواکۆچی هەوارم
تکەی فرمێسکی چاوی چاوەڕێیان شەمی خامۆشی بن کێلی مەزارم

هەچەندی ڕێی هومێدم بەستەڵەک بێ غەمی دنیا لە سەر شانم کەڵەک بێ
دەبێ هەنگاوی هیوام توندوتیژ کەم نەیار با هەر لە دووم بکشێ یەدەک بێ

گیانەکەم لەحزە دەڕۆیین زۆروکەم من لە بن دیواری کۆنی ساڵەکان
وەک مەلی یەخسیری باڵوپەڕ شکاو چاو لە ڕێچکەی تێپەڕی ئاواڵەکان

هێندە هیوا هات و ڕۆیی بێسەمەر چاوەڕێی داهاتی دوور و بەربلاو
وەک هەناسەی ساردی زستانی بەسۆز بۆ سەهۆڵی بێبزەی لێوی هەتاو

## درۆو هەر درۆوە

گوڵ جوانە لە هەر وڵاتێ شین بێ   سەر شاخ و ڕەوەز بێ یا زەوین بێ
هەر درۆوە درۆو بە خوو و خەسڵەت   ئاودێری پەری بێ، ئاوی ژین بێ
کوانێ نەتەوی بە گوڵ حیسابە   هەر درۆوە درۆو، ئەوەت یەقین بێ

## نەتەوەی نەتەوی

من تا نەتەوەی خۆم نەتەوی بێ   سەر دیارە دەبێ شۆڕ و نەوی بێ
ئەو ڕۆژە دەبێ کفنێ لەبەرکەی   چاوت لە دمم و ویستی ئەوی بێ

## جێژنی مانگی ڕۆژووان و نەورۆز هاوکات بوون،
## ئاوام پیرۆزبایی لە دۆستێکم کرد

جێژنی سەری ساڵ و مانگی ڕۆژوان   یادگاری بەپیتی خەڵک و یەزدان
هەر ساڵێ کە دێن بە خێر و خۆشی   پیرۆز بێ لە خۆت و خاو خێزان

## بۆ مامە شێخ

هەتا تۆ مامەشێخ چاوت لە من بێ   مەکە باوەڕ کە یەزدانت لە کن بێ
دڵێکی جێی خەو و شەو بێ و ئەم و ئەو   لە خوارێ جێی دەکەن، نابێ مەزن بێ

## قاقای دێوەزمە

کاتێک دوورهەنگێوی دیدە ڕێژنەی دەکا و دەبارێنێ، بڕوانە لووتکەی بەرز و تیرەشانی کێوەکان. مژی خەفەت دەوری داوە، تەمی نەگبەت تێی‌هالاوە. بڕوانە پێپلیکانی فێڵی خێڵی دێوەکان، دێوەزمەی شاخان تەندوورەزەنان بریسکەی بریقەی ددانی چزووی کوێرەماری زمانی ڕادەخوشێ و تێکدەخوڕێ، چەخماخەی تیری هەڵمەتی کەوانەی دەکات و گیانێک دەپێکێ، ژیانێک و گیانێکی بێهەستوخوست دەکا. گەمارۆی هەور و هەڵا دوا ڕەگباری دەرد و بەڵا دەپرینگێتەوە، شاخ و ڕەوەز لە قاقای پێکەنینی دێوەزمە دەزرینگێتەوە، ئەوەی نایە و نەماوە، هەستی پشووی هەناسەیە، ئەوەی ماوە، بەجێ ماوە، لینگە پێلاوێکی پیاسەیە. جا بۆیە دێوەزمە هەڵدەبەزێ و جێژنەی دەکا و دیدەی دوورهەنگێو دەبارێنێ و ڕێژنەی دەکا.

## بیرەوەرییەکانم

لە بیرم ناچنەوە ئەی مەلە ڕەویوەکانی پاییزەوەرزی بەرەو خەزەڵوەر و گەڵاڕێزانی تین و تەمەنم، هەر پێتانەوە دەژیم.

بیرەوەرییەکان، دەزانم لە پێدەشت و بەربنار و دوندی چیاکانی ژیان، چەندە پێشێلی گەردەلوول و گێژەڵووکەی ڕەوتی زەمان و زامی دەوران بوون.

لە بیرم ناچنەوە، دەمدی پێپێ و ڕێچکەی دیار و نادیاری هەرێمی هیوا و هومێدی پێکنەهاتوو گەز دەکەن، دەیپێون و نایگەنێ، بەڵام نەوەستان و نەبەزین.

هەر پێتانەوە دەژیم

ئەوا وەک خەونی هاڵۆزی لە خەو ڕاپەڕیوەکانی شەوگاری ڕەشی بێپسانەوە دەخزێنەوە زەینی زنەی کانیلکەی هەستوخوستی وەنەوزی مەبەستەکانم.

لە بیرم ناچنەوە

هەر پێتانەوە دەژیم

هەر چاوەڕوانتانم.

ڕۆژی هەینی ۱۲ی مانگی خاکەلێوەی ساڵی ۱۳۸٤ لە شاری بۆکان لە حاڵێکدا نەخۆش و لەشبەباری گەمارۆی ژیان و گیانی ڕوو وەئاوابوونیان داوم، توانیم هێندێک لە هۆنراوەکانم کە بە دەستەوە مابوون لێرە بە یاری دۆستان و برایانی ئەدەبدۆست بیانکەمە ئەم سیپارە کە دەیخوێننەوە.

محەممەد نووری، بۆکان ۱۳۸٤/۱/۱۲

ئەم شێعر و نووسینانەی لای خوارەوە، پێش چاپی ئەم بەرهەمە کەوتنە بەر دەستمان. بۆیە بە پێویستمان زانی بڵاویان بکەینەوە

## بۆ ئەستێرەی سەربەرزی ڕۆژنامەی (کوردستان) پێشکەش دەکرێ

بە دڵێکی هێز و دەروونێکی پڕ لە خۆشی و بەشارەتەوە دەرکەوتنی ڕۆژنامەی خۆشەویستی کوردستانوو لێ پیرۆز ئەکەم. بۆ خۆم لە خۆم ئەپرسم بۆچی وایە؟ بۆچی هەرچی ئەیبینم خەریکم لە خۆشی‌دا ڕەشایی نوختەکانی بە ڕەشکێنەی چاوم داپۆشم؟ لەبەر چی وای ئەی کوردستان؟ چونکە ئەتۆ مانگی مەه ئابادی کە لە مەهابادێ هەڵاتووی و مزگێنی ڕۆژی سەربەستیت وەدەرخستووە. ئەتۆ فریشتەی ڕەحمەتی کە ئێمەت لە ژێر کەڵەکباری نەهاتی دیکتاتۆری‌دا نەجات دا. ئەتۆ ئەو ڕۆژەی کە لە پشت پەڵەهەورەکانی نەگبەتی و چارەڕەشی‌دا تیشکی سەربەخۆئی و ئازادیت هاویشتە وڵاتە توون و تاریکەکەی ئێمە ئەی یاخوا کوردستان هەتا گەڕانی گەردوون هەیە ئەتۆ هەر ئەستێرەی ڕۆژ و فریشتەی ڕەحمەت و ڕۆژی ڕوون بی. سەدەمین قەرنت هەووەڵین سەعات هەووەڵین سەعاتت هەزارەمین خێرو بەرەکەت بێ و هەتا ئەتبینم بە دڵێکی بەهێزەوە بڵێم بژی کورد و کوردستانی گەورە، بژی پێشەوای موعەزەم و خۆشەویستی کوردستان، بژین ئەو کەسانە کە لە ڕێی تەرەقی تۆدا هەوڵ و تەقەلا دەدەن.

کوردستان: ئەم ئاغایە چەند بەستە شیعری چاکی دەگەڵ ئەم نامە ناردبوو کە لە گۆواری کوردستان‌دا چاپ دەکرێن.

* کوردستان، بڵاوکەرەوەی بیری حزبی دیموکراتی کوردستان، ژمارە ٣٣، ٨ی ئاوریلی ١٩٤٦ (دوو شەممۆ، ١٩ی خاکەلێوەی ١٣٢٥ی هەتاوی).

## هەروەکوو دونیای ئەورۆ لە بیری دوێنێ پەیدا بووە، دونیای سبەینێش لە بیری ئەورۆ پەیدا دەبێ

میسری کۆن هەووەڵ کەسێك بوون کە شوێنی سادەی عەرزپێوان و ئەندازە (مەساحەت)گرتنی شتیان فێری یۆنانیان کرد و هەر ئەو موقەدیمە بوو نەخشەی هەندەسەی لێ کێشرا- زانایان تەدوینیان کرد بڵاو بووە. ڕۆمیەکان لە هەموو دەورووبەری بەحری ڕۆم)دا گەڕان و سیاحەتیان کرد و لە هەموو قوژبن و سووچێکدا فێڵی جۆراوجۆریان بۆ جووت و کێڵان و بە عەمەلهێنانی چوارپێ و حەیوانات و گژوگیای دییەوە تا عیلمێکی کە ئەورۆ جووتێری (کەشاوەرزی) پێ دەڵێن دۆزیانەوە و لە دونیادا دایر کرا. وە هەرچی کە ئەورۆ لە زەوی‌دا دەیبینی لە گەڕۆك، فڕۆك، تەلگراف، تەلەفوون، بێ‌سیم، دەستگای گیرەندە و بەرەندە، ڕادیۆ، بریسکە، تۆپ و تانگ هەتا دەگاتە بۆمی ئاتۆم کە ئاخەرین دەرهاتووی بیری بەشەرییەتە هەمووی گەرای بیری ئەو پیاوانەن کە دوێنێ کردوویانە و ئەورۆ پاکی هاتۆتە وجوودەوە و لە عەمەل دەهێندرێن.

وە ئەوانە کە ئێستا خاوەنی کارخانەجات و موهیمماتی هێزی موسەللەحن هیچیان دوو قەڕن (دووسەد ساڵ) لەمەپێش نە ئەو تەکمیلاتەیان بوو نە بیستبووشیان وەلێ بەهۆی بیر و هۆشێکی زیاد و هەوڵدان لە ڕێی عیلمی ژیان‌دا فکرکردنەوە بۆ گۆڕینی تەرزی ژیانی پێشوویان خۆلاسە بۆ داهێنانی دونیایێکی تازە گەیشتن بەم ڕۆژە و لە نەتیجەی بیر و زەحمەتی دوێنیان بوونە خاوەنی ئەم ڕۆژگارە خۆشەی ئێستا (ئەوە مەعلووم بووە کە دونیای خۆشی ئەورۆ لە ئەسەری بیری دوێنێ بۆ وان پەیدا بووە و بیری زەحمەتی دوێنێیە کە ئەورۆ ژیانیان خۆشە).

برایانی کورد: ناڵێم باب و باپیرانی ئێمە بۆ ڕۆژگاری خۆشی ئەورۆ، دوێنێ هیچ بیریان نەکردەوە و زەحمەتیان نەکێشاوە، بەڵکوو بەهۆی بەدبەختی و نەهاتی و چارەڕەشییەکی زۆر کە قەڕن لەگەڵ قەڕن دەورە لەگەڵ دەورە شان بەشانی وان گەڕاوە و تووشی ڕۆژگاریان هاتووە پێشگری مەرام و ئارەزوویان وەکوو مێژوو نیشان دەدا قەڕنێك نەبووە و نەڕۆییوە کە سەر و پەنجەی بە خوێنی هەزاران پیاوی کوردی شەلاڵ و سوور نەکردبێ.

ئەوە دیارە کە ئەوانیش بۆ لابردنی ئەو پێشگرانە و گەیشتن بە مەرام و مەنزووری ڕوونی هاوجنسەکانی خۆیان، خۆیان کوتاوە وە موەفەق نەبوون وەکوو ئەو میللەتانە بیرێکی ڕوون بۆ خۆشی ئەوڕۆی ئێمە بکەن و لەبەر ئەوە بووینە دواکەوتووترین میللەتی دونیا.

وە هەر نەتیجەی ئەو دواکەوتنەیە لە هەموو لایەکەوە (قصاص قبل الجنایة) تۆڵەی پێش گوناحمان لێ وەردەگرن. خۆلاسە هەر ئەو بێڕۆژییەیە لای هەر خاریجییێك گوتت کورد یەعنی مەوجوودێکی بێبیری، وەحشی، بێتەمەدون، بێبەهرە لە عیلم و مەعریفەت.

برایانی کورد: ئێستاش کە بیرمان بێ ڕۆژمان لێ درەنگ نەبووە وای لێ نەهاتووە باسێ لە کراسەوە بێنینەدەر. ئەوڕۆ هەموو میللەتی چکۆلەی دونیا بێ پێشگیری بەخوسووس نەتەوەی کورد بەهۆی مەسلەکی دێموکراتی و ئازادی حەقی ژیانیان هەیە و دەتوانن داوای حەقی فەوتاوی خۆیان بکەن و ئەوڕۆ هێزێك نیە کە بتوانێ ببێتە ڕێگری عەقیدەی پاك یا مەرامی خاوێن.

وە بە تۆزێك بزووتن دەتوانین بە چەند سالێکی کەم خۆمان لەژێر عەیبی بێبیری و هیچنەزانی بێنینەدەر. خەلکی دی زەحمەتیان کێشاوە و بە چەند سال شتێکیان لە نەبوونڕا دروست کردووە. مەسەلەن "پاپون" کە بەهۆی دیتنی قووەئی بوخار توانی نەخشەی کەشتییەکی بوخاری بکێشێ و بە هەزاران زەحمەت زەورەقێکی چکۆلەی بۆ نموونە دروست کرد. هەرچەند کە ئیستیفادە لەو زەورەقە نەکرا ئەمما ئەو بیرەی پاپون لە دونیادا یادداشت کرا و ما تا نۆبە گەیی بە "وات"، وات کە پیاوێکی زانا و تێگەییو بوو زانی پاپون بە سەهوو نەچووە کەوتە حەول و تەقەلا بۆ تەواوکردنی مەنزووری پاپون تا کەشتی بوخاری دروست کرد. وا بووە بیری پیاوێکیان لە موددەی سەد سالدا نەتیجەی لێ وەرگیراوە و تەواو کراوە. ئەمما کاری بۆ ئێمە ئاسانە و دەتوانین دەرهاتووەکانی زەحمەتی سەد سالەی وان لە فاسیلەی چەند سالدا فێر بین و بەهۆی ((بیری ئەوڕۆ)) لە ((دونیای خۆشی سبەینێ)) بەهرە وەرگرین. لەسەر هەموو لاوی کوردی لازمە دە غایەتی هەوڵ و تەقەلادا زەحمەت بکێشن و لە فرسەتی ئەوڕۆ قازانج وەدەست خەن بێپشوودان و ماندووبوون بۆ نەتیجەی ڕوونی سبەینێ ((کە هەر ئەوڕۆکەیە)) خۆ ماندوو کەن.

* کوردستان، بڵاوکەرەوەی بیری حزبی دیموکراتی کوردستان، ژمارە ٣٤، ١٠ی ئاوریلی ١٩٤٦ (چوار شەممۆ، ٢١ی خاکەلیوەی ١٣٢٥ی هەتاوی).

# من و گوڵە سوێسنێك

گزینگی خۆر لە داوێنی دڕاوی    شەڕق، دایدا لە بەینی هەور و ساوی
پڕی دەشت جیوەڕێژی دەس هەوا بوو    لە دانەی شەونم و قەترەی شەواوی
دمی هەر گوڵ بە خەندە ئاڵ‌وواڵ بوو    لە ڕووی بولبول کە لێی هاتبوە سڵاوی
هەڵاڵە و لالە و شللێر و شەستپەڕ    گوڵی سوور و وەنەوشەی سەر نواوی
تەشەربیزی هەزار "شیرین"ی ئەرمەن    گوڵی بەیبوون بە چاڕۆکەی دڕاوی
قورینگ و پۆڕ و دوڕنای نێو شەتاوان    کەو و قاز و گەڵی کۆتر و مراوی
هەزار عەیبی لە تاجی گوڵ وەدەرنا    جوڕەپۆپن بە تیلاکی کڵاوی
لە بازاڕی چەمەن کڕیاری گوڵ بووم    بەبێ مایە کوتم چۆن بچمە ناوی
وەکوو "مەجنوون" کەنارم گرت و ڕۆییم    لەگەڵ غەمخۆرەکەم: "قەلبی غەماوی"
لە دەم بەردێکی دیتم تاقە سوێسنێك    کە ڕووی سوور کردبوو، فرمێسکی چاوی
کوتم ئەێ تاقە گوڵ فەسڵی بەیانە    گەشەت بۆچی لە دەس داوە، ژە کاوی؟
گوڵ و گوڵزار هەموو سەرمەست و شەیدان    پەژارەی چی لە سەرتا، وا چەماوی؟
بە سۆزە پێی کوتم: بۆ بەختی سەختم    بۆ هاوێر و ڕەفیق و پەڕبڵاوی
بەهاری جوانی بۆ من زەوقی چی بوو؟    بە غەیری دوور لە گەل ڕۆڵەی بڕاوی
گوڵ و بولبول بەوێستا پاکی جەمعن    لە تەختە چیمەن و دەوری شەتاوی
نە دیتم عیشقی بولبول لەم چیایە    نە بیستم سۆزی مەعشووق بێ لە تاوی
نە هەستی باغەوانم دێ لە بن گوێ    نە بووم بۆ زولف و ڕوویەك شەو گوڵاوی
نە نازدارێکی مەحبووب بۆنی کردم    نە کۆمەڵ بووم لەسەر سینگی بڵاوی
نە سروێك سێبەری هاویشتە سەر من    نە چاوێك ئاوی خستمە نێو هەناوی
بە بای پشکووتم و دیسان دەبم سیس    نە "مەجنوون"م نە "لەیل"ی دڵسووتاوی
گەشەی چیم بێ عەزیزم لەم کەنارە    دەبێ هەر خوێنی دڵ بڕژێنمە چاوی
کوتم ئەی گوڵ بڕۆ شوکری خوا کە    بەجێماوی لە گەل، لێی هەڵبڕاوی
قسەی "مێهر" و "وەفا" لابە لە نێوا    وەفا خۆی مردووە، هەر ماوە ناوی
نە گوڵ بۆ بولبولە ڕازی دەروونی    نە بولبول بۆ گوڵە هیچ بەند و باوی
شەرم لابە عەزیزم، سەر هەڵێنە    گوڵی بێ‌خار لە نێوا، هەر تۆ ماوی
ئەگەر کۆکات دەوێ، جەمعی کەنار بە    لە گۆشان کۆوەکە، بیری بڵاوی

لــه پاڵــەی بێکەســی غــەمگین مەبــە هــیچ     لــە ڕاوگــەی کۆنــە، ڕاوکــەر خۆشــە ڕاوی
لـــە نێـــو جـــەمعی گـــوڵان و بولبـــولان‌دا     بەڕاســتی هــەر ئــەتۆی لــەم گۆشــە مــاوی
دەڵێن "عەتری"ش وەکوو تۆ ماتە ئێستـــا     لــە گۆشێك کــەوتــووە تــەبعی شــکــاوی

* کوردستان، بڵاوکەرەوەی بیری حزبی دیموکراتی کوردستان، ژمارە ٧٤، ٦ی ئووتی ١٩٤٦ (سێشەممۆ، ١٥ی گەلاوێژی ١٣٢٥ی هەتاوی).

# پێزانین

سپاس بۆ ئەم شاعیر و نووسەر و ئەدیب و دۆستە خۆشەویستانەی کە هەر کام بە جۆرێک یارمەتییان داوم و ڕێیان بۆ خۆش کردووم کە ئەو برە بەرهەمەی ژیانم ڕێکوپێک بکرێ و چۆن باشە ئاوا بخرێتە بەر چاوان:

١ـ کاک ئەحمەدی مەولانی.

٢ـ کاک سەعید نەججاڕی (ئاسۆ).

٣ـ کاک خالید عەسکەری.

٤ـ کاک حوسێن موهتەدی.

٥ـ کاک تاهیر کەریمی (شیوەن).

٦ـ کاک سەلاحەددین ئاشتی.

١. محەممەدی نووری ٢. هێدی

## محەممەدی نووری

## لە چەند تافێکی تەمەنیدا

( لەڕاستەوە: ١. حەسەن قازی ٢. حاجی سەید عومەر هاشمی ٣. حاجی سەید ئەنوەر هاشمی ٤.
مەنسوور هاشمی ٥. قاسم ئاغا موهتەدی ٦. سەید کامیل ئیمام زەنبیلی "ئاوات" ٧. محەممەدی نووری
٨. مەلا سەید ئەحمەد شەمسی ٩. حامید ئیمام زەنبیلی )

١. محەممەدی نووری ٢. سەیدە سەدر حوسەینی (هاوسەری نووری)